ناوی کتێب: ناسۆرییەکانم لە زیندانی خەلان

نوسینی جەمیل مەحۆ

وەرگێرانی : ڕێناس شاپور

تیراژ: ٥٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

نرخ (٥) یۆرۆ

بڵاوکراوەکانی ناوەندی زەردەشت عوسمان

بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ئەکادیمی

هۆڵەندا – ئارنهێم

## پێشەکی وەرگێڕی کوردی:

"لە کاتژمێر دەو چارەک فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی بەیروتی نێودەوڵەتی نیشتەوە، کاتێک لە پلیکانەی فڕۆکەکە هاتمە خوارێ دنیا لە چاوەکانمدا زۆر مەزن و گەورە دیاربوو. تێر بۆنی لوبنانم هەڵمژی، یەکەم شت کە بێ ئاگا کردم ئەوە بوو کەوتمە سەر ئەرزو و خاکی نیشتمانی خۆم؛ لوبنانم ماچ کرد".

ئەمە دووا دێڕەکانی ئەم کتێبەیە مرۆڤێک نوسیویەتی کە بە دڵ و بە گیان عەشقی کورد و کوردستان بوو، خەونی بە ئازادی و سەربەخۆیی وڵاتەکەی خۆیەوە دەبینی، بەڵام بۆ دوواجار کەوتە ناو زیندانی چەتەکانی مەلا مستەفا و چوار ساڵی رەبەق ئەوەی نەکرابوو بەویانکرد. چیرۆکی ئەم کتێبە بۆ خوێنەری هۆشیار کۆدی زۆر لەو پرسیارانە دەکاتەوە کە هێشتا وەڵامەکانی بە روونی نازانێت. ئەم کتێبە بکە بە چیرۆکی هەموو کوردێکی بەشەرەف لەم کوردستانەدا لە هەر چوار پارچەی خاکەکەیدا بۆت ئاشکرا دەبێت کە لەڕاستیدا بنەماڵەی بارزانی خەریکی چین و کار بۆ چی دەکەن و بۆچی ئەوە دەکەن.

تەماشـا کەن مرۆڤێکـی کـورد، بنەمـاڵەکەی لە خـاک و زێدی خۆیـان لەسـەر کـورد بـوون لە بـاکوری کوردسـتان بـاوکی دەکوژرێت و بە هەتیوی ئاوارە دەبنە رۆژئاوای کوردستان، ئینجا دەچـنە لوبنـان، لەوێـش دڵیـان بـۆ کوردسـتانی خۆیـان لێـدەداو بەردەوام دەبن لە وڵات پارێزی. پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان دروست دەکات و خەونێکی ئەرخەوانی بە کوردستانێکی ئـازاد و سەربەخۆوە دەبینێت و کار بۆ ئەو خەونەی خۆی دەکات.

ئەو کەسـەش خوالێخـۆش بـوو جەمیـل مەحـۆیە، خەونەکەشـی خەونی هەموو کوردێکی بەشـەرەف ومەردی ئەم وڵاتەیە. ئەو کە دێـتە کوردسـتان و دڵـی بە شـۆڕش و سـەرکردەکانی خۆشـە و دەیەوێت بە دڵ و بەگیـان وەکو مـۆم خۆی بـۆ ئـازادی ئەو وڵاتە بسـوتێنێت، چەتەکـانی بـارزانی هێنـدە سـوکایەتی و ئەشـکەنجەی دەکەن وایلێـدەکەن ئیتـر قێـز لە کوردبـوونی خۆشـی بکـاتەوە، لە کوردستانەکەی خۆیدا هێندە تـاڵاوی دەرخـوارد دەدەن، لەمـرۆڤ بوونی دەخەن، وایلێدەکەن بێز لە خاکی وڵاتەکەی خـۆی بکـاتەوە، تا سـەرەنجام بەهـۆی ئاشبەتاڵەکەوە لە مـردن رزگـاری دەبێت و پشـت دەکـاتە کوردسـتان و کڕنـوش بـۆ خـاکی لوبنـان دەبـات و خۆڵەکەی ماچ دەکات.

ئەم کتێـبە دوو پێشـەکی لەسـەرە، ئەوەی لەو دوو پێشـەکیەدا باسی کراوە من ناچمەوە سەریان، بەڵکو مـن لێرەدا تەنها ئامـاژە بـۆ ئەو شـتانە دەکەم کە باسـیان نەکـراوە بـۆ ئەوەی یـارمەتی

خوێنەری ئەم کتێبە بدەم زۆر بە جوانی کۆد و نهێنی ئەو کارە قێزەونانەی بنەماڵەی بارزانی بکاتەوە کە نزیکەی ٧٠ ساڵە لە دژی گەلی کوردمان لە هەر چوارپارچەی کوردستان پەیڕەوی دەکەن، لێرەدا من بە پێویستی دەزانم هەندێ خاڵی گرنگ بوروژێنم:

**یەکەم- جەمیل مەحۆ لە لوبنان حزبێکی دروست کردەوە بە ناوی پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان،** بۆچی بنەماڵەی بارزانی سوار سەری دەبن و ئاوا رسوای دەکەن تا بتوانن ئەو حزبە لە ژێر دەستیدا دەربێنن و خۆیان بەڕێوەی بەرن؟ هەڵبەتە هەر لەم کتێبەدا دەبینین بەرامبەر بە پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا هەمان کار دەکەن و ئەو پارتە دەکەن بەسێ چوار کەرتەوە. دیسانەوە هەر لەم کتێبەدا کەمێک ئاماژە بەهەمان کاریش کراوە بەرامبەر بە کوردەکانی تورکیا و پارتی دیموکراتی کورد لە تورکیا و هەردوو سەرکردەی ئەو پارتە سەعید قرمزی تۆپراغ و سەعید ئاڵچی بە دەستی یەکتر لەناو دەبەن.

لە میانەی ئەم کتێبەو زۆربەی کتێبە مێژووییەکانی دیکەدا کە تیشک دەخاتە سەر رەفتارو کردەوەکانی بنەماڵەی بارزانی، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە راستیدا پرۆژەیەکی ئیستخباراتیی نێودەوڵەتییە و بنەرەتی دروست بوونیشی بنەڕەتێکی ئەمنی – ئیستخباراتییە کە هەرسێ دەزگای (ساواک – مۆساد- میت) بەڕێوەیان بردووە. هەموو

کارەکانی ئەم پارتە کە دواتر و لە سەردەمی قیادە مۆقەتەدا دەبێتە مورتەزەقەیەکی نێو دەوڵەتی لە چوارچێوەی بەرنامەی ئەو دەزگایانەدا بووە و بە سەرپەرشتی خودی ئەو دەزگایانە ئەنجام دراون.

**دووەم: سوریا و لوبنان بۆ؟**

لە ستراتیژی نەتەوەیی دەوڵەتی ئیسرائیلدا سوریا و لوبنان پێگەیەکی زۆر ستراتیژی و گرنگیان هەبووە بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیل، بۆیە ئیسرائیل تەواوی تواناکانی خۆی بەکارهێناوە بۆ لاوازکردن و کنەکردن لەناو ئەو دوو دەوڵەتەدا. ئامانجی دەستەمۆکردن و کۆنترۆڵ کردنی ئەو دوو پارتی دیموکراتەی لوبنان و سوریا ئەوە بووە کە لەرێگای دەزگای بەد ناوی پاراستنەوە (واتە ناپاستەوخۆ لە لایەن مۆسادەوە) بکرێنە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ کاری هەواڵگری و بخرێنە خزمەت دەوڵەتی ئیسرائیلەوەو لە بەرامبەریشدا بنەماڵەی بارزانی ملیۆنەها دۆلار بۆ خۆیان وەربگرن.

ئەگەر بەوردی بیرەوەرییەکانی جەمیل مەحۆ لەدووتوێی ئەم کتێبەدا تەماشا بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە خودی جەمیل مەحۆ نەیتوانیوە بزانێت بۆچی بنەماڵەی بارزانی هێندە لەو تورەن و بۆچی ئەوەندە بە جدی هەوڵ دەدەن ئەو حزبەی لەژێر دەستدا دەربێنن. مەحۆ کەوتۆتە نێو داوی کوردایەتییەکەی

بنەماڵەی بارزانی و بە ئەفیونی ئەو کوردایەتییە بە جۆرێک سەرمەستیان کردووە و سەریان لێتێکداوە هەتا دووا ساتەکانی ئازاد بوونیشی لەو باوەڕەدا بووە کە بارزانی بەهەڵەدا براوەو ئاگای لەو کارانە نییە، بەڵکو ئەوە مەکتەبی سیاسی پارتییە کە دژایەتی ئەو دەکەن و دەیانەوێت دڵسۆزانی بارزانی کەنارگیر بکەن، بۆیە کاتێک بارزانی داوای لێدەکات عوبێدوڵای کوڕی بۆ بکوژێت، ئەم هەر تێناگات و توشی حەپەسان دەبێت. جەمیل مەحۆ تێناگات باشە ئەگەر ئەم خیانەتی لە بنەماڵەی بارزانی کردووە، ئەی ئەو هەموو کوردەی ئێران بۆ تەسلیم بە ساواک کرانەوە یان لەناو شارەکانی کوردستان تیرۆرکران؟ لە خۆی ناپرسێت ئەی بۆچی ئەو هەموو کوردە تێکۆشەرەی تورکیا بەناوی میوانداری و گفتوگۆوە بانگ دەکران و دەستەجەمعی تیرۆر دەکران؟ لە کاتێدا جەمیل مەحۆ خۆی ئاماژە بەو کارانە دەکات و سەعید قرمزی تۆپراغ (د. شڤان) هەر لە ژوورەکەی خۆیدا زیندانی بووە بەر لەوەی بیکوژن.

## سێیەم: دژایەتی چەپ و شوێعی و کوردەکانی تورکیا وئێران و سوریا و لوبنان بۆ؟

راستە بنەماڵەی بارزانی دژی هەموو حزبەکانی ئەو پارچانەی کوردستان بە نەخشەی وردی میت و مۆساد و ساواک کاری دەکرد و سەرکردەی هەموو ئەو حزبانەی لەناو بردن یاخود لە

زیندانەکانـدا سـوک و سـەفیلی دەکـردن، بەڵام ئەوەی جـێگەی بـایەخە لەم کتێبەدا کە جەمیل مەحۆ وەکو راستی ئاماژەی بـۆ دەکات و ناتوانێت شرۆڤەیەکی سیاسی و فکری بۆ بکات، ئەوەیە کە بۆچی هەتا ئاستی رەگەز پەرستی؛ پارتی و بنەماڵەی بـارزانی رقیـان لە تێکۆشـەران و هاوڵاتیـانی کـوردی هەمـوو پارچەکـانی کوردستان بووە؟ بۆچی هێندە رقیان لە شوێعیەکانی کوردستان بووە و بە کۆمەڵ دەیانکوشتن؟

چـوارەم: لە کاتێکـدا پـارتی و سـەرانی بنەمـاڵەی بـارزانی ئاشـبەتاڵیان دەکـرد و رایانـدەکرد بـۆ ئێـران بـۆچی هەمـوو بەنـدکراوەکانی زینـدانی رایـات کـۆمەڵ کـوژ دەکەن؟ ئەمە رێـک دەرخەری سـایکۆلۆژیای بنەمـاڵەی بـارزانییە و ئەو راسـتییە دەردەخـات کە ئەوان لە هەمـوو بارودۆخێکـدا خەمـی یەکەمیـان ئەوەیە نەهـێڵن هـیچ کەس لە کوردسـتاندا بمێنێـتەوە ئەگەر لە ئێسـتاو داهـاتوودا هەڕەشـەبێت بـۆ سەربنەماڵەی بـارزانی. بـۆیە دەبینین بارزانی لە شاری نەغەدە لە کاتێکدا ئاشبەتاڵی کردووە و چارەنوسـی میللەتـی کـوردی خسـتۆتە بەردەم رەشـترین رۆژگارەکانی خۆی، داوا لە جەمیل مەحۆ دەکات عوبێدوڵای بـۆ بکوژێت، لەهەمـان ماوەدا و لە سـاڵی ١٩٧٦ مەسـعود بـارزانی لە نەمسا هەوڵی کوشتنی عەبدول مسەوەری ئامۆزای دەدات.

لە میـانەی خوێنـدنەوەی رووداوەکـانی ئەم کتێبەدا، وێنەیەکـی تەواوی پارتی دیموکراتی کوردستان و بنەماڵەی بـارزانی ئاشـکرا

دەبێت و خوێنەر زۆر بە روون و ئاشکرایی هەست بەوە دەکات کە ئەم پارتە تەنها بەیەک میکانیزمی ستراتیژی کاری کردووە، ئەویش میکانیزمە جاسوسی و هەواڵگرییەکانە. لە کاتێدا ئەم حزبە شەڕێکی سەختی لە گەڵ حکومەتی عێراقدا هەبوو، دەبوایە هەموو تواناکانی خۆی لە بەرەکانی شەڕ و تۆکمەکردنی هێزی پێشمەرگەو رێکخستنی جەماوەردا بخستایەتە گەڕ، دەبوایە خەمی هەرە سەرەکی ئەم پارتە پتەو کردنی پایە سیاسی و فکری و مەعریفییەکانی کۆمەڵگای کوردستان بوایە، تا بتوانێت لەبەرامبەر ئەو دوژمنە بەهێزەدا خۆی رابگرێت و مافەکانی گەلی کوردی لە بەیاننامەی ١١ی ئازاردا بەسەردا بسەپێنێت، کەچی دەبینین لە جیاتی هەموو ئەمانە بە پێچەوانە تەنها کاری ئەو پارت و بنەماڵەیە کۆکردنەوەی زانیاریی هەواڵگری بووە بۆ دەزگا جاسوسییە نێودەوڵەتییەکان و راپۆرت نوسین بووە لەم و لەو، هەر بە گوێرەی ئەو راپۆرتانەش ریزکانی ئەو پارتەیان لە هەموو خەڵکانی دڵسۆز و خەمخۆر و شارەزا پاککردۆتەوەو لە شوێنی ئەوان تەنها بایەخ بە سەرۆک جاش و بەکرێگیراوەکانی بێگانە دراوە. سەرەنجام ئەم پارتە پرسی کوردی بە ئانقەست کردۆتە کارتێکی سیاسی هەرزان بەدەست بێگانە و لە بەرامبەریشدا خەمی یەکەم و گرنگی سەرانی ئەم بنەماڵەیە تەنها کۆکردنەوەی ملیۆنەها دۆلار و داواکردنی پارە بووە بەرامبەر بە هەر جوڵەیەک کە لە خزمەت دەزگا هەواڵگرییەکانی (ساواک و میت و

مۆساد)، ئەنجامی داون. سەرەنجام حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانـی تەفروتونـا کـرد بـۆ سـاواک، سـەرکردە تێکۆشـەرەکانی کوردستانی تورکیا قەتڵ و عـام کرد بۆ میتـی تـورکی، عێراقـی سەرقاڵ و لاواز کرد بۆ ئەوەی سەری نەپەرژێتە سەر ئیسرائیل، هەوڵـی دەدا حـزبە کوردییەکـانی سـوریا و لوبنـانیش دەسـتەمۆ بکـات و ئەوانـیش لەخـزمەت مۆسـاد بخـاتە نێـو مەنـزومە ئیستخباراتییەکەی خۆی...

هەندێک لە ڕووداوەکانی ئەو ماوەیە لەناو ئەم کتێبەدا، بە هەر هۆکارێک بووە ئامـاژەی بۆ نەکراوە. لە هەر جێگایەکدا هەستم بەوە کردبێـت هـاتووم پەراوێـزی خـۆم بـۆ دانـاوە. لە ڕێگـای پەراوێزەکانەوە هەوڵمداوە لە لایەک کتێبەکە دەوڵەمەندتر بکەم و لە لایەکـی تـریش هەنـدێ زانیـاری و ڕووداو گرێبـدەمەوە بەیەکەوەو خوێنەر زیاتر بە ڕووداوەکان ئاشنا بکەم..

هیـوادارم بەم وەرگێـڕانە تـوانیبێتم خـوێنەری کـورد بەو ڕووداوانە ئاشنا بکەم، وەک وەفایەکیش بۆ پاکی و دڵسۆزی ئەو جەنگاوەرە خێر لەخۆ نەدیوەی کورد، ئەم وەرگێڕانە وەک چەپکە گوڵێک بخەمە سـەر گـۆڕی سـەربازی ونـی ڕێگـای تێکۆشـان و خەباتی گەلی کورد: جەمیل مەحۆ.

ڕێناس شاپور

## پێشەکی چاپی دووەم

ناونیشانی راستەقینەی ئەم کتێبە جیاوازە لەو ناونیشانەی کە لەم چاپەدا بۆی دانراوە. رەوانشـاد جەمیل مەحۆ، ناونیشـانێکی شۆکئامێزی بۆ داناوە بەنـاوی (بیرەوەریەکـانم لەنـاو زینـدانەکانی شۆڕشی کوردا)، لە کاتێکدا ناونیشـانی دووەم ئەوەیە کە من بۆم دیـاری کـردووە لەم چـاپی دووەمەدا بەنـاوی (ناسـۆرییەکانم لە زینـدانی خەلان). ئەم بـابەتەش هەنـدێ روونکـردنەوە دەخوازێت. ناونیشـانە کـۆنەکە لە ناواخنیـدا، سـەرکۆنەی شۆڕشـی کـورد دەکات، کە ئەمەش بۆمن مایەی پەسەند کردن نەبوو، بۆیە دەبوو خۆم ئەم کێماسییە پڕکەمەوە، بیربکەمەوەو بەشوێن ناونیشـانێکدا بگەڕێم کە زیاتر بابەتیانە و نزیکتر بێت لە راستییەوە.

بۆچـوونی خـودی خـۆم ئەوەیە کە ئەو ناونیشـانەی رەوانشـاد هەڵبیـژاردووە، هەنـدێ تۆمەتبـارکردنی تێـدایە و دەمەوێـت بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ بکەم. رەوانشاد سالانێکی پڕ چەرمەسـەری لە زینـدانێکی دوورە دەستی لە کوردستانی عێراق بەسـەر بـردووە. بەبـێ ئەوەی هـیچ گوناهێکی کردبێـت، تـوڕدرایە نێـو زینـدانێکی ترسـناک و بەخراپتـرین شـێوە مـامەڵەی لەگەڵـدا کـرا، ئەم ناسۆریانەی ژیـانی چوارسـاڵی رەبەق دەخایەنێت وەک ئەوەی لە ناو دۆزەخدا بووبێت. لەهەموو شتێک زیاتر بۆ ئەو مایەی ناکامی بـوو ئەوە بـوو کە ئەو کەسـەی فەرمـانی دەسـتگیرکردنی ئەوی

دابوو، کەسێک بوو لەلای ئەم زۆر رێزداربوو، بەتەواوی هۆگری بوو، لە ناخی خۆیدا ستایشێکی زۆری بۆی هەبوو. ئەو کەسەش مەلا مستەفای بارزانی، سەرۆکی کوردەکانی عێراق بوو؛ هەر لە ١٩٥٨ تا ساڵی ١٩٧٥. مەلا وەک ئەوەی زانراوە تەنها سەرکردەی حزبێک نەبوو، بەڵکو سەرۆکی شۆڕشی کورد بوو. شۆڕشی کورد بێ بەری بوو لە زیندانکردن و دەستبەسەرکردن و دابڕینی لە دنیای دەرەوە. ئەوەی ئەو کارەی کرد بارزانی بوو نەک شۆڕشی کورد. ئەم بۆچوونە کە نامەوێت وەک پاساوێک تەماشا بکرێت، کۆڵەکەی سەرەکی بۆچوونەکەی منە بۆ دەستنیشانکردنی تۆمەتبار. تۆمەتبار ناکرێت شۆڕشی کورد بێت، بەڵکو سەرۆکەکەی بووە لەو ماوەیەدا، کە مەبەستیش لەمە بەبێ دوودڵی بارزانییە. خەلان گوندێکی چەپەکی ناوچەی حاجی ئۆمەرانە، نزیکی سنوری ئێرانە و سەر بە شاری هەولێرە. لە نزیک ئەو گوندەوە گرتووخانەکە دروستکراوەو ناوەکەشی هەر لە ناوی گوندەکەوە وەرگرتووە. ئەوەی کە من کردم تەنها هێندە بوو ناوی زیندانەکەم خستە شوێن شۆڕشی کورد، بەوەش دۆخەکەم راست کردەوە.

رەوانشاد خۆشەویستییەکی یەکجار زۆری بۆ بارزانی هەبوو. خوێنەر لە میانەی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا بۆی ئاشکرا دەبێت کە رەوانشاد بەدڵێکی پڕ لە ناسۆرەوە دەڵێت: (حەزم کرد ئەو ناونیشانە ، ناونیشانی ئەم کتێبەم بێت کە بڵاوی دەکەمەوە و بە

دووررودرێژی بیرەوەرییەکانی خۆمی تێدا دەنووسمەوە. چەند جارێک نوسینم لەسەر ئەو هەموو پیلان و نەخشەو کردەوە نامرۆڤانانەم نووسیوە کە دووچارم هاتوون، ئەویش لە لایەن کەسێکەوە کە من خۆم بە پیرۆزترین کەسم دانابوو، چونکە بەڕادەیەک خۆشم دەویست کە لەسەروو خۆشەویستیی خۆشمەوە بوو، بەتایبەت کە رۆژگارێک من نوێنەری ئەو بووم لە لوبنان لە کاتی بەرپابوونی شۆڕشی کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٦١، ئەو کەسەش مەلا مستەفا بارزانی بوو)، هەروەها بەردەوام دەبێت و دەڵێت: (پەیوەندیم لەگەڵ بارزانی و سەرکردە کوردەکان و دڵسۆزی و راستگوییم بۆیان یەکێک لەو هۆکارانەبوو کە پاڵی بەبارزانییەوە نا لە پشتەوە خەنجەرم لێبدات، ئەویش بە هاندان و دنەدانی لە لایەن سەرکردە گەندەڵ و لەرزۆکەکانی .... لەم بارەوە بە بارزانیم دەگوت ئەوانە تاقمێک خیانەتکارو بەکرێگیراون).

لەگەڵ رەوانشاد پەیوەندییەکی خزمایەتیم هەیە، هەمیشە بە مامە بانگم دەکرد. هەرکاتێک باسی بەسەرهاتەکانی خۆی بۆ دەکردم لە زیندان دڵی ژانی دەکرد و خەفەت دایدەگرت، وەک ئەوەی هێشتا خوێن لە برینی بچۆڕێت، لەسەرخۆ و بەردەوام و بە یادوەرێکی وردەوە دەستی بە گێڕانەوە دەکرد.

لێرەدا پێمخۆشە خوێنەر بە نوسەری ئەم بیرەوەریانە ئاشنا بکەم، کە بە سەلیقەو بەهرەی خۆی رازاندویەتییەوە، بۆ ئەوەی

زیـاتر بەرچـاوی خـوێنەر روون بێـتەوە، بەر لەوەی دەسـت بە خوێندنەوەی ئەم بیرەوەریانە بکات.

جەمیـل عەلـی دەروێـش مەحـۆ بەرەچەڵەک دەگەڕێـتەوە بـۆ تورکیـا، ئەو کـوردی باشـوری رۆژهەلاتـی ئەو ولاتەیە. سـاڵی ١٩٣٠ لە گوندێکی چەپەک لەدایک بـووە، رەنگە ئێستا ئەو گونـدە هەر نەمابێت. لەکۆڕوکۆبوونەوەکـانی خۆیـدا ئامـاژەی بـۆ ئەوە دەکرد کە خێزانەکەیـان کۆچیـان کـردووە بـۆ سـوریا دوای ئەوەی بـاوکی بەدەسـتی سـەربازانی تـورک دەکوژرێت، چەنـد کەسـێکی بنەماڵەکەی لە لوبنـان دەگیرسـێنەوە. لەتـافی نەوجەوانیـدا چەندین پیشـەو کـاری کـردووە بـۆ ئەوەی نـانی رۆژانەی پەیـدابکات و خێزانەکەی بەخێو بکات. بەخت یاری ئەبێت کاتێک هەلێکی کـاری لە ولاتی کوێت بـۆ دەڕەخسێت. لە بەهـاری تەمەنـی لاویدا تێکەڵ بە سیاسـەت دەبێـت. هەر بە تەجـروبەی ژیـانی خـۆی بیـرو بۆچوون و دیدگای بەنرخی لادروست دەبێت. لەسەرەتای تەمەنی لاویدا هەست بەو زوڵمە دەکات کە لە نەتەوەکەی دەکرێت، بۆیە دەست بەکاردەبێت لە پێناو دابینکردنی ژیانێکی شـەرەفمەندانە بـۆ کورد.

سـاڵی ١٩٦٠ لە لوبنـان، پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان پێکـدەهێنێت، هەوڵ دەدا مـافە مەدەنیەکـان بـۆ کـوردی لوبنـان دەستەبەر بکات و بانگەوازی بۆ یەکسـانی دەکرد. مەلا مستەفای بـارزانی لە سـەرەتای شەسـتەکاندا ئەوی وەک نوێنەری خـۆی لە

لوبنان دەستنیشان کرد. ساڵی ١٩٧٠ بانگهێشتنامەیەکی پێدەگات بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی هەشتەمی پارتی دیموکراتی کوردستان لە عێراق، بۆیە بەرەو ئەوێ دەڕواتن. لە بارودۆخێکی ناڕۆشندا، میوانە دڵخوازەکەی بارزانی دەکرێتە دوژمنێکی سەرسەخت و لە ئاکامدا دەستبەسەردەکرێت و هەتا دوو ساڵ بێسەروشوێن دەبێت، دواتر رەوانەی زیندانی خەلان دەکرێت و دووساڵی تریش لەوێ بەسەر دەبات. دوای ئاشبەتاڵی شۆڕشی کورد لە پاش رێکەوتنی نێوان عێراق و ئێران بەگوێرەی ئەو رێکەوتنەی هەردوو وڵات لە جەزائیر مۆریانکرد، لە زیندان ئازاد دەکرێت و لەگەڵ هەزارەها کۆچبەری دیکەدا رووله ئێران دەکات. هیچ کەس چاوی نەخستە سەری و دەسەڵاتدارانی ئێرانیش ئەویان نەدەناسی، بۆیە وەک هەموو کۆچبەرەکانی تر مامەڵەی لەگەڵدا کرا. لەوێ تەنها ئامانجی ئەوە بوو خۆی بگەیەنێتە تاران و پەیوەندی بە باڵیۆزخانەی لوبنانەوە بکات. سەرەنجام باڵیۆزخانەی لوبنان هەموو کارێکی پێویستی بۆ دەکات بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی.

لێرەدا گرنگترین پرسیار دێتە گۆڕێ، ئەویش ئەوەیە بارزانی بۆچی جەمیل مەحۆی دەستگیر کرد؟ لە راستیدا خوێنەر لە میانەی خوێندنەوەی ئەم بیرەوەریانەدا وەڵامێکی تەواوی دەست دەکەوێت و بۆی دەردەکەوێت کە مەحۆ لە هەندێ ململانێی ناو سەرکردایەتی حزبەکەوە تێوەگلاوە، کە نەدەبوو وابێت، وێڕای

هەندێ ململانێی لاوەکی نێو بنەماڵەی بارزانی و خودی کوڕەکانی مەلا مستەفا کە پێکەوە ناکۆک و ناتەبا بوون و لە ململانێی توندا بوون کە بەهۆیەوە لەناو پارتەکەدا پاشاگەردانییەکی توندی لێکەوتبوەوە. هەموو ئەم شتانە روویاندا بەبێ ئەوەی ئەم داماوە هیچ رۆڵێکی لەوەدا هەبووبێت. لەدوای هەندێ سەردان بۆ بارەگای بارزانی، مەحمۆ زیاتر لە ململانێکانەوە تێوەگلا، هەوڵیشیدا بەر لەوەی کار لە کار بترازێت هەڵوێستی خۆی راست بکاتەوە، بەڵام تازە دۆخەکە لەوە ئاڵۆزتربوو کە بتوانێت وا بە ئاسانی خۆی دەربازکات.

ئەو لەگەڵ زۆربەی کوڕەکانی مەلامستەفا هاوڕێیەتی دروست کردبوو، ئەوانە هەر هەمووشیان لە نێوان خۆیاندا ناکۆک بوون و دژ بەیەک بوون، ئەمیش ئەو شتانەی نەدەزانی، هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیش هەوڵیان دەدا لە دژی یەکتر ئەو بەکار بێنن، هەندێکی تریشیان کردبوویانە دەمڕاستی خۆیان بۆ ئەوەی شەڕی نەیارەکانی خۆیانی پێبکەن لە ناو سەرکردایەتی. ئەویش بێئاگابوو لە هەموو ئەم شتانە، تا لە کۆتاییدا راستییەکەیان دابە نێو چاویداو پێیانگوت کە گومانیان لە دڵسۆزی ئەو هەیە بۆ بارزانی، بەڵگەشیان ئەوە بوو کە عوبێدوڵای کوڕە گەورەی بارزانی نامەی بۆ ناردووە بۆ بەیروت.

مەحۆ واتای ئەو تۆمەتەی نەدەزانی، لە چاوپێکەوتنیدا لەگەڵ هەردوو کوڕی بارزانی ئیدریس و مەسعود راشکاوانە پێیان

گوتبوو" هاوکاری تۆ بۆ عوبێدوڵا خیانەتێکی هێندە گەورەیە لە شۆڕش لێخۆش بوونی نییە". دوای ئەم چاوپێکەوتنە نەهامەتیەکانی ئەو دەستپێدەکات، نەیدەتوانی ئەو کەرە چۆن لەو قوڕاوەی دەربێنێت!، درەنگانێک پێی زانی کە بارزانی باوک و هەردوو کوڕەکەی مەسعود و ئیدریس ناکۆکی زۆریان لەگەڵ عوبێدوڵا هەیە و ئەو خێزانە لە نێو ئاژاوەیەکی گەورەدا دەژین، لە ژینگەیەکی پڕ لە پیلانگێڕی و چاڵ هەڵکەندن بۆ یەکتری. ئەوەی کە ئەو چەند وەختە بە مەشخەڵێکی ڕێگەی خۆی و سەرکردەی گەلی دەزانی جگە لە کەسێکی گومانـاوی و جنێوفرۆش کە حەزی بە پیلانگێڕان دەکرد لە دژی ئەوانی تر و هەموو کەسیشی بە پیلانگێڕ دەبینی، هیچی تر نەبوو.

بارزانی تەواو بڕوای بەوە کردبوو کە عوبێدوڵای کوڕی پیلان لەدژی ئەو ساز دەکات و بە نیازی ئەوەیە لە کاری بخات، پێویستیش بەوە نیە کەسێکی زۆر زرنگ بێت و لەم رازە تێبگات، چونکە ئیدریس و مەسعود وەهمێکی لەو جۆرەیان خستبووە سەریەوە و بڕوایان پێهێنابوو کە جگە لەخۆیان کە دڵسۆزی باوکیانن، هەموو براکانی تریان تەنها تاقمێکی قین لە دڵن. بەمجۆرە بارزانی لە دژی ئەو هاندرا، بارزانی بانگی دەکات و دەتەقێتەوە بە روویدا، وەک ئەوەی لە بیرەوەریەکاندا هاتووە پێی دەڵێت: " تۆ خائن و جاسوسیت، تۆ لە دژی شۆڕش کار دەکەیت، بەم دەمانچەیەی دەستم دەتکوژم، هەروەک چۆن پێش تۆ حەمید

عوسمان و چل کەسی ترم کوشتووە، تۆ دەبیتە چل و یەک".
مەحو پێداگریی لەسەر ئەوە کردووە کە بزانێت هۆکاری ئەو توڕە بوونە چییە، بارزانی وەڵامی دەداتەوە و دەیڕێسێت و دەیهەژێنێتەوە " تۆ جاسوسیت، تۆ پیاوی عوبێدوڵای کوڕمی، نامەیەکم لایە بە ئیمزای تۆ کە بۆ ئەوت نوسیووە و پێت گوتووە کە تۆ دێیت بۆ کوردستان، ئەو نامەیە نەبوایە بە هاتنی تۆمان نەدەزانی".

چەرمەسەرییەکان بەمجۆرە دەستپێدەکەن. ماوەیەکی درێژ لەژێر چاودێری و دەستبەسەریدا مایەوە. فاخێر مێرگەسوری یەکێک لە پاڵەوانەکانی شۆڕش لەگەڵیدا دەستبەسەر بووە. ئەویش یەکێک لەوانە بووە کە گومانی لەسەر بووە، پیلانێک بۆ لابردنی لە گۆڕێدا بووە و هەموو هەوڵەکانیش بۆ ئازادکردنی سودی نەبوو.

دووای ئەوە مەحو دووچاری خراپتر بوو، لە شوێنی دەستبەسەرکردنی زۆرەملی، گواسترایەوە بۆ زیندانی خەلان، زیندانێک کە پڕکرابوو لە خەڵکی ناڕازی، ئەوانەی کە گومان لەسەر دڵسۆزییان هەبوو. ژیانی ناو کونجی بەندیخانە ترسناک و قێزەون بوو، بە خراپترین شێوە مامەڵەی لەگەڵدا کرا. زیندانی کرابوو بەبێ ئەوەی هیچ بنەمایەکی یاسایی بوونی هەبووبێت، بەبێ ئەوەی بەڵگەیەک لەسەر ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی کراون بوونی هەبووبێت. مەحو باس لە ئەشکەنجەکانی زیندان دەکات و

دەڵێت:" لە کاتی بوونم لە زیندان عەزاب و ئەشکەنجەیەکی زۆرم چەشت، سوکایەتی زۆریان پێدەکردم، بە شێوازی زۆر نامرۆڤانە زۆریان بۆ دەهێنام. هێشتا بەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەی ناو زیندانەکە کە بەرامبەرم کردیان دڵیان ئاوی نەخواردەوە، بۆ ئەوەی ورەم بشکێنن و زەلیل و چاوشۆڕم کەن منیان خستە نێو زیندانی تاکە کەس، ژوورێکی تەنگ و تار، کە پڕی بوو لە جانەوەرو مێرو"

بەبێ دادگایی کردن و لێپێچینەوە نزیکەی چوار ساڵی بە ئەشکەنجەوە بردە سەر، یەکسەر لە چاو تروکاندنێکدا، شۆڕش بەبێ تەقە هەرەسی هێنا. بارزانی و کوڕەکانی و هەموو بەرپرسانی حزبی بەرەو ئێران هەڵهاتن، چەکدارو پاسەوانەکانی زیندانیش هەڵهاتن. بەخت یاری بوو کە ئەمیش وەک زۆرێک لە زیندانییەکانی تر بەر شالاوی کوشتنی پێش ئاشبەتاڵەکە نەکەوت.

مەحو سەرەنجام ئازادی خۆی بەدەست هێنایەوەو لەگەڵ خەڵکی ئاوارەی دیکەدا ئاودیوی ئێران بوو، سەرکەوتوو بوو لەوەی بتوانێت بگاتە تاران و پەیوەندی بە باڵیۆزخانەی ولاتەکەی خۆیەوە بکات. زۆری نەبرد گەڕایەوە بۆ بەیروت، دواتر دەستی کرد بە نوسینەوەی یاداشتەکانی خۆی و لەم بیرەوەرییەدا بە شێوەیەکی ناوازە و پاراو و درشت پڕ لە میهر و ڕێزەوە...

**دکتۆر خالد شێخۆ شەمدین**

**بەیروت – کەناری باشور**

## دەروازە

حەزم کرد ئەو ناونیشانە (چوار ساڵ لە زیندانەکانی بارزانیدا)[1]، ناونیشانی ئەم کتێبەم بێت کە بڵاوی دەکەمەوە و بە دوورودرێژی بیرەوەرییەکانی خۆمی تێدا دەنوسمەوە. چەند جارێک نوسینم لەسەر ئەو هەموو پیلان و نەخشەو کردەوە نامرۆڤانانە نوسیوە کە دووچارم هاتوون، ئەویش لە لایەن کەسێکەوە کە من خۆم بە پیرۆزترین کەسم دانابوو، چونکە بەڕادەیەک خۆشم دەویست کە لەسەروو خۆشەویستی خۆشمەوە بوو، بەتایبەت کە رۆژگارێک من نوێنەری ئەو بووم لە لوبنان لە کاتی بەرپابوونی شۆڕشی کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٦١، ئەو کەسەش مەلا مستەفا بارزانی بوو. وێڕای هەموو ئەوانەش ویژدانم ئاسودە نەدەبوو کاتێک دەگەڕامەوە بۆ یادوەرییەکانی خۆم و هەستم بەو هەموو دەستدرێژیانە دەکرد

---

[1] لەچاپی یەکەمدا ئەم پێشەکییە بە دەستنوس بلاو کراوەتەوە، ئەوەش دەری دەخات کە جەمیل مەحۆ لەسەرەتادا ویستویەتی ئەوە بکات بە ناونیشانی کتێبەکەی، بەڵام دواتر رای خۆی گۆڕیوە و ناونیشانی ( بیرەوەرییەکانم لە زیندانەکانی شۆڕشی کوردا) داناوە. دیارە ناونیشانی دووەمی لە دوا ساتەکانی پێش چاپکردندا هەڵبژاردووە، رەنگە ئەوەش لەسەر راوێژی یەکێک لە هاوڕێکانی بووبێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو ناونیشانی سەر بەرگی کتێبەکەی گۆڕیوە، بەڵام لە بیری چووە ئەو ناونیشانە لەم پێشەکییەدا بگۆڕێت.

(سەرنجی وەرگێڕی کوردی لەسەر ئەم پەراوێزە: جەمیل مەحۆ هەمان ساڵی نوسینی ئەم بیرەوەریانە واتە لە ساڵی ١٩٨٢ بە جەڵتەی دڵ کۆچی دوایی دەکات، رەنگە ئەم دەستکاری کردنە لە دوای کۆچی دوایی خۆی کرابێت).

کە لە سەروبەندی شۆڕشدا دەکران. بۆ ئەوەی ویژدانم ئارام بێت دەبوو هەمووی بڵاو بکەمەوە، بۆ ئەوەی گەلی کورد بە راستییەکان ئاشنا بکەم، چونکە ئەوەی بەسەرمندا هات گرنگترین شت بوون لە هەموو ژیانمدا بەسەرما هاتبێت.

پەیوەندیم لەگەڵ بارزانی و سەرکردە کوردەکان و دڵسۆزی و راستگۆییم بۆیان یەکێک لەو هۆکارانەبوو کە پاڵی بەبارزانییەوە نا لە پشتەوە خەنجەرم لێبدات، ئەویش بە هاندان و دنەدانی لە لایەن سەرکردە گەندەڵ و لەرزۆکەکانی وەکو حەبیب محەمەد کەریم، مەحمود عوسمان، سامی عەبدول رەحمان، دارا تۆفیق عەتار، عەلی عەبدوڵا، عەزیز عەقراوی، جەرگیز فەتحوڵا، وێڕای ئیدریس و مەسعود بارزانی. لەم بارەوە بە بارزانیم دەگوت ئەوانە تاقمێک خیانەتکارو بەکرێگیراون.

لە کاتێکدا شۆڕش هەڵگیرسابوو، لە ترۆپکی خۆیدا بوو، منیان دەستگیر کرد. لە زیندانە ترسناکەکەوە، راستییەکانم رووبەڕوو دەکردنەوە، پێمدەگوتن کە چی دەگوزەرێت و چییان بەسەردێت ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەو رێچکەیە و لە گرتنەبەری ئەوجۆرە شێوازانە بەرامبەر بە شۆڕش و گەلی کورد، چونکە ئەرکی نەتەوەیی و شۆڕشگێڕانەم وایلێدەکردم کە راشکاوانە قسان بکەم و چۆنیەتی کارکردنیان بەرامبەر بە شۆڕش بۆ رون بکەمەوە تەنانەت لەناو ئەو زیندانە ترسناکەشدا بم و بڕیاریش بدەن گولە بارانم بکەن، بەلام ئیرادەی خوداو هەقیانەت رێگای

نەدا ئەوە روویدات. دواجار دەستەکەیان ئاشکرا بوو، ماسکی سەر روخساریشیان کەوت، ئەو روخسارە کۆنەپەرست و خائنانە، لە پێش هەموویانەوە ئیدریس و مەسعود بارزانی، گەلی کورد لە هەموو جێگایەک دەزانێت ئەو تاقمە خائنە چیان بەسەر هات.

ئەوەتا منیش لێرەدا ئەو کتێبە دەخەمە بەردەستان، بۆئەوەی بیخوێننەوەو ناوەرۆکەکەی بە جوانی تێبگەن، ئەو دەمەش هەموو شتێک لەسەر ئەو تاقمە دەزانن، بۆ ئەوەی چیدیکە بەدەستی ئەوانە هەڵنەخەڵەتێن کە شەرەفی گەلەکەی خۆیان فرۆشتووە، بۆ ئەوەی هیچ کەستان باوەڕ بەو سەرکردە کارتۆنییە قەڵبانە و قسەی باق و بریقیان نەکات. چۆن دەبێت کوردێکی بەشەرەف باوەڕ بە کەسێک بکات کە گەل و نیشتمان و خوێنی ئەو شەهیدانەی فرۆشتبێت کە لەپێناوی خاکی کوردستاندا خوێنیان رژا؟ بۆیە دەڵێم خەڵکینە خۆتان حوکم بدەن و خوداش باشترین حاکمە، مێژوو بۆ خۆی راستیەکان دەردەخات و راستیی ئەوەش دەسەلمێنێت کە من بەرامبەر ئەو خائن و خۆفرۆشانەی دوژمنی گەلی کورد و کوردستانی نیشتیمانیان، گوتوومن.

جەمیل مەحۆ

بەیروت ١-١- ١٩٨٢

## پێشەکی

ئەم بیرەوەریـانە بـریتین لەو بەسـەرهاتە راسـتەقینانەی کە بەدرێژایـی مـاوەی دەسـتگیرکردنم لە زینـدانەکانی کوردسـتانی عێراق بەسـەرمدا هـاتوون. حەزمکـرد بەشـێک لەو بیرەوەریـانە وەک یادگـاری تـاڵ و بۆ مێژوو تۆمـار بکەم، بە ئومێدی ئەوەی رێگـای تێکۆشـەرانی بەشـەرەف رۆشـن بکـاتەوە و هەنگاوەکـانی رێگای تێکۆشانێکی شەرەفمەندانەی لێبڕاو بەردەوامپێبدات تا ئەو کاتەی گەلی کوردم مافە رەواکانی بەدەست دێنێت و لە سـایەی دیموکراسیەتێکی راستەقینە، سەربڵند و ئازادانە بژی.

ئەم بیرەوەریـانە نە مێژوونوسـێکی شـارەزای بـوارەکە نوسـیویەتی و نە دەرچـووی یەکێـک لە خوێنـدنگاکان یـاخود زانکۆکـان نوسـیویەتی، بەڵکـو کەسـێکی ئاسـایی لەرۆڵەکـانی ئەم مـیلەتە زەحمەتکێشـە نوسـیویەتی کە هاوشـێوەی هەمـوو ئەو کوردانەی کە لە زیدی خۆیان هەڵکەنراون و لەگەل خێزانەکانیاندا بەشـوێن پەیـداکردنی نـانەوە بـوون. مـن یەکێـک بـووم لەو بەدبەختانەی کە چارەنووس یارم نەبوو، هەر ئەوەش وایکرد لەم وڵاتە جوانەی لوبنان بگیرسێمەوە. بێ خـانەو لانە و بـێ دەرەتـان بووین، خەباتی هەرە قورس و تاڵمـان لە پێنـاوی بژێوی ژیانمـان

بــوو. لوبنـــان لەم بــارەوە چـــاکەی زۆری بەســـەرمانەوە هەیە، ئاســـمانە پــاک و بــێگەردەکەی کــراوە بــوو، گەورە بــووین و پێگەیشــتین و ژیــانێکی شــەرافەتمەندانە و ئــازاد و پــڕ لە میهــر و لێبوردەیی ژیاین. نەخێر هەرگیز لوبنـان و چاکەی لوبنـان لە یاد نــاکەم. لە پێناویــدا وەک وەفــایەک بــۆ هەمــوو ئەوەی ئەم وڵاتە میــوان دۆســـتە پێشکەشــی کــردین، لە نێــو خۆشەویســتی ئەودا دەژیــم و دەمــرم. وڵاتێکــی رەســەن لە شارســـتانیەت و مێــژوودا. هەربژی لوبنان هەتا سەر، نەمرو سەرفراز و دیمـوکراس و ئـازاد بێت لانکەی پێکەوە ژیانی بێهاوتای مرۆڤایەتی.

## سەرەتای چیرۆکەکە:

ئەم بیرەوەریانە کۆمەڵێک بویەر و بەسـەرهاتن کە بە درێژایـی دەستبەســـەرکردنی زۆرەملــێم تیایانـــدا ژیــاوم، پێمخــۆش بــوو هەنــدێکیان تۆمــار بــکەم، چــونکە پێمــوایە لەو ســۆنگەیە دەتــوانم وێنەیەکــی راســتەقینەی بەرپرســـەکانی شــۆڕش و رەفتارەکانیــان نیشــاندەدات، کە بە هــیچ کلۆجێــک لەگەڵ داب و نەریتــی رەســـەنی مێژوویی و پڕ شکۆی کوردەواریدا ناگونجێت.

ئەم بیرەوەریـــانە لەمەڕ روداوەکـــان، بەو پەڕی ئەمـــانەت و دڵســــۆزییەوە یاداشـــت ئەکەم، خۆرســـکانە و بێلایەنـــانە ئەیـــانگێڕمەوە، بە ئامـــانجی ئەوەی بتـــوانم وێنەیەکـــی روون و زیندوی رەفتاری بەرپرسـەکانی نـاو شـۆڕش نیشـان بدەم کە لەو

زیندانە گەورەیە ئەنجامیان دەدا. بە زۆرە ملێ دەستبەسەر بووم، شەوو رۆژ لە ژێر چاودێری توندا بووم، بۆ هەرشوێنێک بڕۆشتمایەو هەرچۆنێک بجولامایە بە دوامەوە بوون. بۆچایخانە، فرۆشگاکان، تەنانەت بۆ سەرتاشخانە، هەر بە شوێنمەوە بوون، پیاوانی پاراستن پێموە نوسابوون. بە درێژایی دەستبەسەرکردنی زۆرەملێم رۆژێ لە رۆژان هەستم بەوە نەکرد کە مرۆڤێکی ئازاد بم. وەک دێوەزمە و تارمایی بۆ هەر کوێ بچومایە بە دوامەوە بوون. ئەوانە کلک و گوێی دەزگای هەواڵگری تایبەت بە شۆڕش بوون کە لەلایەن پیاوەکانی ئیدریس و مەسعود بارزانیەوە بەڕێوە دەبران، دەچوونە سەر هەموو ئەو شوێنانەی من بۆیان دەچوون، لەمەڕمن پرسیاریان لە خاوەنەکانی دەکرد. جەمیل مەحۆ چی پێ گوتوون؟ باسی چی بۆ کردوون، ئیدی هەرشتێک لەم بارەوە لەسەر من دەیانپرسی.

بەیانیان و ئێواران، هەمیشە لەسەر شۆستەی شەقامەکە دەوەستام، بۆئەوەی ئاگاداری هاتن یاخود رۆشتنی ئۆتۆمبیلەکانی ئیدریس و مەسعود بوومایە، بەڵکو یەکێکیان ببینم. زۆر جاریش بە رێکەوت ئەوانم دەبینی بە ئۆتۆمبیل بەبەردەممدا دەهاتن و سلاوم لێدەکردن و دەستم بۆ بەرز دەکردنەوە، بەلام بەداخێکی زۆرەوە ئاماژەکانی لوتبەرزی و لە خۆبایی بوونم بە ئاشکرا لە دەموچاویاندا دەبینی. لە جیاتی ئەوەی وەلامی سلاوەکانی من بدەنەوە وەک ئەوەی ئسول و عادەت دەخوازێت،

یاخود وەک ئەوەی کە دەڵێن (ئەگەر سلاوتان لێکرا، باشتر سلاو بکەنەوە، یان وەلامی بدەنەوە)، ئەوان تەنها بە سەر ڕاوەشاندن وەلامیان دەدایەوە، وا خۆیان دەرئەخست کە سەرقاڵی گفتوگۆکردنی بابەتێکی زۆر مەترسیدارن. لێرەدا حەز ئەکەم باسی روداوێک بکەم کە بەسەرما هات، باسی ئەو شێوازانەشتان بۆ ئەکەم کە پیاوەکانی پاراستنی سەربە مەسعود و ئیدریس پەیرەویان دەکرد.

ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوکاتەی لەژێر دەستبەسەرکردنی زۆرەملێدا بووم، لەپڕ شەوێکیان یەکێک لەو ئێشکگرانەی کە بۆ پاسەوانیی ژوورەکەی من دانرابوو، دیار نەما. پیاوانی هەواڵگری یەکسەر تۆباڵی دیار نەمانی ئەو کەسەیان خستە ئەستۆی من و دەیانگوت تۆ ئاسانکاریت بۆ کردووە بۆ راکردنی و بزانە بۆ چ ئەرکێک راتسپاردووەو ناردوتە. ڕۆژانە لە بارەی ئەو ئێشکگرەوە دەکەوتمە ژێر لێپرسینەوە. هەمیشە وەلامەکانم ئەوە بوو کە من هیچ پەیوەندیم پێوە نیە، سوێندم دەخوارد بە خودای گەورە کەمن بێتاوانم لەو تۆمەتەو هیچ نازانم. ئیتر ئەو روداوەیان کرد بە بیانوو لە دژی من و تۆمەتبارکردنم بە هەموو ئەو شتانەی کە ڕویانداوە. ئێشکگرتنیان توند کردمەوە، چاودێریکردنیان خەست کردەوە، کاریان گەیاندە ئەوەی کە خواردنی ئێوارانم لێببڕن و هەموو شێوازێکی ئەشکەنجەی جەستەیی و دەرونیان لەگەڵدا پەیرەو کردم.

نزیکەی هەفتەیەک بەسەر دیار نەمانی ئەو پاسەوانە تێپەڕی. دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە ئەو حەزی لە یەکێک لە کیژۆڵەکانی ئەو گوندە کردووەو کچەکەی هەڵگرتووەو پەنای بۆ ماڵی شێخ بابۆ برا گەورەی مەلا مستەفا بردووە و لەوێ لەیەکتر مارەبڕ کراون. دواتر بە ڕێکەوت چاوم بە زاوای هەڵهاتوو کەوت و هۆکاری ڕاکردنەکەیم لێپرسی، لە وەڵامدا گوتی: کاک جەمیل من پیاوێکی بەش مەینەتم، دە ساڵی ڕەبەقە من پەیوەندیم بە شۆڕشەوە کردووە و دووچاری هەموو مەترسییەکی ژیان بوومەتەوەو قوربانیم داوە، کەچی لەدوای هەموو ئەوانە هەستم دەکرد کە ڕێزم ناگرن و پێم نازانن، تەنانەت خۆشم وەکو ئەوان بە کورد نەئەزانی. وەکو کویلەیەکی خزمەتکاری خۆیان سەیریان ئەکردم، نەک وەکو پێشمەرگەیەکی تێکۆشەری ڕێگای شۆڕش، دواتر بۆم دەرکەوت هۆکاری ئەو مامەڵە خراپە ئەوەیە کە من کوردی ئێرانم، بۆیە ئەوەشم کرد بۆ ئەوەی ببم بە یەکێک لەوان دوای ئەوەی ژنێکم هێنا لە هۆزەکەی ئەوان.

لەو دیمەنانەی کە ڕۆژانە دووبارە دەبوونەوەو زۆربەیانم بە چاوی خۆم دەبینی، ئەوە بوو کە سەدەها کەس لە ڕۆڵەکانی ئەم گەلە ڕۆژانە لەبەردەم بارەگای ئیدریس و مەسعود دەوەستان و چاوەڕوانی هاتنی ئەوانیان دەکرد، بۆ ئەوەی کێشەکانی خۆیانیان بۆ باس بکەن، زۆربەی ئەوانە ژنان و بێوەژنان و هەتیوباری دەستی شۆڕش بوون، یاخود دایکانی ئەو شەهیدانە بوون کە

دەهاتن بۆ وەرگرتنی موچەی مانگانەی شەهیدانەی رۆڵەکانیان. هەموویان لەژێر تیشکی خۆری پروکێنەردا، وەکو رانەمەڕو قافڵەی کۆیلە دەوەستان. بۆچەندین سەعاتی دریژ زۆر جار هەتا ئێوارە لە چاوەڕوانیدا دەمانەوە بەبێ ئەوەی هیچ سودێکی هەبێت، کەسێک نەبوو وەڵامێکیان بداتەوە و گوێ لە سکاڵاکانیان بگرێت. لە ناکاوێکدا کەسێک لە نوسینگەکەوە بەناوی مەجید دەهاتە دەرەوە و زۆر ملهوڕ و زۆردارانە دەیگوت: کاتی ئەمڕۆ تەواو بوو. ئەم هەواڵە شاهنشاهیانە لەم مەجید ناوەوە وەکو بروسکە دەهاتە دەرێ و رق و کینەیەکی خەفەکراو و یاخیبوونێکی لەنێوچاوانی هەموو ئەو بێوەژن و پیرەمێردانەدا دروست دەکرد. زوڵملێکراوان و ئەشکەنجەدراوانی نێو زیندانی ترسناکیش، بێدەسەڵاتبوون و هیچیان لەدەست نەدەهات، تەنها هێندە نەبێت ملکەچی فەرمانی ستەمکاران بن.

زۆرینەی ئەو خەڵکە بەش مەینەتە لە هەژاران و نەداران و چەوساوەکان بوون، ناچار دەبوون لە پەناو پاسارو لاکۆڵان و سەر شۆستەکانی حاجی ئۆمەران و قەسرێ و گەلاڵە، یاخود لە بارەگای مەکتەبی سیاسی بەبێ پۆشاک و راخەر بخەون، بەشێکی زۆر کەمیان توانای ئەوەیان هەبوو بچنە هۆتێل.

ئەم بارودۆخە نالەبارە بەهیچ جۆرێک شایەنی مرۆڤ نیە، هۆکارەکان هەرچییەک بن. جگە لەوەش ئەو داماوانە فلسە سورەیەکیان لە گیرفاندا نەبوو تا بتوانن خواردنی پێبکڕن. ئەم

دۆخە هەندێ جار یەک هەفتەی تەواو درێژەی هەبوو، جا بزانە چ جۆرە ئەشکەنجەو ئازارێکیان چەشتووە بەهۆی شێوازی مامەڵەکردن و رەفتار کردن لەگەڵیان. دوای ئەو هەموو خەفەت و ناسۆرییانە، کاکی ژمێریار دەهاتە دەرەوە و دەستی دەکرد بە پێدانی موچەی پێنج دینار بۆ هەر خێزانێک. خۆم بە گوێی خۆم قروسکانەوەی دایکان و بێوەژنانی یاخیبووم دەبیست کە بە دەنگی بەرز هاواریان دەکرد و تاڵاوی ژیانت لە دەنگیاندا هەستپێدەکرد کە بەرق و کینەوە دەیانگوت: کوا ویژدان؟ کوا مروەت؟ مێردەکەم و کورەکەم لە پێناوی شۆرشدا شەهید بوون. یەکێکی تریان هاواری دەکرد: من لە هەولێرەوە هاتووم بۆ حاجی ئۆمەران بۆ ئەوەی تەنها چەند تاکە دینارێکم بدەنێ بۆ مەسرەفی منداڵە هەتیوەکانم کە باوکیان لە پێناوی شۆرشی کوردا، خوێنی خۆی بەم خاکە بەخشی و شەهید بوو، هاتووم بۆ ئەوەی پێنج دینارم بدەنێ شەرمە بۆتان، شورەییە بۆتان...

بەشێکی دیکە لەو داماوانە کەمترلە پێنج دیناریان وەردەگرت، ئیدی لە حاڵەتێکی هێندە زەبوون و خەفەتبار دەتبینین، مرۆڤ جەرگی بۆیان دەسوتا، ناڵە و ناسۆر لە قوڵایی قورگیانەوە دەهاتە دەرەوە، دڵیان خوێنی لێدەچۆرِی کاتێک بەو حاڵەتە پر لە کەسەرەوە لە بارەگای بەرزترین دەسەڵاتی شۆرشەوە دەهاتنە دەرەوە!

بەڵام ئەوانەی بەخت یاریان بوو، پارەیەکی باشیان وەردەگرت لە چینی بەکرێگیراوەکان بوون، پیاوانی هەواڵگری و ئەندامانی دەزگای پاراستن بوون. ئەو ئاژان و خائنانە رۆژانە لەبەردەم خێوەتگەی ئیدریسدا دەوەستان و راپۆرتە درۆیینەکانی خۆیان پێشکەش دەکردن. ئەو راپۆرتانە بەشی هەرە زۆریان بوختان و درۆی هەڵبەستراو بوون کە لە دژی ئەو تێکۆشەرە کوردانە دەهۆنرانەوە خەباتیان لە پێناوی گەلی کوردا دەکرد. ئاژانەکان لە هۆتێل و سەرەڕێ و چایخانە و شەقامەکاندا خەڵکیان دەدواندو قسەیان لێدەردەکێشان، دواتر دەیانکرد بە راپۆرت لەسەریان. لە دوای تێپەڕبوونی یەک سەعات بەسەر وەرگرتنی راپۆرتەکاندا، بۆ هەر کەسێکیان پەنجا دینار یاخود زیاتر تەرخان دەکرا، ئەوەش بەپێی ناوەرۆکی راپۆرتە درۆیینەکەو رادەی کاریگەربوونی بەسەر دەسەلاتیاندا.

ئەم پارانە لە لایەن ئەو سەرکردە ساختانەوە بەناوی شۆڕشەوە دابەش دەکران بەسەر کریگرتەو دارو دەستەو چەتەکانی خۆیاندا، لە کاتێکدا هەزاران کەس لە خەڵکی بێدەرەتانی کوردمان لە هەژاران و چەوساوان، رۆحی خۆیان و رۆڵەکانیان دەبەخشی، خوێنی پاکی خۆیان دەکردە خەلات، بۆ پاراستنی خاک و ئاخی کوردستان. سەرباری هەمسوو ئەو نەهامەتی و سوکایەتیکردنانەش هێشتا کاروانی شەهیدانی کوردستان، رێبازی

فیداکاری و قوربانیدان دریژەپێدەدات. ڕێبازی شۆڕشی ڕەسەنی کوردستان پشتیوان بەخوای گەورە هەر سەردەکەوێت.

خێزانی هەموو ئەو نەبەرد و پاڵەوانانە، وەکو کۆیلەی بەخسیرکراو چەندین ڕۆژ چاوەڕوان دەبوون هەتا ستەمکاران بەخێری خۆیان تەنها پێنج دیناریان پێدەدان، ئەمەش موچەی هەر خێزانێکی خاوەن شەهیدی کوردستان بوو.

ئیدریس و مەسعود پێش کاتژمێر دوازدە یاخود کەمێک زوتر، دەگەیشتنە نێو بارەگای خۆیان، کە دەهاتن دەوروبەریان بە پیاوانی هەواڵگری دەتەنرا. زۆر بە فیزەوە خۆیان دەکرد بەناو بارەگا، لە دەرەوەی بارەگاش خەڵکیی وەک ڕانەمەڕ لەژێر تیشکی خۆردا پڕوکابوون، یاخود لە ژێر لێزمەی باراندا دەخوسان وسوک و سەفیل دەکران.

یەکەمین کەس کە دەچووە لایان، سەرۆکی بەشی هەواڵگری محەمەد عەزیز بوو. ڕاپۆرتی کاری ڕۆژانەی خۆی پێشکەش دەکردن، ئیتر ئەوەی بەدەمیدا دەهات لە درۆ و دەلەسەو بوختان لە دژی تێکۆشەران و پێشمەرگە پاڵەوانەکان و هەر کوردێکی تری بەشەرەف کە بە ناهەق کەوتبێتە داوی خۆی یاخود کەوتبێتە چنگی قەڵەمی هەواڵگرییەوە.

دواتر کەسی دووەم دەچووە لایان کە فرانسوا هەریری بوو، سەرۆکی بەشی هەواڵگریی گشتی، کە پلەکەی لەدوای مەسعودەوە بوو. ئەو لەگەڵ چەند کەسێکی دارودەستەی خۆیدا

دەچووە ژوورەوە. ئەویش لەدوای محەمەد عەزیز[٢]، راپۆرتە درۆینەو هەڵبەستراوەکانی خۆی پێشکەش دەکرد. بەمجۆرە کات تێدەپەڕی نزیکی سەعات دووی پاش نیوەڕۆ دەبووەوە. لەو کاتەدا بەرپرسی بارەگا دەهات و گەورەی خۆی بانگ دەکرد بۆ نان خواردن. خزمەتکارەکان بە پرتاو دەهاتن و هەرچی خواردنی بەلەزەت و خۆش هەبوو لەبەردەم ئەواندا دایاندەنا، لە پاشاندا جۆرەها میوەیان دەهێناو دواتر دەستیان بە چای خواردنەوە دەکرد، ئینجا دەکەوتنە زەمکردنی ئەم و ئەو گوایا خەریکی پیلانگێڕان و ئاژاوەن، هەمووشی بە بوختان و درۆ. دەمەو کاتژمێر سێ ستەمکاران ڕێگایان دەدا بە هەندێ لەوانەی کە لە بەیانیەوە چاوەڕوان بوون (بێگومان لەوانەی کە نزیکی خۆیان بوون) بێنە ژوورێ و کەمێک گوێ بۆ داواکانیان بگرن. بەمجۆرە هەتا کاتژمێر چواریان دەبردە سەر، ئیتر دەمودەست کارمەندەکەی ئیدریس (مەجید) دەهاتە دەرەوەو بەدەنگێکی بەرز فەرمانی بە سەدان کەس لەو هەژارو نەدارانە دەکرد کە لە دەرەوە چاوەڕێ بوون نۆرەیان بێت و سکاڵای خۆیان بگەیەنن و چاویان بە خاوەن پایە ئیدریس بارزانی بکەوێت و پێی دەگوتن: کاتی دەوامکردنی ئەمڕۆ تەواو بوو، گوایا ئیدریس و مەسعود

---

[٢] محەمەد عەزیز قادر ناسراو بە شێخ محەمەد هەرسین، ساڵی ١٩٧٩ واتە چەند ساڵێک لە دوای ئاشبەتاڵ، هەر لە ئێران بەدەستی مەسعود بارزانی رفێنردراو هە رلە ئێرانیش بێسەروشوێن کرا. باوکی شاری هەرسین ئەندام پەرلەمانی پارتییە و بەرامبەر بە پارە لە خوێنی باوکی خۆش بوو.

کـاری گرنگیـان هەیەو رۆشـتوون. ئەم مەجیـد نـاوە زۆر نـا جـوامێرانە دەری دەکـردن. مـن سـەرنجم دەدان بە تـایبەت ئەو کاتەی کە دەیگوت دەوام تەواو بووە و ناتوانن کەسی تر بکەنە ژوورەوە، بێـزاری و نـارەزایی دایـدەگرتن، گـوێم لێـدەبوو قسـەی نەشـیاویان دەکـرد و نەفرەتیـان لەو رۆژە دەکـرد کە تەقڵـی ئەم شۆڕشـە سـاختەیە بـوون، لەسـەرو هەمووشـیانەوە ئەو بەرپرسـە سـتەمکارانە. نیشـانەکانی تـوڕەیی و یـاخیبوون لە روخسـاریاندا بەدی دەکـرا. رۆژ لە دوای رۆژ زیـاتر لەنـاو ناسـۆرییەکانی ئەم شۆڕشـەدا دەژیـام، روداوەکـان بەو شـێوە ناپەسـەند و نالەبـارە دووبارە دەبوونەوە، بە جۆرێک کە بۆ هیچ مرۆڤێکی خـاوەن دیـن و ویژدان پەسەند نەدەکرا.

## لە بارەگای ئیدریس بارزانی

لێرەدا دێـتەوە یـادم، روداوێکتـان بـۆ بـاس دەکەم کە بەچـاوی خـۆم بینـیم. لە بیـرم دێـت کاتێـک لە ژێـر دەسـتبەسـەرکردنی زۆرەملـێ و چـاودێرییەکی تونـدو تۆڵـدا بـووم، لە یەکێـک لە خێوەتگاکانی نزیک بارەگای ئیدریس لە حاجی ئۆمەران، کە چەنـد پیـاوێکی ئیـدریس ئێشـکگری بـوون. بەرێکەوت خێـوەتەکەی مـن نزیـک نانـدێنی بارەگـا بـوو. رۆژێکیـان بەتەنهـا لەنـاو خێـوەتەکەم دۆشـدامابووم و لە بـارێکی دەرونیـی خراپـدا بـووم، خەیـاڵم دەگەڕایەوە بۆ لوبنان و بیرم لە دایکە پیرەکەم و هاوژین و منداڵ

و خوشک و براو هاوڕێکانم دەکردەوە. هەموو ئەو یادگاریانە لەناو سەرمدا دەهاتن و دەچوون. بەبێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت دڵم پڕبوو لە گریان و بە دڵێکی شکاو بەکوڵ دەگریام و پەرۆشیم بۆ دیبەنی ئەوان هەڵیدەقرچاندم. لەناو گێژاوی ئەو ناسۆریانەدا کە خۆمی تێدابووم، لەپڕ هاوار و قیژەیەکی زۆر خەمەکانی بڕیم و لە خێوەتەکەم چوومە دەرەوە بزانم چی دەگوزەرێت. بینیم هەندێ لە پیاوەکانی ئیدریس بە ڕۆژی ڕوناک و بەبەرچاوی خەڵکەوە بەربوونەتە یەکێک لە پێشمەرگەکان و بە سەختی لێیدەدەن. ویستم بزانم بۆچی ئەو پێشمەرگە داماوە بەوجۆرە سزا دەدرێت. پرسیارم لە یەکێک لەو پاسەوانانە کرد کە لە نێوانماندا هاوسۆزی هەبوو، ڕێزی دەگرتم و بەزەیی پێمدا دەهاتەوە، پرسیاری هۆکارەکەم لێکرد، بە دەنگێکی نزم بۆ ئەوەی کەسێک لە هاوڕێکانی گوێداری نەکات و زمانی لێنەدات، گوتی: کاک جەمیل سەرکردەکانمان گۆشت و مریشک و هەموو خواردنێکی خۆش دەخۆن، لە کاتێکدا پێشمەرگەکان لە برساندا دەمرن. پێمگوت تێناگەم مەبەستت چییە؟ زیاتر گوتی: کاک جەمیل ئەو پێشمەرگەیەی کە پاسەوانەکان لێیدەدەن، هاتووە بۆ نانەدێنەکە و داوای خواردنی کردووە و وتویەتی لە دوورەوە هاتووم و زۆرم برسییەو پارەم پێنییە شتێک بکڕم و لە یەکێک لەچێشتخانەکاندا خۆم تێر بکەم، هەوڵیداوە چاوی بە ئیدریس و مەسعود بکەوێت، بەڵام بێ سود بووە، پێیان گوتووە کاتی

چاوپێکەوتن تەواو بووە و پاسەوانەکان ویستویانە بە پاڵ بیکەنە دەرەوە لە ناندێنەکە، ئیتر ئەویش بە دەنگی بەرزو لەبەردەم هەمووانـدا دەستی بە هـاوار کـردووە و گوتوویەتی پێنج ساڵە پێشمەرگەم و هیچم نیە جگە لەم چەکەی شانم نەبێت کە لە پێناوی شۆڕشدا پێی دەجەنگێم، بۆیە دەبێت خواردنم بدەنێ. هەر بۆیە کاک جەمیل تەنها لەبەر ئەوەی ئەو قسانەی کرد کارێکیان بەسەردا هێنا هەتا ماوە لە بیری نەچێتەوە.

پاشماوەی خۆراکەکان و بەرماوەکان کۆدەکرانەوەو تێکەڵ دەکران و ئێواران پێشمەرگەکانی شاخی هەڵگورد دەهاتن و لە ناو سەتڵدا لەگەڵ نانـدا دەیانبرد بۆ ئەو پێشمەرگە جەنگاوەرە بەشەرەفانەی کە بەرگرییان لە شۆڕش دەکرد!.

ئەم دیمەنانەو چەندانی تریش کۆمەڵێک شت بوون کە ڕۆژانە دەمبینین. سەدان تێکۆشەری کوردم دەبینی لە نێوانیانـدا کەسایەتی ناوداری سەرۆک هۆز، کە فەرمانی دەستگیرکردنیان بۆ دەردەکرا، تەنها بۆ ئەوەی ملکەچیان بکەن لە گوندێکی دوورە دەست یان لە هۆتێلێک یان لە بارەگاکانیانـدا دەیانخستنە ژێر چاودێری توندەوەو هەر جۆرە چاوپێکەوتن و سەردان و قسەکردنێکیان لەگەڵ هەر کەسێکدا لێقەدەغە دەکردن. هەروەها دەمبینی کە چۆن بەشێک لەو هاوڵاتییە بەشەرەفانە لە ناوەڕاستی ڕێگا دەوەستان و وەکو شێت هاواریان دەکرد و دەیانگوت: ئەی خودایە ئێمە بێتاوانین و هیچ گوناهێکمان نەکردووە و لەسەر

هەقین. کاتێکیش ئیدریس و مەسعود لە ژێر چاودێرییەکی توندا لە ئۆتۆمبیلەکانیــان دەهــاتنە خــوارەوە؛ هەنــدێ لەو کــوردە بەشــەرەفانە لەبەردەم ئۆتــۆمبیلە ســەربازییەکەدا دەوەســتان و پێیـان دەگوتن: دەمانەوێت چاومـان بە مەلا مسـتەفا بکەوێت، لە خوا بترسن، ئێمە بێتاوانین گوناهمان چییە تاوەکو بمانخەنە ژێر چـاودێری؟ چیمـان کـردووە؟ لەخـوا بترسـن، بەڵام پاسـەوانەکان بەپاڵ دەریاندەکردن وەک ئەوەی بڵاوە بە ئاژەڵ بکەن بۆ ئەوەی ڕێگا لەبەردەم ئۆتۆمبیلی سەرکردە ساختەکاندا بکەنەوە.

سەرکردەکانی شۆڕش بە تایبەت ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکرات، پشتیان بە سیخورو ئاژان و دۆلار دەبەست و مافەکانی گەلی کوردی ڕەسەنیان بە تەواوی پشتگوێ خستبوو. گەلی کوردیان خستبووە نێو بەرداشی هەژاری و زوڵم و ستەم لە لایەک و لەملاشــەوە پیــاوانی نــامەردی هەواڵگــری بەردەوام ڕاپۆرتی درۆینەیان لە دژی خەڵک دەنوسی بۆ ئەوەی ملکەچیان بکەن. ئەو ملیۆنان پارەیەش کە سەرانی شۆڕش لە باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە تاران و باڵیۆزخانەی دەوڵەتانی تری هاوپەیمانیان لە پەیمانی سەنتۆ[٢] بە تایبەت لە ئێران وەریان دەگرت، هەموو ئەو

---

[٢] پەیمانی سەنتۆ یاخود پەیمانی بەغدا ساڵی ١٩٥٥ بە سەرپەرشتی ئەمەریکا لەلایەن بەریتانیاوە دروستکرا. ئەم پەیمانە وەک سێیەری پەیمانی ناتۆ بوو کە لە پێناو دژایەتیکردنی بزووتنەوە مارکسی و چەپەکان کاری دەکرد. ئەو وڵاتانەی لەم پەیمانەدا ئەندام بوون ئەمانە بوون (بەریتانیا، تورکیا، عێراق، ئێران، پاکستان) ساڵی ١٩٥٨ لە دوای ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی لە عێراق بەهۆی کودەتای قاسم، عێراق لەم

پارانە بەناوی شۆڕش و لەژێر دروشمی باق و بریقدا گوایا بۆ ڕزگاری گەلی کوردە لە زوڵم و ستەم و دواکەوتوویی کە پێوەی دەیناڵاند. لە جیاتی ئەوەی کەئەو هەموو ملیۆنە زۆرانە بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچە دواکەوتووەکانی کوردستان و بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی و خوێندن و بۆ دەرهێنانی خەڵکی کورد لە چنگی دوواکەوتوویی و نەخوێندەواری بەکاربێت و خەڵکەکە بگوازرێتەوە بۆ ئاستێک کە شایەنی مرۆڤ بێت لە سەدەی بیستەمدا و ژیانێکی شەرەفمەندانەو باشتربژی و لە پێناوی سەقامگیری و رەفاهیەتی گەلی خۆیاندا ئەو پارانە سەرف بکەن، کەچی" سەرکردەکانی شۆڕش" بەیەکسانی بەسەر خۆیان و دارودەستەو پیاوانی هەواڵگری و سیخوڕەکاندا دابەشیان دەکرد. پارەکانیشیان لە بانکەکانی سویسرا و تاران و بانکەکانی تر لە وڵاتانی خۆرئاوا دادەنا. ئەوانە دروشمی بریقەداریان بەرزدەکردەوە بە ئامانجی سەر لێشێواندنی جەنگاوەرە بەشەرەفەکان و خاپاندنیان.

## کوردستان یا نەمان!

شتێکی ئاساییە کە لە هەموو شۆڕشێکی رزگاریخوازی دنیادا، سەرکردایەتی شۆڕش ئۆتۆمبێلی جیبی سەربازیی هەبێت و سەرکردەکانی بەکاری بێنن بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانی شۆڕش.

---

پەیمانە کشایەوە. ساڵی ١٩٧٩ لەدوای روخانی رژێمی شای ئێران، پەیمانەکە بە تەواوی هەڵوەشایەوە.

بەرپرزانــی ئەنــدامی مەکـتەب سیاســی و لیـژنەی ناوەنـدی هەر کەسـێکیان زیـاتر لە یەک ئۆتـۆمبیلی ئەمەریکـی مۆدیـل بەرزی هەبسوو کە تەنهـا لە ئەمەریکـا هاوشـێوەیان هەبـوو. ئەنـدامانی لیژنەی ناوەندی هەڵپەیان بوو بۆ سواربوونی ئەوجۆرە ئۆتۆمبیلە مۆدیل بەرزانەو لە چیاکانی کوردستاندا لەبەردەم پێشمەرگەکاندا خۆیانی پێوە بابدەن. نزیکەی دە رۆژ بەر لە ئاشبەتاڵ و هەرەسی شـۆڕش، مـحەمەد عەزیـز، سـەرۆکی بەشـی هەواڵگری تـایبەت بە مەسعود بـارزانی یەکێک لە داردەستەکانی خۆی بەنـاوی " تەهـا" نـارد بۆ ئەڵمانیـای خۆرئـاوا بـۆ ئەوەی ئۆتـۆمبیلێکی مارسیدسـی مۆدێل ١٩٧٥ی بۆ بکڕێت. هەر ئەوەندەی حەبیب محەمەد کەریمی سـکرتێری حـزب و دکتـۆر مەحمـود عوسـمان و ئەوانـی تـر بەو کارەیـان زانـی، ئەوانیش لای خۆیـانەوە داردەسـت و ژمێریاریـان نارد بۆ هەمان مەبەست، ئەمە جگە لەو هەموو موڵک و مـاڵەی کە بەزەبری چەک لە ناوچەکانی بەغداد و کەرکوک و شـارەکانی تر، بەهەرزانترین نرخ دەیانکڕی. وەک بازرگـان و بـزنس مـان بـوون بەبـێ ئەوەی کـۆ لەهـیچ لێپرسـینەوەیەک بـکەن، یـاخود کەسـێک پێیان بڵێت ئەمەتان بەچی کڕی و لە کوێتان بوو؟

ئەمە هەنـدێ لەو راسـتیانەبوون کە لەنـاو شـۆڕش و بەنـاوی شۆڕشەوە دەگوزەران، جگە لە سـەرانە سـەندن و خـۆ دەوڵەمەنـد کردنــــی نــــا مەشـــروع. هەمـــوو ئەم کـــردەوانە بە ئاگـــاداری بەرپرسەکان دەکران، ئەوانەی خۆیان وەک سەرکردەی خەبات و تێکۆشان لە پێناوی گەلی کورد ناوزەدکردبوو.

### زانیاری لەسەر ئەو سەرکردانە

بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی روون و رەوانتان لەسەر ئەو تاوانبارە شەڕانگێزانە هەبێت ئەم پێناسەیەتان بۆ دەکەم: حەبیب محەمەد کەریم کێیە و چی لە بارەیەوە دەزانن؟

حەبیب محەمەد کەریم فەرمانبەرێکی نەناسراوی رادیۆی بەغدا بوو لەسەردەمی پادشایەتی و رۆژانی نوری سەعید[1]، محەمەد عەزیزیش دەستگێرێکی گەڕۆک بووە و بە قولینە نانی خستۆتە سەرسەری و لە کۆلانەکانی کەرکوک و سلێمانی فرۆشتوویەتی. عەلی سنجاری لە شەقامی رەشید لە شاری بەغدا ئاوی فرۆشتووە و هاواری کردووە پەرداخێک ئاو بە پێنج فلس. فرانسوا حەریریش مامۆستا بووە لە یەکێک لە گوندەکانی ناوچەی هەریر.

ئەوانەی کە ناوم بردن و لە رابوردوو لە پەراوێزی ژیاندا کەسانێکی نەناسراو بوون، چۆن لە نێوان شەو و رۆژێکدا بوون

---

[1] حەبیب محەمەد کەریم مەلەکشاهی ناسراوە بە حەبیب فەیلی سالی ١٩٣١ لە زرباتیە لەدایک بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و زانکۆی لە بەغدا خوێندووە. سالی ١٩٥٩ هاوڕێ لەگەل مام جەلال تالەبانی کۆلیژی ماف (حقوق) تەواو دەکەن. لە دوای ئیبراهیم ئەحمەد و هەمزە عەبدولا سێیەمین سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بووە. کەسێکی هەلپەرست و دژوار بووەو زۆر جێگای متمانەی بارزانی بووە، هەمیشە گومانی ئەوەی لەسەر بووە کە بۆ حسابی دەولەتی ئێران کار دەکات، یەکێک بوو لەوانەی کە دوای ئاشبەتال تەسلیم بە حکومەتی عێراق بووە. سالی ٢٠١٣ لە بەیروت کۆچی دوایی کردووە. کوڕە گەورەکەی بەناوی ئاراس حەبیب لە دوای ئەحمەد چەلەبی بوو بە بەرپرسی یەکەمی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق.

بە خاوەنی سامانێکی یەکجار زۆر لە موڵک و ماڵ؟ ئەمە جگە لەوەی هەر یەکە لەوانە خاوەنی هەژماری بانکی بوو لە دەرەوەی وڵات. ئەم سەروەت و سامانە لە ڕێگای گەندەڵی و بەزۆری دەسەڵات بەدەستهاتووە لە سایەی ئەو هەموو قوربانییەی کە ڕۆڵەکانی گەلی کوردی تێکۆشەرمان پێشکەشی کردووە، لە پێناو بوونی خۆیی و ئازادی و رزگاربوون لە چەوساندنەوەو لە چنگی ئیمپریالیزم و دواکەوتوویی.

ئەم ستەمکارانە لە پشتی شۆڕش و دەستکەوتەکانی شۆڕشەوە خۆیان مەڵاس دابوو، دروشمی (کوردستان یان نەمان) یان کردبووە چەکی خۆیان بە خراپترین شێوە بەکاریان دەهێنا. ئەم سەرکردانە لە سەرو هەموشیانەوە حەبیب محەمەد کەریم کە زۆر کردەوەی ناپەسەندی لێدەوەشایەوە دوور لە هەموو ئاکارێکی گەلی کوردی رەسەن بوو. ئەوانە زۆر بەد ڕەوشت و نامەردانە لە ماڵەکانی خۆیاندا دەستدرێژییان دەکردە سەر ئەو ژنانەی کە هاوژینەکانیان پێشمەرگە بوون. هەموو کوردێک لە عێراق زۆر باش دەزانێت کە حەبیب محەمەد کەریم پیاوێکی بێڕەوشت بوو، هەر کەس دەزانێت ئەو لە کۆتایی ۱۹۷۱ لە هاوژینەکەی خۆی جیا بۆوە کە دایکی سێ منداڵ بوو، هەموو کەسێکیش هۆکاری راستەقینەی ئەو جیابوونەوەیە دەزانێت. بۆ دەرخستنی راستیەکانیش هاوژینە بەڕێزەکەی ئەو خۆی داوای جیابوونەوەی کردو دواتر ڕۆشت لە بەغدا مێردی کردەوە بە

ئەفســـەرێکی ســـوپای عێـــراق. هۆکـــاری ئەوەی کە داوای جیـابوونەوەی کـرد، ئەوە بـوو کە ئاگـاداری رەفتـارو رەوشـتی مێردەکەی بـوو، دەیزانـی کە هەر لە مـاڵەکەی خۆیانـدا یـاخود لە شـوێنانی دیـکەدا دەسـتدرێژی دەکـاتە سـەر ئەو ژنـانەی کە هاوژینەکانیـان پێشـمەرگەن، بـۆیە نەیتـوانی بەردەوام بێـت لە گەڵیاندا.

لە ناو شۆڕشدا بەدڕەوشتی بە شێوازێکی ترسناک تەشەنەی سەندبوو، کـاری نەشـیاو بە زۆر و بەهەڕەشـە ئەنجـام دەدران. داورودەسـتەی مەکـتەب سیاسـی و پاسـەوان و پیاوەکـانی ئەو شەیتانەی کە نـاوی ئیدریس بـارزانی بوو؛ گوند و نـاوچە دوورە دەستەکان دەگەڕان، دەسـتدرێژییان دەکردە سـەر ئەو ژنـانەی کە مێردەکانیان لە گۆڕەپانی شەرەف بوون و بە خوێنی خۆیـان زۆر ئازایانەو بەشێوەیەکی ئەفسوناوی بەرگرییـان لە خـاکی پیرۆزی نیشتیمان دەکرد. بەچاوی خۆم دەمبینی کە چۆن شـەوانە مەسـت دەبوون و شوشـەی عارەق و کۆنیاکیان لە گیرفاندا بوو.

لێـرەدا روداوێکـم وەبیـر دێـتەوە کە بەسـەر کچێکـی١٤ سـاڵە هات، ئەو کـچە لە بارەگـای ئیـدریس بـارزانی کـاری دەکـرد، دوای تێپەڕبـوونی مـاوەیەک ئاشـکرا بـوو کە ئەو کـچە دووگیـان بـووە. لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردو کـچە ددانـی بەوەدا نـا کە سـەرجێگای لەگەڵ یەکێـک لە شـۆفێرەکانی ئیـدریس و مەسـعود کـردووە. شـۆفێرەکە نـاوی مـحەمەد بـوو بە مەحـۆ بانگیان دەکرد، ئەویش

چووە ژێر باری ئەو راستیەو درکاندی ئەو تاکە کەس نەبووە ئەو کارەی ئەنجامداوە، بەڵکو هەموو شۆفێرەکانی بارەگای ئیدریس بارزانی، دەستدرێژییان کردۆتە سەر ئەو کچە. سەرەنجام لە ترسی ئەوەی ئاشکراو رسوا نەبن، لە جیاتی ئەوەی ئەو تاوانبارانە بخەنە بەردەم دادگا، کچەی داماویان دەرکرد و لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش شاربەدەریان کرد و ناردیان بۆ بەغدا بۆ ئەوەی لەوێ ون بێت و بەتەنها خۆی بکەوێتە بەردەم چارەنوسێکی رەش و نادیار[°].

ئەمە بەشێک بوو لەو بوویەرانەی لە بارەگای ئیدریس و مەسعود دەگوزەران. ئەو رەفتارانە لەگەڵ سروشت و نەریتی رەسەنی کوردەواریدا نەدەگونجان. بەدڕەوشتی و شەرواڵ پیسی تەشەنەی سەندبوو، هەموو ئەو رەفتارە نەشیاوانەم بەچاوەکانی خۆم دیوەو بەرجەستەم کردوون و لەو کاتەی لە زیندانە

---

[°] ئەم چیرۆکە دەمانباتەوە بۆ هەمان چیرۆکی کوشتنی ژنە پێشمەرگەی بەناوبانگی یاخیبوونی ئەیلول بە ناوی مارگرێت جۆرج. ئەم ئافرەتە کە ژنێکی ئازاو چاونەترسی ئاشوری بوو، سەرلقێکی بەناوبانگی پارتی بوو، لە تەمەنی ٢٠ساڵیدا لەگەڵ باوکیدا دەبێتە پێشمەرگە و بەشداری جوامێرانەی لە چەندین شەڕدا کردووە لەوانەش شەڕی گەلیی زاوێتە. ئەم ژنە بەشێوەیەکی گوماناوی لە بۆسەیەکدا لە گوندی قەلاقومری لە شەوی ٢٦-١- ١٩٦٩ دەکوژرێت. دوای کوشتن و دیار نەمانی حەسۆ میر خان و عیسی سوار لە بارزانی دەپرسن مارگرێت بۆ دیار نیە؟ بارزانیش لەوەلامدا بە دەمی خۆی دەڵێت : مارگرێت قەحپە بوو لەبەر ئەوە کوشتمان. بەگوێرەی هەندێک زانیاری بارزانی خۆی پەیوەندی سێکسی لەگەڵ مارگرێتدا هەبووە و دوای ئەوەی حەمایلی هاوژینی پێی دەزانێت بۆ شاردنەوەی ئابڕوچوونەکە مارگرێت دەکوژن. – وەرگێڕی کوردی –

ترسناکەکانی ئەوەی بە شۆڕشی کوردی ناوی دەبرا دەستبەسەربووم، زۆرم لەبارەیانەوە دەبیست. ئەو شۆڕشە سەرکردەکانی تاقمێک شەڕانگێز بوون کە پارتی دیموکراتیان بەڕێوە دەبرد.

کاتێک سەرکردایەتی بنەو بارەگای خۆی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگواستەوە، یان لە ناوچەیەکەوە دەچوونە ناوچەیەکی تر، فەرمانیان دەردەکرد بۆ خەڵکی ئەو ناوچانەو گوندەکانی دەوروبەریان و بەزۆرداری بە خاوخێزانەوە دەریان دەکردن.

ڕۆژێکیان چاوم بە خاوەن خێزانێک کەوت، کە کۆنە دۆستی خۆم بوو، متمانەی زۆری بە من هەبوو، لێمپرسی: بۆچی لێرە ماڵت بار دەکەیت لە کاتێکدا تۆ لەسەرموڵک و ماڵی خۆتیت؟ بە غەمبارییەوە پێی وتم: کاک جەمیل ئەو موڵک و زەویانە هەمووی بەناوی خۆمانەوەیە، بەڵام لە ڕاستیدا بەهۆی ئەم سەرکردە زاڵم و ستەمکارانەوە، زەوییەکان هی خۆمان نین و مافی هیچ جۆرە هەڵسوکەوتێکمان نیە. بڕوا بکە ئەگەر ماڵەکانمان نەگوێزینەوەو لەگەڵیاندا بار نەکەین لە حاجی ئۆمەرانەوە بۆدیلمان، وەکو خۆیان دەیانەوێت، لە هەموو زستان و هاوینێکدا ئەگەر ئەوە نەکەین و ملکەچیان نەبین، ئەوە بە خائن و دوژمن ناومان دەبەن و دواتریش تۆمەتی بەکرێگیراوی حکومەتی عێراقیمان بۆ هەڵدەبەستن و بەجاش ناومان دەبەن و تورمان دەدەنە نێو تونی

بابای زیندانەکانی خۆیان و ژن و منداڵەکانمان دەکەونە سەرجادە و لەژێر رەحمەتی جەلادەکاندا دەبن لە پاسەوانە بێرەوشت و بێویژدانەکانیان و کەس خەمیان ناخوات. لەبەر ئەوە وەک هاوڕێکەم گوتی هەموو خێزانەکانی ئەم ناوچەیەو هەر شوێنێکی تری ژێر دەسەڵاتی ئەمانە ناچارن ماڵەکانیان بگوازنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە سەرکردایەتی داوای دەکات، جا ئیتر وەرزی هاوین بێت یان زستان. سەرباری هەموو ئەو چەرمەسەریانەش پارەی ئەوەمان نیە کەلوپەلەکانمان بە ئۆتۆمبیل بگوێزینەوە، بۆیە ناچار دەبین لەسەر پشتی گوێدرێژ یاخود هێستریان بەپێ بڕۆین و بگوێزینەوە. جا ئیتر کاک جەمیل بزانە چۆن گیرمان خواردووە بەدەست ئەم زاڵمانەوە، بەڵام خودا لە هەموو شت گەورەترە رۆژێک دێت گەلی کوردمان لەم ستەم و کۆیلایەتییە رزگار دەبێت.

### بارەگای بارزانی لە قەسرێ

رۆژێکیان لە شوێنی دەستبەسەرکردنم هەستم بە پەشێوی دەکرد، کەش و هەوا نالەبار بوو، ویستم بچمە دەرەوە کەمێک هەوای باڵی خۆم بدەم. لەگەڵ ئەو پاسەوانەی کە ئیش و کاری ئەوە بوو بەدوای منەوە بێت، بەر لەوەی بگەمە سەر جادەکە بینیم شەڕە لە نێوان پاسەوانەکانی ئیدریس و کەسێکی دیکەدا کە نەمدەناسی، بەڵام خەڵکی گوندەکە بوو. لەو کاتەدا کەژاوەی

ئۆتۆمبیلەکانی ئیدریس و مەسعود بەرەو (کۆشکی ئاشتی) بەڕێوە بوون بۆ دیدەنی هەندێک لە پەیامنێرانی رۆژنامە بێگانەکان. لە کاتی تێپەڕبوونی ئەواندا دوو پاسەوانی ئیدریسم بینی کەسێکی بەتەمەنیان پاڵپێوەنا و فڕەیان دایە سەر جادەکە، جلەکانی بەهۆی بارانەوە هەمووی تەڕ بوون، بەناو قوڕاوەکە رایاندەکێشا، پاسەوانێکی تریش لولەی تفەنگی کلاشنکۆفەکەی ئاراستەی کوڕی ئەو پیاوە داماوەکردبوو، کە ویستبووی باوکی لەژێر قاچەکانی ئەواندا دەربێنێت. بە توندی و بە شەق و پێلاقە لەو پیاوەیان دەدا، دڵم ئاوی دەکرد لە تاو ئەو دیمەنە بەربەریانەیە، هۆکاری ئەو شەڕەم لە پاسەوانەکە پرسی، لە وەڵامدا گوتی: کاک جەمیل پرسیاری هۆکار مەکە؛ لێرە نە یاسا هەیە نە دادپەروەری. ئەم پیاوە پیرە، کچێکی خۆی مارە بڕیوە لە کوڕە مامی، بەڵام یەکێک لە پاسەوانەکانی ئیدریس داوای لەو پیاوە کردووە مارەبڕینەکە هەڵوەشێنێتەوە، باوکی کچەش ئەو داوایەی رەتکردۆتەوە، بۆیە ئەوانیش دەیانەوێت کوڕو باوکەکە لەسەر ئەوە بکوژن، هیچ کەس لە ئێمە بوێری ئەوەی تێدا نیە بەرگری لە هەقی خۆی بکات، چونکە چارەنوسی زیندان دەبێت.

دوای کەمێک ژمارەیەک پاسەوان هاتنە دەرەوە و پیاوە پیرەکەو کوڕەکەیان دەستگیر کرد، کوڕەکە پێشمەرگە بوو، بەڵام چەکیانکرد و تفەنگەکەیان لێسەند و لەگەڵ باوکیدا لە ژوورێکی زیندان توندیان کردن و لەملاشەوە بە تەلەفۆن پەیوەندییان کرد

بە مەسعود بارزانی لە کۆشکی ئاشتی، گوایا ئەو پیاوە پیرەو کورەکەی تفەنگیان لە پاسەوانەکان راکێشاوەو هەوڵیانداوە یەکێک لە ئێشکگرانی بارەگا بکوژن. ئەم زمانلێدانە درۆینەیە وەک ئەو پەندە وایە کە دەڵێت (لێیدام و دەستی بەگریان کرد، پێشم کەوت و سکالای کرد - ضربني و بكى، سبقني و اشتكى).
مەسعودیش کاتێ ئەمەی بیست فەرمانیدا لە زیندانی خەلان دەستگیریان بکەن. دوای تێپەربوونی سێ رۆژ بەسەر دەستگیرکردنیان، ژنەکان هاتنە سەر شەقامە گشتیەکە و دەستیان بە هاوارو قیژە قیژ کرد و بەدەنگی بەرز دەیانگوت کوا هەق کوا دادپەروەری ئەمە زوڵمە، لەسەر شەقامە گشتییەکە وەستابوون چاوەڕوانی هاتنی کەژاوەی ئۆتۆمبیلەکانی مەسعود بوون، کە ئەمە کەوتە گوێی بارزانی ئیتر فەرمانیدا ئازادیان بکەن.
گەلی کوردی تێکۆشەر بەمجۆرە لەژێر باری تیرۆرو ستەم و زوڵمی شۆڕشی کوردیدا دەژیا. بەچاوی خۆم سەدان تێکۆشەری ئازادیخوازم دەبینی، کە هۆتێل و چایخانەکانیان پڕکردبوو، هەموویان لەژێرچاودێری و مانەوەی زۆرەملێدا بوون، ئەمە جگە لەوانەی کە ناو کونجی زیندانە ترسناکەکانی وەک زیندانی رایات ئاخنرابوون، کە بە زیندانی مەرگ ناوی دەرکردبوو، هەموو هەفتەیەک زیاتر لە سێ کەسایەتی ئاست بەرز دەکوژران، تەنها لەبەر ئەوەی لەگەڵ سیاسەتەکانی ئەواندا نەبوون و دژی بوون.

جگە لە رایات زیندانی خەلان و باخوسی و چەندانی تریش هەبوون[٦] لەسەر سنوری نێوان عێراق و ئێران بوون لە نزیک زێی گەورە. لاشەی کوژراوەکانیان فڕە دەدایە ناو روبارەکە. وایلێهاتبوو، لە زۆری ئەو لاشانەی رووبارەکە لوشی دابوون ناوی ترابوو (روباری جومجومەکان)، لەوانەش هەمووی نامۆتر ئەوەبوو پرسیارت لە هەر کەسێک لەو دەستگیرکراوانە بکردایە لەسەر چی گیراویت؟ سوێندی بە خودا دەخواردو دەیگوت نازانم، هێندەم ئاگا لێیە فەرمانێک بۆ دەستگیرکردنم دەرچووە و بانگ کراوم بۆ بارەگای بارزانی و بەبێ ئەوەی هیچ هۆکارێک بزانین فەرمانمان پێکراوە کە بمێنینەوەو خراوینەتە ژێر دەستبەسەرکردنی زۆرەملێ لە یەکێک لە هۆتێلەکان و لەژێر چاودێری توندا، بەبێ ئەوەی کەسێک هەبێت و ئەو تاوان و

---

[٦] سەرکردایەتی شۆڕشی چەواشەو دژە کوردی بارزانی لەو ماوە کەمەدا بۆ خزمەتکردنی پەیمانی سەنتۆ زۆر بە توندی قەتل و عامی چەپ و مارکسی و نیشتمان پەروەرانیان دەکرد. زیندانی کانی ماسی یەکێکی ترە لەو دەیان زیندانەی کە تەنها خەلکی تێکۆشەر و ولاتپەروەری تیدا زیندان دەکران. نوسەرو روناکبیر فواد مەجید مسری یەکێک بووە لەوانەی کە لە زیندانی کانی ماسی دەستبەسەر بووە. (ئەو شەوە فواد لە پەنجەرەی ژووری زیندانەکەی خۆیەوە دیمەنێک دەبینێت کە بۆ هەتا هەتایە دەبێتە بەلگە بەسەر دەستی رەشی تیرۆری کانی ماسییەوە. فواد دەڵێت: لە پەنجەرەی زیندانەکەمەوە چاوم لێبوو بەدەم ئەشکەنجەدان و سوکایەتی پێکردنەوە ئەورەحمانی سالەحی خلەیان بە دەست و پێ بەستراوی هێنایە ناوەڕاستی حەوشەکەو دەبەیەک نەوتیان کرد بەسەریاو شقارتەیان پێوە ناو سوتاندیان. ئەورەحمان بەدەم قیژەو هاوارەوە دامرکایەوەو بوو بە کۆی خەڵوز). بڕوانە چۆن بووم بە پرد، بیرەوەریەکانی حەمەئەمین پێنجوینی، چاپی یەکەم، ٢٠٢١ لاپەڕە١٣٩. – وەرگێڕی کوردی- .

گوناهەمـان بـۆ بـاس بکـات کە کردومـانە، بـۆیە ناشـتوانین نـامە بنوسین چونکە ماڵی بارزانی حەزیان لەوە نیە.

بەشـێکی بەرچـاو لە جەنگـاوەرانی نـاو پێشـمەرگە کوردەکـانی ئێران و تورکیـا و سـوریا بـوون. لەکـاتی مـانەوەم لەوێ زۆریـانم دەبینـی و بە شـێوازی تـایبەتی خـۆم بە نهێنـی قسـەم لەگەڵـدا دەکـردن. توانـایەکی زۆر باشـم هەبـوو بـۆ ئەوەی بیـانخەمە قسەکردن و بیاندوێنم، چونکە دەترسـان راشکاوانە قسـان بکەن لەبەر بـوونی ژمـارەیەکی زۆری ئـاژان و سـیخوڕ کە چـاودێری دەکـردن. دەترسـان بکـوژرێن یـان بخـرێنە کـونجی زینـدان، لەبەر ئەوەی سـەرانی شـۆڕش هـیچ سـۆزو بەزەییەکیـان لە دڵـدا نەبـوو. کاتێـک لەگەڵیانـدا دەدوام و بـاری سـەرنجی خـۆم دەخسـتەڕوو پێمـدەگوتن کە مـن هاوسـۆزیانم و لەگەڵ داواکاریەکانیانـدام و لەگەڵ ئەو سـەرکردانەدا نـیم و کـار بـۆ ئەو سـەرکردە گومڕایـانە نـاکەم کە لە رێگـای بەرزی بەهـاو نەریتـی مرۆڤـایەتی و ئەو ئامـانجە بەنرخـانە لایانـداوە کە هەمووومـان کـار بـۆ بەدەسـتهێنانی دەکەیـن، باوەڕیـان بە راسـتی و دروسـتی قسـەکانم و هەسـتی راسـتەقینەی نیشـتمانپەروەریم کـرد. ئیـدی پەیتـا پەیتـا یەکترمـان دەبینـی و رۆژانە بە نهێنـی کۆدەبـووینەوەو رازی دڵـی خۆمـان دەکردەوە. کـوردانی تورکیـا و ئێران و سـوریا و عێـراق بـووین. زۆر بە ئـارامی گوهـداریم دەکـردن و هەر کەسـێک لەوانـیش دیدگای خۆی باس دەکرد و بۆم ئاشکرا بوو ئەوەی دەیبستن و

دەبیینن تەواو جیاوازە، هەرچەندە سەرکردەکان لە بلاڤۆک و پەیڕەوی ناوخۆی حزب و لێدوانەکانی خۆیاندا بانگەشەی ئازادکردنی کوردستانیان دەکرد، بەلام لە ڕاستیدا وتەو بلاوکراوەکان و لێدوانەکان هیچ باندۆرێکیان لەناو شۆڕشدا نەبوو، چونکە خۆیان باوەڕەیان بەو دروشمە کوردستانییە ڕاستەقینەیە نەبوو کە جیاوازی لە نێوان هیچ کوردێکدا نەدەکرد جا ئایا خەلکی ئێران یان تورکیا یان عێراق یان هەر بەشێکی کوردستانی مەزن بوایە، جیاکاری بە ئاشکرا دیار بوو. بەلام لە کاتی شەڕدا ئەوانیان لە ریزەکانی پێشەوە دادەنا، لە بەرەکانی شەڕدا دەیانکردنە قوربانی، سەرانی ئەوەی کە پێیان دەگوت (شۆڕشی کوردی) و داروودەستەکانیان لە کوردەکانی عێراق خۆیان لەو ناوچەو شوێنانە دەمانەوە کە ئارام و سەقامگیربوو لە نزیک سنوورەکانی عێراق و ئێران، دوور لە بەرەکانی شەڕ، بە ئۆتۆمبیلە سەربازییەکانیان لە نێوان ناوپردان و حاجی ئۆمەران جرتوفرتیان بوو، لە نوسینگەکانی خۆیاندا داروودەستەو خزمەکانی خۆیان کردبووە پاسەوان بۆ پاراستنیان، ئەوانە هەموو باندو بەکرێگیراوی سەنتۆ و دۆلار و تمەنی ئێرانی بوون. ڕۆژانە بۆ سەیرو سەفای خۆیان دەچوون بۆ ئێران و کەلوپەلی زۆریان بۆ خۆیان دەکڕی، لە کاتێکدا پێشمەرگەی داماویش بۆی نەبوو هاتوچۆ بکات، تفەنگێکی لە شان بوو هەتا مردن.

زۆرێــــک لە رۆڵە قارەمانەکـــانی گەلەکەمـــان ئەوانەی لە گۆرەپانەکانی شەڕدا شەهید دەبوون و بە خوێنی گەشی خۆیان خاکی کوردستانیان ئاو دەدا، لە کوردەکانی ئێران و تورکیا و سوریا بوون، لە کاتێکدا سەرانی شۆڕش لە دەوروبەری خۆیان سەدەها کەسیان بە جۆرەها چەکی نوێ تەنها بۆ پاراستنی گیانی خۆیان پڕچەک کردبوو. ئەگەر کەسێکیش لە داروەدەستەی یەکێک لەو سەرانە کوژرابێت، ئەوە لە گۆڕەپانی شەڕدا نەکوژراوە، بەڵکو دەرەنجامی بۆردمانی توندی ناوچەکانی چۆمان و ناوپردان و حاجی ئۆمەران و ناوچەکانی تری وەک گەڵاڵە دەکوژران، زۆرێک لەوانەی لە گۆڕەپانی شەڕدا شەهید دەبوون کوردی عێراق نەبوون.

## پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبە کوردییەکانی دەرەوەی وڵات

پارتی دیموکراتی کوردستان خۆی بە پارتێکی سەرکردەو پیشڕەوی هەموو رێکخراوەکان و پارتە کوردییەکانی تر دەزانێت، جا لە عێراق بێت یان لە هەرشوێنێکی تری کوردستان. پلانی سەرکردەکانی پارتی بریتی بوو لە کۆنترۆڵکردنی تەواوەتی هەموو جیهانی کوردی و سەپاندنی هەژموونی خۆیان بوو بەسەریاندا. دروشمی بریقەداریان بەرز دەکردەوە بۆ ئەوەی گەلی کوردمان لە خشتە بەرن گوایا تەنها پارتی دەیانپارێزێت و

نوێنەرایەتیان دەکات. بەم نەخشە جەهەنەمییەش، سەرکردەکانیان دەتوانن وەبەرهێنان لە حزبەکەیاندا بکەن بۆ بەرژەوەندی شەخسی خۆیان، کە بەتەواوی دوور بوو لە خواست و ئاواتەکانی گەلی کورد. لە ئەنجامی لادانیان لە ئامانجە راستەقینەکانی شۆڕش و ئەوەی گەلی کورد دەیخوازێت، دەستیان کرد بە لەناو بردن و خەنجەرلێدانی نامەردانە لە تێکۆشەرانی پارت و گەل. لێرەدا وێنەیەکی روون و ئاشکرای پاشا گەردانی و پەرتەوازەبوونی پارتی دیموکراتی کوردستانتان بۆ دەخەمەڕوو.

تەنها یەک حزبی کوردستانی هەبوو، بەهۆی گومڕایی و لادانی سەرکردە ستەمکارەکانەوە ئەم حزبە بوو بە چەند بەشێکەوەو ململانێی خوێناویی بەهۆی خیانەت و غەدرەوە هاتە گۆڕێ، سالی ١٩٦٤ ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تالەبانی و لایەنگرەکانیان، لە بارزانی جیا بوونەوە. کاتێک ئاژاوەو پاشا گەردانی بالی کێشا بەسەر باروودۆخەکەدا، کۆمەلە کەسێک بەناوی شۆڕشەوە دەسەلاتی خۆیان بەکار دەهێنا بۆ ئاژاوە نانەوەو دروستکردنی دووبەرەکی و جیابوونەوە لەنێو پارتە کوردستانییەکانی دەرەوە، لە ئەوروپا و هەر ولاتێکی دیکە کە کوردی تێدا بوایە. کاتێک لەم سیاسەتەدا شکستیانخوارد و نەیانتوانی ئامانجەکانی خۆیان بەدەست بخەن دەستیان کرد بە

کوشتن و بڕین و فایەق حسێن[7] تێکۆشەری کوردی ئێرانییان شەهیدکردو دەستیان کرد بە گرتنی هەر تێکۆشەرێکی کوردی ئێرانی بە پاساوی ئەوەی کەئەوانە دژایەتی شای ئێران دەکەن و سەربە حزبی شیوعین[8]، بۆیە رادەستی ئاغاکانیان دەکردنەوە لە ئێران و لەوێش لە دادگاییەکی رواڵەتکارانەدا، بەبێ ئەوەی رێگای بەرگریکردن لە خۆیان پێبدرێت، بەتاوانی تێکدان و جاسوسیکردن،حوکمی ئیعدام دەدران. کاتێک شکستیان خواردو نەیانتوانی دەست بەسەر حزبدا بگرن لە کوردستانی ئێران،

---

[7] شەهید سلێمانی موعینی (فایەق ئەمین موعینی)، نەک فایەق حسێن، سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران نەبوو، بەڵکو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو. تەنها لە نێوان ساڵی ١٩٦٧-١٩٦٨ مەلا مستەفا دەیان پێشمەرگەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی تیرۆرکرد، یاخود بە زیندوویی تەسلیمی رژێمی پادشایەتی دەکردنەوە. ئەمە ئەو خاڵەیە کە نوسەر لەم کتێبەدا بە سیخوڕەکانی سەنتۆ ناویان دەبات. ئێران بۆ ئەم مەبەستە لەو ماوەیەدا ئەفسەرێکی ساواکی روکنی دوو سەرهەنگ مدرسی ناردبوو بۆ لای بارزانی و جگە لە ئاڵوگۆڕی زانیاری پێکەوە لەگەڵ ئیدریس ومەسعود پیلانی کوشتن و رفاندنی کوردەکانی ئێرانیان دادەنا. لەو ماوەیەدا جگە لە سلێمانی موعینی خەلیل شەوباش (کە هەر برای سلێمان بوو) ئیسماعیلی شەریفزادە، عەبدوڵای موعینی، مەلا ئاوارە، مەلا رەحیمی وەرتێ، ساڵەح لاجانی و هاوڕێکانی، موراد شیدیزو دەیان پێشمەرگەی تر تیرۆر کران. وەرگێڕی کوردی.

[8] نوسەر لێرەدا مەبەستی تیرۆر کردنی ئەندامانی حزبی شیوعی عێراقە. لە هەمان ماوەدا بارزانی کەوتبووە قەتلوعامی ئەندامانی حزبی شیوعی عێراق و ژمارەیەکی یەکجار زۆری لەوان کوشت. محەمەد ئەمین پێنجونی لەو بارەوە دەڵێت (لە ماوەی هەفتەیەکدا بیستوپێنج کادری شیوعی لە شارێکی بچوکی وەکو سلێماندا کوژران)- بڕوانە چۆن بووم بە پرد، بیرەوەریەکانی محەمەد ئەمین پێنجونی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٤٠-وەرگێڕی کوردی-

دەستیان کرد بە پیلانگێڕان لە دژی سەرکردایەتی حزب لە بەشەکەی تورکیا. لێرەوە هەستان بە پشتیوانیکردنی باڵی چەپی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا بە سەرکردایەتی دکتۆر شڤان[9] کە لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێکانی پەیوەندی بەشۆڕشەوە کردبوو، لەلایەن مەکتەبی سیاسی بارزانیەوە بە فێڵ پشتوانی دەکرا. دواتر داوایان لە سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا بە سەرکردایەتی سەعید ئاڵچی کرد کە بەپەلە بێن بۆ لای بارزانی بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانی حزب. پێش ئەوەی بگەنە ناوچەکانی شۆڕش پیلانێک بۆ کوشتنی ئەوان لە لایەن دکتۆر شڤانەوە ، لە بارەگای بارزانیەوە دانرابوو. بەگوێرەی پیلانەکە دکتۆر شڤان لە بارەگای نوێنەرانی پارتی لە زاخۆ لەگەڵ ئەسعەد خۆشەوی چاوەڕوانی سەعید ئاڵچی و هاوڕێکانی دەکەن، کاتێک دەگەنە بارەگای ئەسعەد خۆشەوی دکتۆر شڤان داوای دەستگیرکردنیان دەکات و دواتر بەبێ هیچ دادگایی کردنێک هەموویان گولە باران دەکەن و دەیانکوژن[10].
دکتۆر شڤان کە هەتا ئەو کات نەیزانیبوو چ جۆرە پیلانێک لە

---

[9]دکتۆر شڤان ناوی راستەقینەی خۆی ( سەعید قرمزی تۆپراغ)-بوو. کوردەکانی تورکیا هەتا ئەمڕۆش بەم خیانەتە دەڵێن شەهید کردنی دوو سەعیدەکە، یاخود کەیسی دوو سەعیدەکە. - وەرگێڕی کوردی-

[10]بەپێی هەندێک سەرچاوە، دوای دەستگیرکردنیان هەموویان دەبەنە ئەشکەوتی پاقێ و لەوێ دوای گولەباران کردنیان هەموویان دەخەنە نێو یەکێک لە چاڵە گەورەکانی ناو ئەشکەوتەکە – وەرگێڕ -

ئارادایە لەو باوەڕەدا بوو کە بەرامبەر ئەو کارەی پاداشتی دەکەن و ئەو خۆی دەبێتە سکرتێری گشتی حزبەکە و بەهرەمەند دەبێت لە پشتوانی سەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان، بەڵام ئەفسوس هەموو هیواو ئاواتەکانی هەرەسیان هێنا. دکتۆر شڤان بانگ کرا بۆ بارەگای بارزانی لە حاجی ئۆمەران، لەوێ خۆی و هاوڕێکانی دەستگیرکران و تورِ درانە نێو زیندانی رایات. پاش مانەوەی بۆ ماوەیەک لە زیندان، خۆیی و هاوڕێکانی بە تۆمەتی کوشتنی سەعید ئاڵچی گولە باران کران، ئەمەش بۆ شاردنەوەی ئەو سەرە گەورانەی کە دەستیان هەبوو لە پەرتەوازەکردنی کوردەکانی تورکیا و بۆ شاردنەوەی راستی و ئەو کەسانەی کە هەستان بە کوشتنی سەعید ئاڵچی و سەرکردەکانی تری کوردی تورکیا[11].

لێرەدا بۆ وەبیرهێناوە، کاتێک دکتۆر شڤانیان هێنا بۆ بارەگای بارزانی لە حاجی ئۆمەران، من نەمدەناسی، ویستیان لە ژوورەکەی مندا ئەویش دەستبەسەر بکەن. ئەو شەوە لە ژوورەکەی مندا زیندان بوو. کاتێک ئەو کە زانی من جەمیل مەحۆم ئیتر حەزی کرد قسەم لەگەڵدا بکات و گوتی: ئەی جەمیلی برام بەس رزگارم بێ لەم نەهامەتیەی کە ئێستا تێی کەوتووم ئیشاڵا دێم بۆ لوبنان سەردانت دەکەم و پێکەوە هاوکار دەبین.

---

[11] لە راستیدا لە هەمان ئەو ماوەیەدا سەرانی شۆڕشی چەواشەی دژە کورد، لەگەل دەزگای میتی تورکیا لەدژی کوردستانی تورکیا هاوکاربوون. ئەم کارەشیان بە فەرمان و چاوساغی تورکیا و بۆ میتی تورکي ئەنجامداوە. – وەرگێری کوردی–

له چوارچێـوەی هەمــان سیاســەتدا، ســەرکردایەتی پــارتی دیمـوکراتی کوردسـتان، دەسـتی لە کاروبـاری نـاوخۆی حزبـی لە ســوریاش وەردەدا، ئەو حــزبەی ســوریا یەک حــزب بــوو کە شەرعیەتی خۆی هەبوو[١٢]، ڕێگایان نەدەدا ئەو کارە سـەربگرێت، بـۆیە دەسـتیانکرد بە دروسـتکردنی هەنـدێ بـاڵ و کـوتلە لەنـاو خودی حزبەکەداو بە ئاشکرا لایەنگری و پشتیوانی چەند کەسێکی کۆنەپەرسـتیان دەکـرد لەنـاو هۆزەکانـدا لە دژی ئەو تێکۆشـەرە ڕاسـتەقینانەی کە حزبەکەیـان دروسـت کردبـوو. بەداخەوە ئەم نەخشە تێکدەرانەیە لەگەڵ ئەوانیشـدا سـەریگرت و ئینجا ناردیـان بەشـوێن هەمــوو لایەنە ناکۆکەکـانی نــاو حـزبەکە بــۆ ئەوەی دووبەرەکـی و کێشـەکانیان بـۆ چارەسـەر بـکەن. سـەرکردایەتی حزب لە سـوریا بەهـۆی لاوازی هۆشـیاری سیاسـی خۆیـان بەو پیلانەیان نەدەزانی، هەروەها لەبەر قوڵبوونەوەی نـاکۆکییە حزبـی و سیاسـییەکانیان بەدەم ئەو فەرمـان و داوایـانەوە دەچـوون کە سـەرکردایەتی بـارزانی بـۆی دەنـاردن و دەچـوون بـۆ ناوچەکـانی ژێــر دەســەڵاتی شــۆڕش، بەڵام لە جیـاتی ئەوەی کێشــەکانیان

---

[١٢] پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا، یەکەم حزبی کوردی بووە لە سـوریا دامەزراوە، ئەوکاتە حەمید دەرویش و ئۆسمان سەبری – عوسمان سەبری- و هەمزە نویران ئەم حزبەیـان بەنـاوی پـارتی کـوردانی دیمـوکرات (حـزب الـدیموقراطیین الاکـراد) دامەزراند. بەڵام سـاڵی ١٩٦٢ بەهـۆی کنەکردنـی بـارزانی و مەکتەبی سیاسـی پـارتی ئەم حزبە بوو بە دوو کەرتەوەو دواتریش کەرتێکی تریشیان لێجیا بۆوە– وەرگێڕی کوردی–

چارەسەر بکەن و سەرکردایەتییەکی دانا پێکبێنن کە بتوانێت جڵەوی کارەکان لە دەستی خۆیدا بگرێت و بزووتنەوەی کورد لە سوریا بەرەو ئامانجە نەتەوایەتییەکانی خۆی بڕوات بە گرتنەبەری ڕێکاری دروست لە پێناو خزمەتکردنی بەرژەوەندی باڵای گەلی کوردمان لە وڵاتی سوریای برامان. لەجیاتی هەموو ئەوانە ئەو باڵەیان دەستگیر دەکرد کە دژ بە سیاسەتە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی خۆیان بوو، لەوانەش حەمید دەرویش، ڕەشید حەمو و جگەرخوین و هەندێ لە لایەنگرەکانیان، هەروەها دانانی محەمەد نایۆ و سەلاح بەدرەدین لە باڵی چەپی مارکسی و شیوعی لە ژێر مانەوەی زۆرەملێدا لە حاجی ئۆمەران و دەربەندی. دوای ئەوەی پیلانەکەیان سەری گرت ئیتر خۆیان بە تەسکییەی خۆیان کەوتنە پێکهێنانی سەرکردایەتی نوێی پارتی دیموکراتی کوردی سوریا، لەو کەسانەی کە خۆیان دەیانویستن بەسەرۆکایەتی دەهام میرۆ[13]، کە پیاوێکی ساویلکەی عەشایر بوو

[13]دەهام میرۆ ساڵی ١٩٢٣ لە دیریکی سوریا لەدایک بووە. ساڵی ١٩٧٠ لە کۆنگرەی ناوپردان مەلا مستەفا کردی بە سکرتێری کاتیی پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا ناسراو بە البارتی. ساڵی ١٩٧٣-١٩٨١ زیندانی کرا لەسوریا و دوای ئازاد کردنی وازی لە کاری سیاسی هێنا. ساڵی ٢٠١١ کۆچی دوایی کرد. من لەو باوەڕەدام دەستنیشانکردنی کەسێکی لەو جۆرە بۆ بەڕێوەبردنی پارتەکە لەبەر ئەوە بووە کە بەئارەزووی خۆیان هەڵیسوڕێنن و پارتەکە بخەنە خزمەت مۆساد، هەر لەو ماوەیەشدا، حکومەتی سوریا تۆڕێکی جاسوسی ئەوانەی دەستگیرکردبوو، کە زانیاری سەربازییان لەسەر سوپاسی سوریا لە ناوچەی جۆلان کۆکردبووە.– وەرگێڕی کوردی –

هیچ شتێکی لە سیاسەت نەدەزانی و چەندین جار خۆی بەمنی دەگوت کە ناخوازێت سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردی سوریا بکات، بەڵام بارزانی ئەوی دانابوو بە سەرۆکی پارتەکە لە سوریا لەسەر داوای سەرکردە عەشایرەکانی ناو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، ئەوانەی تر کە نوێنەری باڵ و کوتلەکانی تر بوون هەموویان یان بە زیندانی یان بە دەستبەسەری لە ژێر مانەوەی زۆرەملێدا دانرابوون.

حەبیب محەمەد کەریم بە رێکەوتن لەگەڵ سامی عەبدول رەحمان و دارا تۆفیق، دەستی هاوکاری بۆ سەلاح بەدرەدین درێژکرد و پاسپۆرتێکی ساختەیان بۆ پەیداکرد و داوایان لێکرد کە بڕوات بۆ ئەوروپا، لەبەر ئەوەی حەبیب محەمەد کەریم و دارا تۆفیق و سامی عەبدول رەحمان لە سیاسەتی دەرەوەی حزبدا مارکسی بوون و لە سیاسەتی ناوخۆی حزبیشدا مەلایی بوون. لەسەرەتادا محەمەد نایۆ و سەلاح بەدرەدینیان دەستبەسەر کردبوو، ناچاریان کردبوون لەژێر مانەوەی زۆرەملێدا بمێننەوە، لەبەر ئەوەی دژی دەهام میرۆ بوون، لەهەمان کاتدا، موچەیەکی ٦٠ دینار مانگانەیان بۆ هەریەک لەوان بڕیبۆوە، بەو مەرجەی ببن بە سیخوڕی دەزگای هەواڵگری مەسعود بارزانی و بتوانن لە رێگای دواندن و قسەلێدەرهێنان هەموو ئەو کەسانەی کە کوردی سوریان و دێنە ناو شۆڕش، ئەمان بتوانن بیروباوەڕو بۆچوونیان بزانن، بەم شێوازە جەهەنەمیەش مەسعود ئەتوانی

یەکە یەکەی ئەو کەسانە بناسێت و بزانێت بۆچوونیان لەسەر ئەوان چۆنە.

سەلاح بەدرەدین تەواو ئازادو دەستکراوە بوو، دەیتوانی بۆ هەرکوێ بیەوێت لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش هاتوچۆ بکات و ئەو ئەرکانە جێبەجێ بکات کە داوایان لێکردووە. هەمیشە لەگەڵ جەلال تالەبانی و لایەنگرەکانیان کۆدەبۆوە و زانیاری لەسەر ئەوان کۆدەکردەوە و هەمیشە بە ئارەزووی خۆشی دەیتوانی سەردانی بارەگای ئیدریس بارزانی بکات و راپۆرتەکانی خۆی تەسلیم بەوان بکات و موچەکەی خۆی وەربگرێت. ئەوەندە فێڵزان بوو بە منی دەگوت ناتوانم زۆر لات دانیشم ئەترسم قسەم لێوەربگرێت و لای خۆت تۆماری کەیت. بەڵام حەمید دەروێش و رەشید حەمۆو جگەرخوێن، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە عێراق دەستبەسەرکرابوون هەر یەکەیان بە کارێکی تایبەت ئەرکدارکران[14].

[14] لە راستیدا سەرکردایەتی دژە کورد و دژە شۆڕشی بارزانی سەرەنجام توانیان ئەو حزبەی رۆژئاوای کوردستان بکەن بە سێ کەرتەوە، لە مانگی گەلاوێژی ١٩٧٠ لە ناوپردان هەستان بە بەستنی کۆنگرەیەکی رواڵەتکاری و رێگایان نەدا تێکۆشەرانی راستەقینە بەشداری ئەو کۆنگرەیە بکەن. ئەم کەرت بوون وپەرتکردنەش هەتا ئەمڕۆ بەردەوامی هەیە. لە چوارچێوەی هەمان سیاسەتدا لەمڕۆدا لە پێناو خزمەتکردنی ئەجنداکانی تورکیاو لێدانی هێزەکانی پەیەدە، لە رۆژی ٢٦-١٠-٢٠١١ بە سەرپەرشتی تورکیا هەستان بە دروستکردنی بەرەیەکی دژە شۆڕش بەناوی ئەنەکەسە (ئەنجومەنی نیشتیمانی کورد لە سوریا)، دواتر هێزی پێشمەرگەی رۆژیان کردە میلیشیای کۆنترا و لە شەڕەکانی داگیرکردنی عفرین لە لایەن تورکیا و تیرۆرستانی

ڕۆژێکیان داوایان لە بارزانی کردبوو کە ماوەیان بدات بگەڕێنەوە بۆ سوریا بۆ ئەوەی چاویان بە ماڵ و منداڵ و کەسوکاریان بکەوێت، چونکە ماوەیەکی زۆرە لێوەیان دوورن. بارزانی ماوەی پێدان کە بڕۆن بەو مەرجەی بگەڕێنەوە، پارەشی پێدابوون. دوای ئەوەی گەشتنەوە سوریا و هەناسەیەکی بەختەوەرییان هەڵمژی و دڵخۆش بوون بەوەی کە لەو کۆتە ئاسنینەی خرابووە گەردنیان رزگاریان بووە، یاخیبوون و ئامادە نەبوون ملکەچی فەرمانەکانی شۆڕش بن دوای ئەوەی رووی راستەقینەی سەرکردە ساختەکان و رەفتاری ئەو تاقمە بەکرێگیراوەی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون لە عێراق و دەرەوەی عێراق.

ئەمە بەشێکی کەمی ئەو خیانەتانە بوو کە سەرکردەکان ئەنجامیان دەدا، کاتێکیش دەستبەتاڵ بوون لە پەرتەوازەکردنی هەموو بزووتنەوە پێشکەوتنخوازو دیموکراسیەکانی کوردستان و سەرکەوتنی پیلانەکانیان بەسەر کوردەکانی تورکیا و ئێران و سوریا، هەوڵیاندا چالاکی پیلانگێڕانی خۆیان بگوێزنەوە بۆ لوبنان. بە توندی بەرووویاندا وەستامەوە و بەهەموو هێزم ڕێگامگرت لەوەی پیلانە گڵاوەکانیان لە لوبنان جێبەجێ بکەن بۆیە چوار

---

ئیسلامی بەکاریان هێنان. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەوە بڕوانە: علی شمدین، الحركة الكردية في سوريا، وظاهرة الانشقاقات، الطبعة الاولى، ٢٠١٦ ، مطبعة طهران، ص ٨٠-٩٠، ١٨٦-٢٠٠ – وەرگێڕی کوردی –

سالْم له ناو زیندانه ترسناکەکانی ئەواندا بەسەر برد. لەناو زیندانه شێدارو تەنگەبەرەکەمدا جرج جەستەمی دەڕنی و خوێنمی دەخواردەوە، بۆیە بە ئەمانەت و دڵسۆزییەوە دەنوسمەوە و بەروون ئاشکرایی قسان بۆ هەموو رۆڵەکانی گەلی کوردی تێکۆشەرو هەموو هاوڕێ و دڵسۆزانم دەکەم کە لایەنگریم دەکەن له خەباتمدا. لە پێناوی هەموو ئەوانەدا وێنەیەکی راستەقینە دەکێشم لەبارەی ئەو دووبەرەکییەی لە نێوان من و سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە عێراق رویاندا. هەروەها وردەکاری هەموو ئەو چاوپێکەوتنانەم باس دەکەم کە لەگەڵیاندا کردومە و هەموو ئەو شتانەی کە بەدرێژایی چوارساڵ لەناو زیندان و دەرەوەی زیندانە ترسناکەکانیاندا بەسەرمدا هاتوون. بەبێ هیچ ترس و ڕاڕاییەک و بەبێ شێواندن و بەلاڕێدا بردنی راستیەکان وێنەیەکی زیندووتان لەو بارەوە نیشان دەدەم با گەلی کورد خۆی بڕیاردەر بێت.

### دروستکردن و پێکهێنانی حزب لە لوبنان

لەم بەشەدا باسی دروستبوون و پێکهێنانی حزبەکە دەکەم لە لوبنان. مانگی گەلاوێژی ساڵی ١٩٦٠ بوو، کاتێک بەشێوەیەکی نهێنی دەستمان بە چالاکی حزبیی کرد. ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٦١ شۆڕشی کورد لە عێراق بە دەستپێکێکی شۆڕشگێڕانەی نەتەوەیی هەڵگیرسا، یەکەم شت کە رای گشتی لوبنانمان

پێسەرسام کرد ئەوە بوو کە یەکەم بەیانی خۆمان بۆ لایەنگری شۆڕش دەرکرد. بە هەموو بڕواو نییەتێکی پاکی خۆمانەوە بەشێوەیەکی تەواو نهێنی دەستمان بە خەباتی درێژخایەن و سەختی نەتەوایەتی و سیاسی کرد، لەبەر ئەوەی لەو سەردەمەدا (نوسینگەی دووەم)[15] حوکمی ولاتی بە ئاگرو ئاسن دەکرد و بەشوێن خەباتگێڕانەوە بوو بەبێ جیاوازی کردن.

لە ناوەڕاستی سالی ١٩٦٢ یەکەم نوێنەری شۆڕشی کورد بەناوی ئەحمەد تۆفیق هات بۆ لوبنان و حەمید دەروێش[16]

---

[15] نوسینگەی دووەم یاخود (المكتب الثاني) یاخود (الشعبة الثانیه) بە مارەی دەسەلاتی رەهای دەزگای هەوالگری سەربازی لوبنان دەوترێت کە بەتەواوی دامەزراوەکانی دەسەلاتی بەڕێوە بردووە. ئەم دەسەلاتی سێبەرە کەوەکو دەسەلاتی دەولەتی قول بووە لە لوبنان لە نێوان سالانی ١٩٤٥-١٩٨٢ بەردەوام بووە. سالی ١٩٨٢ بەهۆی هاتنە ژوورەوەی ئیسرائیل بۆ ناو لوبنان وبەردەوام بوونی شەڕی ناوخۆ کۆتایی هاتووە. - وەرگێڕی کوردی -.

[16] حەمید دەرویش سالی ١٩٣٦ لە شاری حەسەکە لەدایک بووە، خوێندکاری کۆلێژی یاسا بوو بەلام لەبەر دۆخی سیاسی نەیتوانی تەواوی بکات. چەندین جار زیندانی کراوە. لە نێوان سالانی ١٩٩٠-١٩٩٤ وەک کەسایەتی سەربەخۆ بۆتە ئەندامی پەرلەمانی سوریا. سەرۆکایەتی وەفدی کوردی کردووە لە گفتوگۆکانی جنێف-٢ لە سالی ٢٠١٤. سیاسەتمەدارێکی زرنگ و میانڕەو بووە، چەند جارێک لە بنکەی سەربازي حمیمیم لەگەل روسەکان لە لازقیە داوای میانگیری ئەوانی کردووە لە نێوان کوردو حکومەتی سوریا. نازناوی تالەبانی سوریای هەبووە، ئەمەش بەهۆی زرنگ بوونی لە سیاسەت و نزیکبوونیشی لە جەلال تالەبانی. مانگی ئۆکتۆبەری ٢٠١٩ لە قامیشلۆ لە تەمەنی ٨٢ سالیدا کۆچی دوایی کردووە. دوای کەرت بوونی پارتی کوردانی سوریا لە سالی ١٩٦٢، پارتی دیموکراتی پێشکەوتن خوازی کورد لە سوریا (پێشڤەرۆ) دروست دەبێت و حەمید دەرویش لە سالی ١٩٦٦ بەدواوە هەتا مردني سەرۆکي ئەم پارتە بوو. ئەم پارتە خەبات دەکات بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی

سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردی سوریا لەگەڵیدا هاتبوو. بە نهێنی سەردانیان کردم بۆ ماڵەوە و خۆیان و پلەکانیان بەمن ناساند، منیش زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنم کردن و بەوجۆرەی بۆ هەر میوانێک پێویستە، پێشوازی و میوانداریم کردن. یەکەمجارم بوو لە ژیانمدا پێشوازی لە نوێنەرانی بارزانی بکەم. لەکاتی دیدارو گفتوگۆکانماندا ئەحمەد تۆفیق پێی گوتم کە ئەو هیچ کەسێک لە لوبنان ناناسێت و بەرپرسانی شۆڕش رایانسپاردووم کە پەیوەندی بە تۆوە بکەم. ئێمە زۆرمان لەسەر تۆ و خەباتی سیاسی و نەتەوەییت لە خزمەت مەسەلەی کورد بیستووە، بۆیە پێویستم بە هاوکاری تۆ هەیە بۆ ئەوەی هەندێ بەیان و بلاڤۆک بۆ لایەنگری شۆڕشی کورد لە دژی دەسەلاتی قاسم چاپ بکەین. منیش پێمگوت: چیت لەمن ئەوێت بۆت بکەم؟ گوتی ژوورێکی تایبەتم دەوێت بۆ خۆم، هەروەها دەبێت ئامێرێکی ستێنسل و تایپکردن بکڕین. پێمگوت پارەت پێیە بۆ کڕینی ئەو کەلوپەلانە؟ بە نەخێر وەلامی دامەوە. ئیتر من کارەکەم بە تەواوی لە ئەستۆی خۆم گرت. ژوورێکم بەکرێ بۆگرت و ئەو ئامێرانەشم بۆ کڕی کە داوای کردبوون و بەناوی حەمید دەروێش تۆمارم کردن. هەتا ئێستاش ئەو ئامێرانەم لای خۆم بۆ یادگاری و بۆ مێژوو پاراستووە.

---

گەلی کورد لە سوریا لە چوارچێوەی دەستورێکی عەلمانی کە مافەکانی گەلی کورد بسەلمێنێت. – وەرگێری کوردی–

هەر لەو ماوەیەدا لە ئەوروپاوە عسمەت شەریف وانلی لەسەر داوای نوێنەری شۆڕش گەیشتە بەیروت[١٧]. ئیتر هەموومان کۆبووینەوەو پێکەوە دەستمان کرد بە نوسین و چاپکردن و بڵاوکردنەوەی نوسراوی نهێنی بۆ پشتیوانی شۆڕشی کورد. هەر لەماڵی خۆمان دەستمان کرد بە نوسینی بەیاننامە و وتارو هەر لە ژوورەکەی خۆم چاپم دەکردن. بەیاننامەی یەکەم بەناوی مستەفا بارزانیەوە لە لوبنان دەرچوو. بەدەستی خۆم وێنەیەکی بارزانیم نەخشاندن و بەیانەکەمان پێڕازاندەوە. دەستمان کرد بە دابەشکردن و بڵاوکردنەوەی بەیانی یەکەم بەسەر رۆژنامە ناوخۆییەکان و ئاژانسەکانی هەواڵ لە ناوخۆ و دەرەوە. بڵاوکردنەوەی ئەو بەیانە لە نێوەندە سیاسی و رۆژنامەوانی و کۆمەڵایەتیەکاندا هەرایەکی زۆر گەورەی نایەوە کە هەرگیز پێشبینیمان نەکردبوو، لەیەکەم بڵاوکراوەماندا لەسەر شۆڕشی

---

[١٧] پرۆفیسۆر عسمەت شەریف وانلی (١٩٢٤-٢٠١١) تێکۆشەرێکی ناوداری کوردە، بەرەچەڵەک لەو کوردانەی باکوری کوردستانن کە ئاوارەی سوریا بوون. دوای تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی لە بەیروت دەست بە خوێندنی ئەندازیاری دەکات بەلام لەبەر ئەوەی زیاتر حەزی لە سیاسەت و فەلسەفە بووە واز لەو خوێندنە دەهێنێت. ساڵی ١٩٤٨ روودەکاتە سویسراو لە شاری لۆزان نیشتەجێ دەبێت و هەر لەوێ کۆلیژی یاسا دەخوێنێت. ساڵی ١٩٥٦ کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لەگەڵ هاوڕێکانیدا دروست دەکات. ساڵی ١٩٧٦ لەلایەن دەزگای هەواڵگری عێراق هێرشی کرایە سەرو لە ماڵەکەی خۆیدا لە سویسرا بە سەختی بریندار کرا. لە نێوان ساڵانی ١٩٩٩-٢٠٠٣ سەرۆکی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان بووە. بە یەکێک لە ئەندازیارەکانی گرێدانی پەیوەندی نێوان کورد و ئیسرائیل ئەژمار کراوە - وەرگێڕی کوردی-

کوردستانی عێراق سەرکەوتن یارمان بوو. کە لەم کارەمان تەواو بووین ئەحمەد تۆفیق بڕیاریدا لە لوبنان نەمێنێت ولەڕێگای شامەوە، هاوڕێ لەگەڵ ڕۆژنامەنوسی ئەمەریکی "دان شمدث" سەفەر بکاتەوە بۆ کوردستانی عێراق. ئەوە یەکەم جاربوو کە ڕۆژنامەنوسێکی بێگانە تەواو بە نهێنی لە ڕێگای سوریاوە لەگەڵ نوێنەری ئەو کاتەی بارزانی ئەحمەد تۆفیق، سەردانی شۆڕشی کورد بکات. نوێنەری شۆڕش ویستی نمونەی ئەو بڵاڤۆک و بەیاننامانەش لەگەڵ خۆیدا بەرێتەوە کە لە بەیروت چاپمان کردبوون، بۆ ئەم کارەش بەتەواوەتی پشتی بە پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا بەستبوو. بۆ ئەم مەبەستە کەسێک تەرخانکرا بە ناوی مەجید حاجۆ، کە ئەندامێکی باڵای ئەو حزبە بوو. کاتێک ئیتر هەموو ئامادەکاریەکان کران بۆ ئەوەی نوسراوەکان لەگەڵ ئەحمەد تۆفیق ڕەوانە بکەین، کەوتنە ڕێگا، کاتێک دەگەنە ناوچەی زحلە یەکسەربەبێ هیچ پاساوێک مەجید حاجۆ لە کارەکە پەشیمان دەبێتەوەو واز دێنێت و هەموو نوسراوەکان لە زحلە بەجێدێڵێت و بەرەو سوریا هەڵدێت، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک هۆکاری ئەوە بزانێت. ئەحمەد تۆفیق بەناچاری هیچی بۆ نامێنێتەوە و ناتوانێت بڵاوکراوەکان بگوێزێتەوە بۆیە بەناچاری تەنها ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە کە بگەڕێتەوە بۆ بەیروت. لە بەیروت چاوم پێکەوتەوەو هەموو شتێکی بۆ باس کردم و لۆمەی پارتی دیموکراتی کوردی لە سوریا دەکرد و پێی گوتم: کەسێک نیە

جگە لەتۆ بتوانێت هاوکارم بێت و ئەو شتانە بگەیەنمە سوریا. هەڵویستەکە بۆمن زۆر دژواربوو، پێشبینی ئەوەم نەکردبوو، بۆیە لە ناخی خۆمدا وتم بەهەر نرخێک بووە دەبێت بەزووترین کات ئەو کارە بکەم. خۆم کۆکردەوەو پشتم بە خودا بەست. داوام لە هاوسەرەکەم کرد کە هاوبەشم بوو لە خەبات، لەگەڵ ژنێکی تری خزمی خۆم کە لەگەڵمدا بێن. ڕۆشتین بۆ زحلە نوسراوەکانم کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکم دا بە هاوژینەکەم و بەشەکەی تریش بەو ژنەی تر، ئیتر بە سەلامەتی گەیشتین بەبێ ئەوەی کەس ڕێگرمان بێت و ئێوارە گەڕاینەوە بۆ بەیروت.

دوای سەرکەوتنی خۆم و هاوژینەکەم و ئەو ژنەی دۆستمان، پارتی دیموکراتی کوردستان لە عێرق نامەیەکی سوپاسگوزاری بۆ ناردین، لەپای ئەوخزمەت وقوربانیدانەی کە لە پێناوی شۆڕش و گەلدا پێشکەشمان کرد.

لەو دەمەیدا، واتە لەسەروبەندی پێکهێنانی حزب لە لوبنان، بارودۆخی حزبمان لە هەموو ئاستە جیاوازەکاندا ئەوەندە خراپ بوو مایەی بەزەیی بوو. زۆربەی کوردەکانی لوبنان هیچ بایەخیان بۆ کورد بوونی خۆیان نەبوو، تەنانەت نەشیاندەگوت کە ئەوانە پشتاو پشت کوردن، تاکە غەمیان پەیداکردنی پاروە نان و بەرژەوەندی تەسکی خۆیان بوو. هیچ خواستێکی نەتەوایەتییان نەبوو، هەر کەسەو تەنها بایەخی بە خۆی دەداو بایەخی بەکەسی تر نەدەدا. هەندێکیان ئاژان بوون و بەکرێگراوی نوسینگەی

دووەم بوون، یان سەربە پیاوانی ئاسایشی گشتی بوون و جاسوسییان بەسەر ڕۆڵەکانی گەلی کوردی بەش مەینەتەوە دەکرد. ئەو بارودۆخە سەرشۆڕانەیەی کە گەلی کوردی خرابووە ناو لەناو دەرونمدا کاری دەکرد و کاریگەری زۆری هەبوو لەسەرم، بۆیە مکوڕبووم لەسەر تێکۆشان. خەباتی خۆم بێپەروا دەکرد و قوربانیم بە هەموو شتێک دەدا. نوسینم بڵاو دەکردەوەو بەیاننامەی نهێنیم بۆ پشتیوانی شۆڕشی کورد لە عێراق، بەناوی کوردەکانی لوبنانەوە دەنوسی. وردە وردە سەرنجەکان کەوتنە سەر ئەو چالاکییانەی ئەنجامم دەدان، ئەمە جگە لەو کاریگەرییەی کە بەڕوونی دیار بوو بەسەر ناوەندە سیاسیەکانەوە. ئەمە وایلێکردم چالاکییەکانم چڕترکەمەوە، گفتوگۆ و چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرپرسانی حزب بکەم لە سوریا لە پێناوی خزمەتکردنی ڕۆڵەکانی گەلی کوردمان و پشتیوانیکردنی شۆڕشی کورد. هەروەها لەگەڵ نوێنەرانی شۆڕش لەهەر وڵاتیکی ئەوروپا کە هەبوون، پەیوەندیمان گرێدا.

پەیوەندی نامە گۆڕینەوە کە بەرپرسە کوردەکان ئەنجامیاندەدا، لە ڕێگای ئێمەوە لە ئەوروپاوە بۆ سوریا و لەوێشەوە بۆ ناو شۆڕش و بە پێچەوانەشەوە، هەمووی لە ڕێگای ئێمەوە دەکران. هەندێجار ناچار دەبووم کە خۆم بخەمە بەردەم گەورەترین مەترسی، بۆ ئەو کارانەی کە دەخرانە ئەستۆم دەچووم بۆ قامیشلو کە نزیک بوو لە سنوری نێوان

عێـراق و تورکیـا. وەک تەتەر بەریـدی شۆڕشـم دەگواسـتەوە. هەندێ پەڕاوم ئامادەکردبوو بەناوی خاچی سوری نێودەوڵەتی و ناوی دیلەکانی سوپای عێراقم تیدا تۆمار کردبوو. بەو ئەرکانە هەڵدەستام ویڕای ئەوەی کەزۆر قورس و مەترسیدار بوون و ئەو بەرپرسـیاریەتییەی کە بەهۆیـانەوە دەهـاتنە گـۆڕێ. ئەو کـارانەم بە خواسـتی خـۆم ئەنجامـدەدا و ویـژدانم ئاسـودە بـوو، چونکە بڕوای تەواوم بەوە هەبوو کە من بۆ خزمەتکردنـی گەل و نەتەوەی خـۆم ئەو کـارە دەکەم، شـانازیم پێـوە دەکـردن و شانازیشم بە شۆڕشی پیرۆزمانەوە دەکرد. هەموو تێچوونەکانی ئەو کارانەشم لە گیرفانی خۆم و ئارەقەی نێوچاوانی خۆم دەدان.

لێرەدا ڕووداوێک ئەگێڕمەوە لە نێوان من و عسمەت شـەریف وانلی ڕویدا، کە نوێنەری شۆڕش و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بوو لە ئەورووپا، هەروەهـا نـوێنەری ڕەسـمی کۆمیسـیۆنی مافەکانی گەلی کورد بوو لە ئەورووپا. پەیوەندیم لەگەڵیدا ئاسـایی بوو، ڕێزمدەگرت و خۆشم ئەویست و ڕێزی وڵاتپەروەری ئەوم دەگرت و هیچ داوایەکیم ڕەت نەدەکردەوە. سـاڵی ١٩٦٢ عسـمەت هات بۆ بەیروت بۆ لام و هەندێ نامەو بەیاننامەی خاچی سـوری نێـودەوڵەتی لەگەڵ خۆیـدا هێنـابوو، داوای لێکـردم بە سـەلامەتی ئەوانە بگەیەنمە دەستی مەلا مستەفا، لە ڕێگای نوێنەری پارتی لە سوریا و ئەویش لای خۆیەوە بە شێوەیەکی سـەلامەت بیگەیەنێت بە بارەگای شۆڕشـی کـورد لە عێراق. دەبوو پاش تەسلیمکردنی

نامەکـان و بەریـدەکە وەک داب و نەریتـی حـزب دەخوازێـت بەڵگەنـامەیەکی رەسـمی وەربگـرم کە بیسـەلمێنێت مـن ئەو ئەمانەتانەم تەسلیم بە شوێنی خۆی کردووە. بۆ ئەو مەبەستە دوو رۆژ چـاوەڕوان بـووم هەتـا بەریـدی شـۆڕش گەشـتەوەو وێڕای هەندێ نـامەی تـایبەت بە حـزب ئەو بەڵگەنامەیەشـی تێدا هـاتبوو کە بەریـدەکە گەشتۆتە شـوێنی مەبەسـت. یەکسـەر لەگەڵ گەشتنەوەم بۆ بەیروت چووم بۆ ئەو هۆتێلەی کە عسمەت تیادا دابەزیبوو. فەرمانبەری هۆتێلەکە پێی راگەیاندم ئەو پاپۆڕەی کە عسمەت گەشتەکەی خۆی پێدەکات کـاتژمێر شەشـی ئێـوارە دەردەچێت، بۆیە بە پەلە بەرەو بەندەرەکە بەڕێکەوتم. داوای مۆڵەتم کرد بۆ چوونە ژوورەوەی هۆڵی مسافیرەکان، سەیرم کرد پاپۆڕەکە ئامادەیە بۆ رۆشتن. داوام لە بەرپرسانی پاپۆڕەکە کـرد چەنـد سـاتێک بوەسـتن و هاوکـاریم بـکەن بـۆ کـارێکی زۆرگرنگ. بەرپرسان بەوپەڕی حورمەت و سنگفراوانی داواکەیان پەسـەند کـردم، کە لێـرەدا زۆر زۆر سوپاسـگوزاریانم، بـانگی عسمەتیان کرد بۆم، هاتە دەروازەی پاپۆڕەکە، بەدەستیی بەریدی شـۆڕش و پسـوڵەی تەسـلیم کردنـی بەریـدەکەم پێدا. ماڵئـاواییم لێکـرد و رۆشـت لەسـەر خـوا سـەفەری خێـری بێت، بەڵام پـێش ئەوەی جیـا ببـنەوە پێـی گـوتم: ئەی جەمیلـی بـرام ئەگەر چەنـد کەسـێکی دڵسـۆز و تێکۆشـەری وەک تـۆ لەریـزی گەلەکەمانـدا هەبوایە ئەوا زۆر دەمێک بوو رزگارمان ببوو!

## دادگایی کردنم به تاوانی جاسوسی

رووداوێکم وەبیر دێتەوە کە بەسەرمدا هات. مانگی پێنجی ساڵی ١٩٦٢، سکرتێری پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا، پەیوەندی پێوەکردم و گوتی حزبمان لە سوریا بەنیازە بەیاننامەیەک دژی حکومەتی عێراق و سوریا دەربکات، بەلام توانای داراییان نیە، بۆیە داوایان لە من کرد کە هاوکارییان بکەم، منیش بەوە قایل بووم. بەیانەکە وەلامێک بوو بۆ وەزیری ئەودەمەی ناوخۆی سوریا "ئەسعەد محاسن" کە زۆر بەتوندی پەلاماری کورد و مەسەلەی کوردی دابوو، گوتبووی کوردستان ئیسرائیلی دووەمە لەناو دڵی نەتەوەی عەرەب. کاتێک بیرۆکەی دەرکردنی بەیاننامەکەی پێگوتم زۆرم پێخۆش بوو. بەبێ هیچ دڕدۆنگییەک تێچوونی چاپکردن و بلاوکردنەوەی بەیاننامەکەم گرتە ئەستۆی خۆم. کەلە نوسین و چاپکردنی تەواوبووین، تکای لێکردم کە بۆی بگەیەنمە سوریا، منیش پێمگوتن: بۆچی لەگەل خۆتاندا نایبەنەوە بۆ سوریا؟ لە وەلامدا گوتی بەڕاستی پێت بلێم بوێری تەواومان بۆ ئەو کارە مەترسیدارە نیە، منیش ناچاربووم خۆم کۆکەمەوەو پشتیوان بە خوای گەورە و بە ئیمانی تەواو بە ڕەوایەتی مەسەلەی کورد بە بوێری تەواوەوە کارەکە بکەم.

پیرە ژنێکی خزمی خۆم برد و هەندێ لە بلاوکراوەکانم بە ڕێکوپێکی خستە ناو جلەکانی ئەو، لە گیرفانی خۆشمدا بەرێدی شۆڕشم هەلگرت کە لە ئەوروپاوە هاتبوو، پشتیوان بە خوا لە بەیروتەوە بەرەو شام ڕۆشتین.

گەیشتینە ناوچەی (ضهر البیدر)، خاڵێکی پشکنینی سەربازی لەوێ هەبوو زۆر بە توندی پشکنینی هاتوان و ڕۆشتوانی دەکرد، چونکە تازە کودەتایەکی شکست خواردوو لە لایەن پارتی نەتەوەیی سوری ئەنجام درابوو. پشکنینەکە بەبێ جیاوازی بۆ هەموو کەسێک بوو لەهەموو لوبنان. بەشوێن چەک و ئەو کەسانەدا دەگەڕان کە ئەندامی بزووتنەوە کودەتاییەکە بوون. لە کاتی پشکنیندا پیرەژنەکە ئاشکرا بوو، دوای ئەومنیش ئاشکرا بووم داوایان لەمن کرد کە لەگەڵیاندا بڕۆم بۆ ژووری پشکنین. هەموو بەرید و ئەو نامانەی بۆ بارزانی و سەرکردەکانی شۆڕش هاتبوون کەوتە دەستیان. یەکێک لەو کەسانەی کە لە خاڵی پشکنینەکەدا بوو بە توندی پرسیاری لێکردم: تۆ جاسوسی بارزانیت؟ وەڵامم دایەوە: نەخێر من جاسوس نیم من کوردی لوبنانم. پەیوەندییان بە پۆلیسی "شەتوراوە" کرد، کاتژمێر لە دوازدەی نیوەڕۆ نزیک دەبۆوە. هەتا کاتژمێر یەک بەتەنها لە ژوورێکدا منیان هێشتەوە، دوای ئەوە دەستیان بە لێکۆڵینەوە کرد لەگەڵم، بۆ ئەوەی بزانن کێ بەرپرسی ئەو کارەیە و ئەوانە کێن کە ئەو نامەو بڵاوکراوانە وەردەگرن لە سوریا. یەک وشەم بۆ نەدرکاندن بۆیە بەشێوازی تایبەتی خۆیان دەستیانکرد بە جنێودان و لێدانم و بەشێوەیەکی زۆر وەحشیانە تێمبەربوون. ئەو شێوازە ئەشکەنجانەش هێندەی تر یاخی و ڕقئەستوری کردم، بۆیە خۆم گرت و هیچم نەدرکاند. بەهەموو شێوازێک هەوڵیاندا

لەگەڵمدا سودی نەبوو، بۆیە پەنایان برد بۆ شێوازی مریشکی برژاو و جۆرەها ئەشکەنجەی تر کە لە سەدەکانی ناوەڕاست پەیڕەو کرابوون. هەتا کاتژمێر حەوتی ئێوارە بەردەوام بوون لە ئەشکەنجەدانم. خۆڕاگرمامەوە و بیروباوەڕی بەهێزکە هیچ ملکەچی و تەسلیمبوونێک ناناسێت، پشتیوانم بوو.

بەرەبەیانی ڕۆژی دووەم بردیانم بۆ دادگای سەربازی، لە کاتی گواستنەوەم لە " ضهر البیدر" بۆ بەیروت، ئۆتۆمبیلەکە لە هەر بنکەیەکی پۆلیس دەوەستا و دەیانپرسی کێتان لەگەڵدایە، دەیانگوت جاسوسێکی کوردی بارزانی. گەیشتینە دادگای سەربازی لە بەیروت، بەر لە دادگایی کردنم شەش ڕۆژ لە ژوورێکی تاک نەفەری زیندان مامەوە. ٢٣ کەسی فەلەستینم لەگەڵدابوو لە گروپی حاجی ئەمین ئەلحوسەینی، دوای ئەوە گوازرامەوە بۆ سەکەنەی سەربازی "امیل حلو"، کە خەڵکانی دەستگیرکراوی جولەکەو فەلەستینی لێبوو، هەموو ڕۆژێک بەیانیان بەرپرسی زیندان بانگی دەکردم و دەیگوت: وەرە کابرای کورد، ئینجا فەرمانی دەکرد بۆ ماوەی پتر لە یەک کاژێر تەوالێتەکان پاک بکەمەوە، دواتر دەیبردم بۆ پاککردنەوەی ژووری سەربازەکان، دوای ئەوە دەیبردم بۆ ناندێنەکە بۆ پاککردنەوەی هەرچی مەنجەڵ و قاپ هەیە هەتا ئێوارە، دواتر دەیگەڕاندمەوە بۆ ژووری تاک نەفەریەکەم. بەمجۆرە لە سەکەنەی امیل حلوهەژدە ڕۆژم بەسەر برد. دوای ئەوە بانگکرام

بۆ لێکۆڵینەوەو ئینجا فەرمانی گواستنەوەم بۆ زیندانی "الرمل" دەرچوو. لەوێش مانگ و نیوێک مامەوە، دوای ئەوە بەرامبەر بە پێدانی برەپارەیەک وەک کەفالەتی مانەوە، ئازادیان کردم. کەسوکارم پارێزەری بەناوبانگ "محسن سلیم" و هاوپیشەیەکی خۆی بەناوی مامۆستا " یوسف سوبره" یان بۆ گرتبووم. گەلی کورد و خودی کەسایەتی خۆم هەرگیز هەوڵ و هیمەتی پارێزەری گەورە محسن سلیم لەیاد ناکەن، پیاوێک بوو بەوپەڕی ڕاستگۆیی و دڵسۆزی لە هەموو دانشتنەکانی دادگادا، بەرگری لە خۆم و مەسەلەی کورد کرد.

لە زیندان دەرچووم سەرباری هەموو ئەشکەنجە و ئازارێک، ئیمان و باوەڕو مکوڕبوونم بۆ بەردەوامبوون لەسەر خەبات و تێکۆشان، پتەوتربوو. بە دەروونێکی تازەوە لە زیندان هاتمە دەر.

سکرتێری پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا هێشتا لە لوبنان مابوو، زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئازادبوونی منی دەکرد، بۆ ئەوەی هەندێ گفتوگۆی تایبەت بە کاروباری حزب بکەین. لەو ماوەیەدا بەڕێکەوت لە ڕێگای عوسمان سەبرییەوە باوە "تۆما بیربوا"م ناسی. دوای دەرچووم لە زیندان بە ماوەیەکی کورت ناکۆکی توند کەوتە نێوان من و پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا، هۆکاری ئەوەش جیاوازی بیروبۆچوونمان بوو. سیاسەتی ئەوان جۆرێک لە دژایەتی بارزانی تێدابوو، منیش ئەو هەڵوێستە دوژمنکارانەیەم بە پێویست نەدەزانی. بەهۆی ئەم

نــاکۆکییەوە پەیوەنــدییە سیاســییەکانی نێوانمــان بــڕا. وێــڕای هێرشــکردنە ســەر بــارزانی، پــارتی دیمــوکراتی کــورد لەســوریا بارزانییـان بە کۆنەپەرســت و عەشــایر تۆمەتبــاردەکرد، لە کاتێکدا من بە پیرۆزترین مرۆڤی کوردم دەزانی لەسەر رووی زەوی، بۆ خزمەتی مەسەلەی کورد، بەڵام ددان بەوەدا دەنێم کە هەڵەبووم. لەو کاتەدا زۆرم ئازار چەشت چونکە خۆم بە یەکێک لە لایەنگرە هەرە دڵســۆز و دڵگەرمەکــانی بــارزانی و سیاســەتی حەکیمــانە و دڵسۆزانەی بۆ کورد دەزانی. سەرکردەکانی حزب لە سوریا هەتا ئەو رادەیە نــاجوامێر بــن کە بــوێری ئەوەیــان هەبێــت بــارزانی بە عەشــایرو کۆنەپەرســت و نەخوێنــدەوار تۆمەتبــار بــکەن، لەبەر ئەوەی خۆیان بانگەشەی بیروباوەڕی هــاوردە کراویــان دەکرد و لەگەڵ بــاڵێکی مەکتەبــی سیاســی لە دژی بــارزانی رێککەوتبــوون. کاتێکیش ناکۆکی لە نێوان هەردوو حزبی لوبنانی و سوری توند بــووە، ئەوان دەســتیان کــرد بە هــۆنینەوەی پــیلان لە دژی مــن و نــاردنی راپــۆرتی درۆ بــۆ مەکتەبــی سیاســی پــارتی دیمــوکراتی کوردســـتانی عێــراق. پاساویشــیان ئەوە بــوو کە جەمیــل مەحــۆ بەهێزتــرین و زمــان پــاراوترین کەســەو لایەنگرێکــی بەهێــزی بارزانییە و لەبەر ئەوەی سەکردەیەکی لێهاتوو بە جەرگە دەتوانێ بە ئاسانی جەماوەری کورد بجوڵێنێت و کۆسپی سەر رێگامانە لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانماندا، بۆیە دەبێت تێکیبشکێنین. لەو کــاتەدا ســێ بەشــی ئەنــدامانی ســەرکردایەتی شــۆڕش، لە پــێش

هەموشـیانەوە ئیبـراهیم ئەحـمەد و جەلال تالەبـانی دروشـمی مارکسی و ماوییان بەرز دەکردەوە و لەناو شۆڕشدا بانگەشەیان بۆ دەکرد.

تـا ئەم سـاتەش هێشـتا نیـوەی ئەنـدامانی لیـژنەی مەرکەزی پارتی دیموکراتی کوردستان لەو کەسانەن کەبەدوای بیروباوەڕی هـاوردەکراون و لەپشـت ئەو شـتەوە خۆیـان حەشـارداوە کە پێـی دەگوترێـت (شۆڕشـی کـورد) و بـارزانیی سـەرکردەی. لەنـاو شـۆڕش بانگەشـەی بـارزانی بوونیـان دەکـرد و لە دەرەوەش بانگەشـەی مارکسـیەت، بەلام بەداخێکـی زۆرەوە دۆلارێـک لەکـن ئەوانە زۆر لە بیروبـاوەڕی مارکسـیەت بەهێزتـر بـوو، بەتـایبەت سـەبارەت بە کەسـایەتی حەبیـب مـحەمەد کەریـم و هاوڕێکـانی، لەوانەش سامی عەبدول رەحمـان، عەبدول رەحمـن مەحمـود، دارا تۆفیق، صـالح یوسفي و عەزیز عەقراوی و چەندانی تـر لەوانەی کە بەدرۆ و دەلەسـە خۆیـان کردبـووە سـەرکردە لەنـاو پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان لە عێـراق، هەمووشـیان لەبەردەم دۆلارو کلکـایەتی بـۆ ئیمپریـالیزمی نێودەوڵەتی ملـی خۆیـان کەچ دەکـرد. حەبیـب کەریـم سـاڵی ۱۹۷۳ لەرۆژنـامەی " الجمهوریـة"ی میسـردا وتبـووی: لە راسـتیدا ئـێمە بە یەکێتـی سـۆڤیەت و دەوڵەتە سۆشیالیسـتەکان دەسـخەڕۆبووین" ئەم لێـدوانە دوای ئەوە دێـت کە بڕێکی زۆر پارەی دۆلاریان وەرگرتبوو.

پەیوەندییەکانی خۆمان لەگەڵ سەرکردەکانی پارتی دیمـوکراتی کورد لە سوریا بڕی، بەهۆی لەرێگالادان و گومڕابوونی عوسـمان

سەبری، لە هێڵی سیاسی حزب و بیروباوەڕە کوردستانییەکانی.
ئەو بە رواڵەت خۆی لە پشتی ئامانج و بیروباوەڕەکانی حزبەوە
حەشاردابوو، بەڵام خزمەتی بە بیروباوەڕ و فکری کۆنەپەرستی
دەکـــرد، لەگەڵ هاوشـــێوەکانی خۆشـــی لە گومڕاکـــانی عێـــراق
پەیوەندی توندوتۆڵی هەبوو. ئەو بیروباوەڕانە زۆر دوور بوون
لە بیروباوەڕو ئامانجەکانی گەلی کوردمان کە هەمیشە بانگەوازی
ئازادی و دیموکراسیەتی دەکرد.

هەرچەنـدە پەیوەنـدییەکانی خۆمـان لەگەڵ هەمـوو ڕێکخـراوە
کوردییەکانـــدا بـــڕی لە ســـوریا و ئەوروپـــاش، ســـەرکردایەتی
"شۆڕش" یش لای خۆیەوە هەموو پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێمەدا
لە لوبنـــان هەڵپەســـارد، ئەمەش دیـــارە بەهـــۆی ئەو راپـــۆرتە
درۆینانەی کە سەرانی حزب لە سوریاوە بۆ هاوڕێکانی خۆیـان
دەنـارد، بێگومـان و بە ئاگـاداری و هاوئـاهەنگی لەگەڵ مەکتەبـی
سیاســی پــارتی دیمــوکراتی کوردســتان، بەبــێ ئەوەی مســتەفا
بارزانی ئاگای لەو هەموو پیلانە بێت کە لە چواردەوریدا هەبوون
لەنـاوخۆی و دەرەوە لە لایەن ئەو بەکرێگیـراوانەی خۆیـان لەپـاڵ
دروشـــمە بریقەدارەکـــانەوە دەشـــاردەوەو شۆڕشـــیش لەوانە بـــێ
بەری بوو. لە ڕێگای عسمەت شـەریفەوە دەمتـوانی پەیوەنـدی بە
کوردەکانی ئەوروپاوە بکەم، چونکە ئەو نوێنەری شۆڕش و پارتە
کوردستانیەکان بوو لە ئەوروپا.

## ئاشتبوونەوە لەگەڵ عوسمان سەبری

جەلال تالەبانی هاوڕێ لەگەڵ شەوکەت عەقراوی لە قاهیرەوە هاتبوون بۆ لوبنان و لە هۆتێلی بریستۆل دابەزیبوون، داوایانکردبوو لەگەڵمدا دانیشن، منیش هیچ لاریم نەبوو. لە گەڵیاندا دانیشتم و زۆر راشکاوانە قسەمان کرد. یەکەم جارم بوو چاوم بە تالەبانی بکەوێت. بۆتان ئەگێڕمەوە باسی چیمان کرد، بۆ ئەوەی هەڵە تێگەشتن و ناڕۆشنی دروست نەبێت راشکاوانە و بە ئەمانەتەوە هەموو شتێک ئەگێڕمەوە. بابەتی بنەڕەتی، ناکۆکییەکانمان بوو لەگەڵ سەرکردەکانی حزبە کوردییەکەی سوریا . زۆر بابەتیانەو بە درێژیی باسی راستینەی ناکۆکیەکان و پاڵنەرەکان و هۆیەکانم بۆ روونکردنەوە. گفتوگۆکانمان ئەرێنی بوون، بەوپەڕی رێزو حورمەتەوە بەرێوە دەچوون. دوای ئەوەی هەموو شتەکانم باس کرد، جەلال تالەبانی داوای لێکردم جارێکی تر بە ئامادەبوونی سکرتێری حزبی کوردی سوریا لەو کاتەدا عوسمان سەبری دیسان کۆببینەوە. لە کاتی دیاریکراودا لەگەڵ عوسمان سەبری لە ژوورەکەی جەلال لە هۆتێل بریستۆل کۆبووینەوە. بەوردو درشتی باسی ناکۆکییەکان و هەڵوێستی خۆمم کرد سەبارەت بە شۆڕش، وەک ئەوەی کە پێی ناسراوم، هەروەها سەبارەت بە هەموو پارتە دیموکراتەکانی تری کورد، کە من لایەنگرو پشتیوانی هەموویانم بەبێ هیچ مەرجێک، چونکە ئامانجی هەموومان هەر یەکەو هەمووشمان لەژێر سەرکردایەتی و زەعامەتی بارزانی کۆبووینەتەوە، چونکە ئەو سەری شۆڕشەو

تاکە سەرکردەیەتی. ڕێگای نەدام بەردەوام بم لە وتەکانم، جەلال قسەکانی پێبڕیم و گوتی: زۆرتان هەوڵدا دووبەرەکی و ئاژاوە بخەنە نێو کوردەکانی سوریا، ئێستاش ئەتانەوێت چالاکییەکانی خۆتان بگوێزنەوە بۆ لوبنان و لێرەش ئاژاوە بخەنە ناو کوردەکانەوە. لە بیرم دێت کاتێک خۆتان کاندید کرد بۆ هەڵبژاردنەکانی سوریا، بۆچوونی خۆم ڕاشکاوانە بۆ دەربڕیت، ئێستاش دەتانەوێت تۆوی دووبەرەکی لەناو کوردەکاندا بچێنن[18].
لێرەدا عوسمان سەبری بەرگری لەمن کرد و گوتی: کاک جەلال بەخۆتاندا بچنەوە، جەمیل زۆر بە توندی هاوکاری عسمەت شەریف دەکات و لە پێناوی شۆڕشدا چالاکی و پاگەندەی زۆر دەکات، ئەو بەرۆژ و شەو کار بۆ بارزانی دەکات. لێرەدا قسەکانمان تەواو کرد. ئایا ئەم گفتوگۆ ڕاشکاوانە بەد حاڵی بوونی ڕەواندەوە؟ ئایا لە کۆتایی قسەکاندا بەری ئاشتبوونەوە دەچنینەوە لە نێوان من و عوسمان سەبری بەسەرپەرشتی و ئامادەبوونی جەلال تالەبانی؟ کە لە هۆتێلەکە هاتینەدەرەوەو هەرکەسەو بەرەو کاری خۆی چوو، من بیرم لەوە دەکردەوە.

---

[18] هەست ئەکەم لێرەدا هەڵەیەک لە چاپەکەدا هەیە، چونکە جەمیل مەحۆ لوبنانی بووە، ئیتر چۆن خۆی کاندید دەکات بۆ پەرلەمانی سوریا، هەروەها مەحۆ خۆی لێرەدا دەڵێت یەکەمجارم بووە تالەبانی ببینم، ئەگەر وایە چۆن پێشتر بۆچوونی خۆی بۆ باسکردووە لەسەر مەسەلەی خۆ کاندید کردنی. لێرەدا دوو ئەگەر هەیە، یان ئەوەتا جەمیل مەحۆ خۆی کاندید کردووە و بۆ پەرلەمانی لوبنان و دەرنەچووە، یان ئەوەتا لەم چاپەدا شتێک پەڕیوەو تالەبانی ڕووی دەمی قسەکانی لە هەردوکیان بووە. — وەرگێڕی کوردی —

لێرەدا زۆر راستگۆیانە ئەوە ناشارمەوە کە دڵم نیا نەبوو بۆ ئەو ئاشتبوونەوە رواڵەتکارانەیە، گومانم لە راستی و دروستی ئەو ئاشتبوونەوەیە هەبوو، هەرگیز ئاسودە نەبووم، چونکە عوسمان سەبریم باش دەناسی، دەمزانی خاوەنی چ دەروونێکی نەخۆشە. لە ناخی خۆمەوە لەو باوەڕەدابووم کە دانانیشێت و دەست ئەکاتەوە بە پیلانگێڕی. دروست بۆچوونەکەی من راست دەرچوو، چونکە من کەسێکی دڵسۆز بووم، حەزم کرد بەوپەڕی دڵسۆزی و لەخۆبووردەییەوە هەموو ناکۆکییەکان چارەسەر بکەم بۆ ئەوەی هەمووومان بۆ ئامانجە گەورەکە کار بکەین، ئەویش یەکڕیزی حزب و رزگارکردنی گەلی کورد بوو لە نەهامەتی و کۆکردنەوی لە چوارچێوەی نەتەوەیەکی یەکگرتوو کە بتوانێت گەشەبکات و ژیانێکی شەرەفمەندانە بژی.

خۆماک (غەریزە)ی شەڕ لەناخی عوسمان سەبری هێزی خۆی لە شەیتان وەردەگرت. هەروەها ئەقلیەتیشی هاوردەکراوبوو، بۆیە هەرگیز دانەدەنیشت، بەڵکو بەردەوام خەریکی نەخشەکێشانی پیلان و ملشکاندن بوو. بەشێوازێکی نامەردانە تۆوی دووبەرەکی لەناو حزبەکەماندا لە لوبنان دادەچاند، خەریکبوو هەندێ ئامانجی خۆی بەدەست بێنێت، بۆیە ناچاربووم هەموو ئەو کادرە حزبییانەی کەعوسمان سەبری دەسخەڕۆی کردبوون لە حزب دووریان بخەمەوەو بەتەواوی دەریانبکەم.

کاتێــک حــزب بە پیلانەکــانی ئەوی زانــی، هەمــوو ئەو پارمەتیـانەی بـڕی کە بـۆ مەسـرەفی تـایبەتی خـۆی پێمانـدەدا، هەرچەنـدە ئەو سـکرتێری حـزب بـوو لە سـوریا بەڵام ئـێمە پارمەتیمان دەدا. هەروەها کرێی مانگانەی ژوورەکەشی کە بۆمان گرتبوو لە بەیروت ئەویشمان بڕی. هەروەهـا حزبیش لە سوریا هەموو هاوکارییەکانی ئەوی بڕی. دوای بڕیاری حزب لە لوبنـان، کوردەکـانی لوبنــان وردە وردە لەو کشــانەوە، بـۆیە ئیتــر ئەو لەڕووی مادی و سیاسیشەوە مایەپوچ دەرچوو. هیچ دەرەتـانێکی بـۆ نەمـایەوە تەنهـا ئەوەنـدە نەبێـت کە بـڕواتەوە بـۆ سـوریا، هەرچەنـدە پێشـتر پاگەنـدەی ئەوەی دەکـرد کە ئەو لە سـوریا لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە داوا کراوە، بەڵام رۆشتەوە بۆ ئەوێ.

بە گەشتنەوەی بۆ سوریا کەوتە ناو بۆسەی هاوڕێکانی خۆی، ئەو پەندە بەناوبانگەی بەسـەردا هـات کە دەڵێت (پاداشـتی خـراپە، خراپەیەکــی وەک خــۆیەتی[19])، ئەو هەڤــاڵانە لە حــزب باشــیان دەناسی و ئاگاداری رەفتارە نابەرپرسەکانی بوون لە لوبنان، بۆیە لەلایەن حزبەوە دادگایی کرا و لە ئەنجامدا لە سکرتاریەتی پارتی دیمـوکراتی کـوردی سـوریا دەرکراو کەسێکی تر خـراپە شـوێنی. چەند جارێکی تر هەوڵیدابوو دەست بەسـەر حـزبەکەدا بگـرێتەوە، بەڵام دووچـاری شکسـت هـاتبوو، چـونکە هەڵەی زۆری کردبـوو

[19](جزاء سیئة، سیئة مثلها) رەنگە ئەگەر ئەم ئیدیۆمە بکەین بە کوردی باشتربێت بنوسین (لە جێی سندان قوزەڵقورتە) – وەرگێڕی کوردی –

نەیدەیتوانی بەرپرسیاریەتی هەڵبگرێت لە کاتێکدا ئەو لەلوتکەی هەرەمی حزبدا بوو.

## چیرۆکەکەم لەگەڵ سەلاح بەدرەدین

قۆناغێک لە قۆناغەکانی ژیانی حزبیم بەوجۆرە تێپەڕاند کە بەوپەڕی دڵسۆزی و راستگۆیی دەینوسمەوە. لێرەدا روداوێکی تر دێتەوە یادم پێمخۆشە وەکو خۆی بۆتان بگێڕمەوە ئەمەش لە پێناو خزمەتکردن بە مێژوو بە گێڕانەوەی راستیەکان کە رەنگە هاوکار بێت بۆ ئەو تێکۆشەرانەی کە دوای ئێمە دێن بتوانن رێبازەکەمان تەواو بکەن. بە سنگێکی فراوان بۆتان دەگێڕمەوە، ئەمەش لە باوەڕمان بە پیرۆزی ئەو ئامانجەی کە هەوڵی بۆ دەدەین و قوربانیمان بەهەموو شتێکی بەنرخی خۆماندا لەپێناو بەرز راگرتنی وشەی کوردستان، بەهیوای یەککگرتنی کورد بە ئیزنی خودا و بە هەوڵ و هیمەتی تێکۆشەرانی ئەم میلەتە شکۆمەندە.

ساڵی ۱۹۷۰ بوو، لە شوێنی کاری خۆم دانیشتبووم، کەسێکی گەنج پرسیاری جەمیل مەحوی دەکرد، پێشتر ئەم گەنجەم نەدەناسی، پێمگوت جەمیل مەحۆت پێشتر ناسیوە؟ گوتی نەخێر، پێمگوت چیت لەو دەوێت؟ گوتی دەمەوێت خۆمی پێبناسێنم. منیش پێمگوت فەرموو بەخێربێیت من جەمیل مەحۆم خۆمم پێناسانیت، ئەی تۆ خۆت کێیت برای شیرنیم؟ پێکەنی و گوتی: من

سەلاح بەدرەدینم سکرتێری تازەی پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا. پێمگوت هێندەی من بزانم سکرتێری حزب عوسمان سەبرییە. پێی وتم: عوسمان سەبری کاری تەواو بووە، لەسەر شانۆی سیاسی کوردی سوریا نەماوە، بەهۆی رەفتارو کردەوە تێکدەرەکانی لەناو ریزەکانی حزب لە سوریاو لوبنان دەرکراوە، ئەگەر راستگۆیم لە گەڵتا ئەو بوختانی بۆ تۆ دەکرد و هۆکاری ناکۆکییەکانی نێوانیشمان بوو، بۆیە هاتووم لاپەرەی رابووردوو دابخەین و ئاوی روونی کانیاوی کورد بخەینەوە سەر رێرەوەکەی خۆی و بەردەوامی بە پەیوەندییەکانمان بدەین. دەبێت هەمووومان بە دڵسۆزی هاوکاری یەکتر بین لە پێناو ئەو بیرو باوەرە هاوبەشەی کە هەمووومان باوەرمان پێیەتی. پەیوەندییەکانمان بەردەوام پێدەدەین و کەسمان مافی بەستوەردانی لە کاروباری ناوخۆی حزبەکەی ترەوە نەبێت...
لەدوای قسەکردنی ئەو گەنجە هەستم بە ئارامییەکی پرگومان کرد، لەبەر ئەوەی ژیانم بە تاڵی و شیرینییەوە بەرێکردبوو، راستینەی زۆر کەسم بۆ دەرکەوتبوو، لەوانە نەبووم کە بەئاسنی فریو بخۆم، بۆیە حەزم کرد بەشێوەیەک لە شێوەکان وەڵامێکی بدەمەوە و پێمگوت: من تۆم دیبوو پێشتر بەریدی سەرکردایەتی حزبت دەهێناودەبرد، ئەرکی تۆ تەنها ئەوەبوو وەکو تەتەر نامەکان بێنێت و بیانبەیت، ئێستاش تویان هەڵبژاردووە وەک سکرتێری حزب لە سوریا جێگای سەرسورمانە بۆمن. لام سەیرە

پۆستە بەرێکی حزب لە شەوورۆژێکدا دەبێت بە سکرتێری حزب.
گوێگرە برا با راشکاوانە پێت بڵێم، من پیاوێکم تاقیکردنەوەی
ژیانم بە گۆشت و خوێن دیوە، خۆم تەرخان کردووە بۆ
کوردستان. پیاوێکی بە باوەڕم و ژیانی حزبیم بەتاڵ و شیرینەوە
بەسەربردووە، بۆیە راشکاوانەو بەبێ ئەملاوئەولا قسە دەکەم،
چونکە لە کاروباری حزبی و چارەنوسسازدا موجامەلە ناخوات.
ئەگەر ئێوە لە سوریا بە راستی دەتانەوێت هاوکاری یەکتر بین
بە دڵسۆزی و بەبێ پیلانگێڕی، دەتانەوێت وەکو برایەکی خاوەن
چارەنوس و ئامانجی هاوبەش کار بکەین و لە چواچێوەی
بیروباوەڕی ئاشکراو رووندا لە پێناوی پرسی کوردستان
کاربکەین بەبێ هیچ لادانێک، ئەوا من بەڵێنت پێدەدەم لاپەڕەی
رەشی کۆن دابخەین و لاپەڕەیەکی سپی و پرشنگدار لەگەڵ
حزبەکەتان هەڵدەمەوە، هەموو توانا و وزەی خۆشم لە خزمەتی
ئەو ئامانج و بیروباوەڕانەدا بخەمەگەڕ کە ئێمەی کورد
هەموومان بانگەشەی بۆ دەکەین. ئەم قسانەش راشکاوانە و بێ
پەردەبوون.

لەسەرئەو بنەمایانە رێکەوتین و بەر لەوەی بڕوات پێی گوتم:
ئەمەوێ کراسێک بکڕم بەڵام پارەکەم تەنها بەشی کرێی گەڕانەوە
دەکات. پێکەوە رۆشتین بۆ بازاڕ هەندێ جلوبەرگ و پێداویستیم
بۆ کڕی. لە هۆتێلێکی گەڕەپانی " الدباس" دابەزیبوو لە بەیروت،
پێش ئەوەی سەفەر کات گوتی: من سەفەری ئەورووپا دەکەم بۆ

ئەوەی لەگەڵ خوێندکاران کۆبوونەوە بکەم و باسی ئەو هۆکارو پاڵنەرانە دەکەم کە وایان لە سەرکردایەتی حزب کرد عوسمان سەبری لە سکرتاریەتی حزب لە سوریا دەربکات[20].

**هەوڵێکی نەزۆک بۆ سەردانی بارەگای سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد لە ناوپردان:**

نوێنەری شۆڕشی کورد، شەوکەت عەقراوی، لەدوای دابەشبوونە خوێناوییەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان لە عێراق، هات بۆ لوبنان. ساڵی ١٩٦٤ بوو، بەهۆی دابەشبوونەکەوە زۆرینەی سەرکردایەتی پارتی دەرکران، لەوانەش ئیبراهیم ئەحمەد، کە سکرتێری حزب بوو، جەلال تاڵەبانی کە پێشتر باسم کردبوو، عومەر دەبابە، عەلی عەسکەری و چەندانی تر لە سەرکردە سیاسی و سەربازییەکان. بارزانی ویستی حزبەکە پاک بکاتەوە لە هەموو ئەو مشەخۆر و پیلانگێڕانەی کە حزبیان بۆ

---

[20] صلاح بەدرەدین ساڵی ١٩٤٥ لە گوندی نعمەتلی لە خۆرهەلاتی قامشلو لەدایک بووە. ساڵی ١٩٦٩ ئوسمان سەبری لە حزب لادا و خۆی بوو بە سکرتێری گشتی حزب، ساڵی ١٩٨٠ ناوی حزبەکەیان گۆڕی بۆ یەکێتی گەلی کورد لەسوریا. لەوکاتە بەدواوە ئەو حزبە چەندین جار کەرت و پەرت بووە. ساڵی ٢٠٠٣ وازی لە کاری سیاسی هێناو بە تەواوی لە پیرمام لە باشوری کوردستان نیشتەجێ بوو. کومانێکی زۆری لەسەرە بەوەی کە دەستی تێکەڵ بووە لەگەڵ دەزگای هەواڵگری سوریا، عێراق، تورکیا. چەندین بەڵگەی تەواوەتی لەم بارەوە بلاو کراونەتەوە – وەرگێڕی کوردی–.

بەرژەوەندی خۆیان بەکار دەهێنا. لەم نێوەدا شەوکەت عەقراوی کرا بە نوێنەرو وتەبێژی رەسمیی بەناوی شۆڕشەوە لە دەرەوەی وڵات و بارەگاکەشی لە قاهیرە بوو. من و برای بەرێز شەوکەت عەقراوی هەتا ئاستێکی باش سەرنج و دیدگامان هاوبەش بوو، بەتایبەت لەسەر دۆخی شۆڕش و دژی ئەو پەرتبوونە دروستکراوەی کە ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی جێبەجێیان کرد.

ورده ورده سەرلە نوێ پەیوەندیم لەگەڵ شۆڕش لەڕێگای شەوکەت عەقراوی پتەوتر بۆوە، لەبەر ئەوەی ئەو جوامێرو دڵسۆزبوو، هەستی بە لێپرسراویەتی حزبی دەکرد، بەهۆی ئەوەوە پەیوەندیم لەگەڵ شۆڕش هەتا دەهات پتەوتر دەبوو. بارزانی هەنگاوی راستکردنەوەی هەڵناو شتەکانی خستەوە سەر رێچکەی خۆی و کاری حزبی بە باشترین شێوە رێکخرایەوە. چاپەمەنی حزبمان بە رێکوپێکی بەدەست دەگەیشت. چاپەمەنییەکان لەناخۆی شۆڕش و لەلایەن مەکتەبی راگەیاندن چاپدەکران، لەوانەش رۆژنامەی خەبات زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان و چەندان بڵاوکراوەی تر. منیش لای خۆمەوە، لە پێناو بزووتنەوە شۆڕشگێرانەکەمان، هەموو ئەو بڵاڤۆکانەمان لە لوبنان سەرلەنوێ چاپدەکردەوە، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی وێنەی تێکۆشەرانی کورد و بەشێوازێکی تەواو

نهێنی دابەشمان دەکردن بەسەر خانەکانی پەخش و نوسینگەو باڵیۆزخانەکان.

لەو عەیامەدا هەندێ لە کەسایەتییە عێراقییەکان دوای روخانی رژێمی کۆنەپەرستی پادشایەتی لە لوبنان دەژیان. ئەو کەسایەتییانە لایەنگری رژێمی کۆنەپارێزی پادشایەتیبوون لە عێراق. بەدەرلەخواستی من، بارودۆخەکە ناچاری دەکردم بەهۆی برای بەرێز شەوکەت عەقراوی، هەندێک لەو کەسایەتییانە بناسم. شەوکەت پارەی لەوان وەردەگرت بۆ خەرجیی تایبەتی خۆی. من راشکاوانە پێمگوت کە هیچ پەیوەندییەکی حزبی بەوانەوەم نابەستێتەوە. ئەقڵیەت و بیروباوەڕی من تەواو پێچەوانەی ئەوانەیە، من ئەگەر دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانەدا ساز بکەم تەنها لەبەر ئەوەیە کە لایەنگریی لە ئێمە بکەن و پشتیوانیی مافەکان و شۆڕشمان بکەن، دەمەوێت ئەوانە لە قازانجی مافەکانی شۆڕشی کورد لە عێراق بەکاربێنم.

لەسەر ئەو بنەما روون و ئاشکرایانە لەگەڵ یەکێک لەوان پەیوەندیم بەهێزکرد. من لەبەردەمی خوداو مێژوودا شاهیدی دەدەم و ویژدانم ئارامە. ئەوکەسەی پێتاندەناسێنم و ناو دەبم بەناوی عەبدول عەزیز، بە واتای وشەکە کورد بوو. زۆر دڵسۆزبوو، خاوەنی قسەی خۆی بوو، پەیشمان بوونەوەی نەبوو. زۆر باوەڕی بە بۆچوونەکانی خۆی هەبوو، دەستی کراوە بوو، هاوکاری شۆڕشی زۆر باش دەکرد. من خۆم لەو باوەڕەدا نیم

ئەو دەست کراوەبوونەوەی لە پێناوخۆدەرخستن یان لە پێناوی پۆست و پلەدا، یان هەر ئامانجێکی تر کە من نەیزانم، بەڵکو خۆی هەمیشە دەیگوت لەبەر هەستکردنی قوڵی بووە بە کوردبوونی خۆی، ئیتر خواش خۆی ئەزانێ.

خەڵکانی تری کوردی عێراقی هەبوون، یەکێک لەوانەش "عەلی کەمال" ناوێک بوو، ئەم کەسە پروپوچەی بەکرێگیراوی کۆنەپەرستی ناوخۆو ئیمپریالیزمی جیهانیی، هەڵوێستەکانی هەمووی دژایەتیکردنی هێزە نیشتیمانییە کوردییەکان بوو. زۆر بەتوندی دژی هەڵوێستە سیاسییە چەسپاوەکانی من بوو، کاتێک دەهاتمە دەست و رۆڵی کۆنەپەرستان و ئیمپریالیزمی جیهانیم رسوا دەکرد لە پیلانگێران لە دژی گەلی کورد و پرسە رەواکەی، بە تایبەتی لەسەر ئەو خاڵانە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردم، سەرەرای ئەوەی بەکرێگراوبوونی ئەو بۆ ئیمپریالیزم و ئەوهێزانەی دژی ماف و ئاواتەکانی گەلی کوردمان بوون، ئاشکرا بوو.

بەڵام ئەوانەی کە زۆریان ئەوت و بەناوی بارزانی و شۆرشی کوردەوە قسەیان دەکرد، وەکو شەوکەت عەقراوی، هەمیشە دیدارو کۆبوونەوەیان لەگەڵدا دەکردو بەناوی شۆرشەوە سەرانەیان لێدەسەندن، لە کاتێکدا پەیوەندی من لەگەڵ عەبدول عەزیز لەسەر بناغەی وەرگرتنی زانیاری زۆر دروست و باوەرپێکراو بوو، کە بەسود بوو بۆشۆرش، ئەمەش بێگومان پەیوەندییەکی راستگۆیانە بوو کە زۆر بە نهێنی و بەبێ ئاگاداری هیچ کام لە هاورێکانی یەکترمان دەبینی.

ڕۆژێک لە ڕۆژان سەردانی کردم، بۆئەوەی هەندێ شتی زۆر نهێنی و گرنگم پێبڵێت، کە زۆر لەبەرژەوەندی شۆڕشی کوردا بوو، هەروەها تکای لێکردم کە سەفەر بکەم بۆ کوردستان و چاوم بەبارزانی بکەوێت، بۆ ئەوەی هەندێ پێشنیازی ئەوەی پێڕابگەیەنم کە تایبەت بوو بە پەیداکردنی چەک بۆ شۆڕش. چەندین جار یەکترمان بینی و ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی کە لە ڕێگای ئێرانەوە گەشت بکەم بەرەو بارەگای شۆڕش. ڕێکەوتنێکی نهێنیمان کرد لەسەر ئەوەی من چی بە بارزانی بڵێم. لەسەر حسابی خۆی تکتی ڕۆشتن و گەڕانەوەی ئێرانی بۆ کڕیم.

گەشتمە فڕۆکەخانەی تاران، ئۆتۆمبیلێکی تاکسیم بەکرێ گرت بۆ ئەوەی بمبات بۆ ئەو ناونیشانەی کە عەبدول عەزیز پێی دابووم. ناونیشانەکەم دۆزییەوە، چاوم بە کەسێک کەوت کە بەناوی فەیسەڵ بەئێوەی دەناسێنم، سەربە خێزانی جاف بوو. نامەی هاوڕێکەی بەیروتم پێدا. زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم و میوانداریيەکی شایستەی کردم. نەیهێشت لە هۆتێل دابەزم، بەڵکو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە میوانی لای خۆی بم، بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت بۆ ماوەیەک بەدووربم لە چاوی پیاوانی دەزگای هەواڵگریی ئێران.

دوای ئەوەی سێ ڕۆژ لە میوانداری ئەودا مامەوە، مەرەخەسیم لێخواست و داوام لێکرد بە شێوازی تایبەتی خۆی بمگەیەنێتە بارەگای شۆڕشی کورد لە حاجی ئۆمەران، بەبێ

ئەوەی هیچ کەس بەوە بزانێت، چونکە یەکەم من خۆم لە ئێرانەوە ڕێگا شارەزا نەبووم بۆ بارەگای شۆڕش، دووەمیش ئەو کاتە من هیچ کەسێکی کوردی ئێرانم نەدەناسی.

کاتێکی زۆری نەویست بۆ ئەوەی دەزگای هەواڵگری ئێران بزانن کە من لای ئەوم، ژمارەیەک لە ئەفسەرانی دەزگای هەواڵگری ئێران هاتن بۆ ماڵەکەی و دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵما. هیچ چاوەڕوانی ئەوە نەبووم کە رویدا. نزیکەی دوو سەعات لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردم، بۆ ئەوەی هۆکاری رۆشتنم بۆ بارەگای بارزانی بزانن. نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێکی باش لەگەڵمدا، خۆم لە پرسیارەکان دەدزییەوە، هەموو هەوڵەکانیان بەفیرۆ چوو، نەیانتوانی بگەنە ئەوەی کە خۆیان دەیانویست. لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەدا ٢٤ سەعات مۆڵەتیان پێدام کە خاکی ئێران بەجێ بهێڵم و بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتووم یان بۆ هەر شوێنێکی ترکە خۆم دەمەوێت بڕۆم، ئەگینا ناچار دەبن بمخەنە زیندانەوە.

هەستم بە هیچ ترسێک نەدەکرد، هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە پیلانێک لە گۆڕێدا بێت لەدژم، بۆیە بڕیارمدا بەرەو لوبنان بگەڕێمەوە. چەند سەعاتێکی کەم بەر لەوەی ئێران بەجێبهێڵم، بە ڕێگای تایبەتی خۆم شوێنی نوێنەری شۆڕشم لە تاران دۆزییەوە کە ناوی شەمسەدین موفتی بوو، بە چەندین شێواز هەوڵمدا چاوم پێی کەوێت، بەڵام بەخت یارم نەبوو، بۆیە

نامەیەکی تایبەتم بۆ نارد و ئامانجی سەردانەکەی خۆمم بۆ باس کرد و داوام لێکرد بە زووترین کات وەڵامی نامەکەم بداتەوە لەبەر ئەوەی کە بابەتی نامەکە مەترسیدارەو دەبێ بارزانی بزانێت ئەو لایەنە کێیە بەبێ هیچ مەرجێک دەیەوێت هاوکاریی سەربازی پێشکەش بکات. دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ بەیروت و لەگەڵ عەبدول عەزیزی هاوڕێم کۆبوومەوە، هەموو ئەو شتانەم بۆ باسکرد کە بەسەرمدا هاتن.

دوای تێپەڕبوونی مانگێک بەسەر ئەو نامەیەی کە باسم کرد، بارزانی لە ڕێگای کوردێکی عێراقییەوە وەڵامی نامەکەی بۆ ناردمەوە. ئەو کەسە هات بۆ شوێنی کارەکەم و وەڵامی نامەکەی دایەدەستم و داوای کرد بیخوێنمەوەو بیدەمەوە دەستی.

دامنیشاند لای خۆم و هەندێ ساردەمەنیم پێدا و دواتر بۆچەند ساتێک داوای یارمەتیم لێکرد بۆ ئەوەی پاکەتێک جگەرە بکڕم و بگەڕێمەوە. لای پاکەت فرۆشەکە ئامێری کۆپیکردن هەبوو، نامەکەم کۆپی کرد و بەپەلە گەڕامەوە. لەبەردەمی خۆیدا نامەکەم خوێندەوە و پاش تەواوبوونی دامەوە دەستی. هەتا ئێستاش وێنەیەکی ئەو نامەیەم بۆیادگاری و بۆ مێژوو هەڵگرتووە. بارزانی لە وەڵامی نامەکەیدا ڕەزامەندی دەربڕیبوو کە سەردانی بکەم، منیش سەردانیم کرد، لەو ڕێگایەوە من و بارزانی یەکترمان ناسی، پێشتر یەکترمان نەدەناسی، پێش ئەوە لە ژیانمدا نە من ئەوم دیبوو نە ئەو منی دیبوو. ئەوە یەکەمین

هەنگاوی ناسینی سەرکردەی شۆڕش بوو. بۆچوونی خۆی بە ڕاشکاوانە دەربڕی و گرنگی ئەو هاوکارییەی باسکرد کە من شەرەفی ئەو دەستپێشخەرییەم پێبڕابوو، وێڕای مەترسییەکانی. چۆنیەتیی جێبەجێکردنی هەنگاوەکانی سیاسەتی دەرەوەی بۆ ڕوونکردمەوە، بەوجۆرەی کە شۆڕش کەڵکی لێوەربگرێت.

ئەوە لە ساڵی ١٩٦٦ بوو، کاتێک کوڕە گەورەی بارزانی "عوبێدوڵا" سەردانی کردم، ئەوە جاری یەکەم بوو. پێشتر یەکترمان نەدەناسی، لەبیرم دێت سکرتێرە سریانییەکەی خۆی بەناوی "قەیسەر" لەگەڵدا بوو، کە دواتر لە ساڵی ١٩٧٢ بەدەستی پیاوانی هەواڵگریی سەر بە مەسعود بارزانی لە شاری بەغدا، لە کاتێکدا مانگی هەنگوینی بەسەر دەبرد تیرۆر کرا. لەوکاتەدا ئەوان دەزگای هەواڵگریی عێراقیان بە کوشتنەکەی تۆمەتبار کرد، دواتر گوتیان هۆکاری کوشتنەکەی لەسەر ئەوە بووە کە یەکێک لە لایەنگرانی عوبێدوڵا و بەرپرسێکی ناو شۆڕشی کوشتووە.

عوبێدوڵاو قەیسەر ساڵی ١٩٦٦ میوان بوون لای من و مانگ و نیوێک، بەوپەڕی ڕێزو میواندارییەوە خزمەتم کردن. لەو کاتەدا پێشوازیم لە هەرکەسێک دەکرد سەربە شۆڕش و سەرکردەی شۆڕش بوایە و چیم لەدەستبهاتایە بۆم دەکردن. بەبێ هیچ دوودڵییەک هەرچییەکیان بویستایە بۆم دەکردن. هەندێ جار بەهۆکاری سەرقاڵ بوونم بەو کارانەوە منداڵەکانم بێبەش دەکرد لە نیعمەتی خوێندن و تەواوکردنی خوێندنەکانیان. زۆر جار بە

ڕۆژ ڕەنجیان بەداو کاریان دەکرد بۆ ئەوەی ژیانی خۆیان و نانی ڕۆژانەیان دابین بکەن و بە شەویش لە خوێندنگەی ئێواران دەیانخوێند. ئەمە جگە لەو هەموو تێچوونەی کە دەهاتە سەرم بۆ چاپکردنی بڵاڤۆک و چاپەمەنییەکانی حزب، هەموویم لەسەر گیرفانی خۆم دەدا لە کاتێکدا من داهاتم دیاریکراوبوو. لەپێناو ئامانجەکانی شۆڕشدا پارەی خۆمم سەرف دەکرد کە بەخواست و ویستی خۆم ژیانم بۆ تەرخان کردبوو. لێرەدا کە باسی ئەوە دەکەم بۆ خۆهەڵکێشان و خۆ نواندن نیە، بەڵکو تەنها بۆ ئەوەیە کە بیسەلمێنم من بەئەرکێکی تێکۆشانی خەباتی شۆڕشگێڕانەی خۆم هەستاوم و خۆمم بۆ تەرخان کردبوو گوێم لەوە نەبوو بەچ نرخێک و قوربانیدانێک ئەوە دەکەم.

بە کورتی، هەرنوێنەرێکی شۆڕش هاتبێتە بەیروت من بایەخمپێداوە و هاوکاریم کردووە. بۆ نمونە شەوکەت عەقراوی کە وتەبێژی فەرمی و نوێنەریان بوو، لەو کاتەدا لە کۆماری عەرەبی یەکگرتوو نیشتەجێبوو، خێزانەکەی لە بەیروت نیشتەجێبوو، لەسەر گیرفانی خۆم ماڵێکم بۆ بەکرێگرتبوو، بەوجۆرەی کە ئەرکی میوانداری پێویست بکات، وێڕای ئەوەی داهاتم کەم بوو، دریغیم نەدەکرد. لەو کاتەدا زۆرم حەز دەکرد، لەسەر داوای هاوڕێم شەوکەت عەقراوی سەردانێکی میسربکەم، بەڵام بەهۆی نەبوونی پارەوە نەمدەتوانی ئەو سەفەرە بکەم. لە بیرمە کاتێک لە بارەگای بارزانی دەستبەسەرکرابووم، شەوکەت

عەقراوی بەبەردەممدا تێدەپەڕی و وەک ئەوەی هەر نەمناسێت، خۆی هەڵە دەکرد و بەبێ قسەو سڵاو تێدەپەڕی منیش لەبەرخۆمەوە دەمگوت: پەنا بەتۆ خوایە!

لەهەندێ حاڵەتدا کە ناچار دەبووم بەشداری لە هەندێ کۆنگرەی تایبەت بە شۆڕش بکەم لە ئەوروپا، لە ناچاریدا بۆ کۆکردنەوەی نرخی بلیتی سەفەرەکەم پەنام بۆ هەڤاڵانی حزبی و کۆکردنەوەی پیتاک دەبرد لە هاوڕێیان و دۆستانم. لێرەدا رووداوێکی خۆشم وەبیر دێتەوە کە بەسەرمداهات کاتێک بەشداری یەکێک لە کۆنگرەکانی یەکێتی قوتابیانم کرد لە ستۆکهۆڵم ساڵی ١٩٧٠. بارودۆخەکە بەجۆرێک بوو کۆنگرەکە چەند رۆژێک دواخرا. زۆرم پێویست بە پارەبوو بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی خۆم مەیسەر بکەم لە خواردن و خەوتن. داوام لە یەکێک لە بەرپرسانی قوتابیان کرد هەندێ پارەم بە قەرز بداتێ و دواتر بۆی بگەڕێنمەوە، بەڵام بە رێزەوە داوای لێبووردنی کرد و گوتی توانای دارایم رێگام نادات و پارەم نیە، کەچی لەملاوە حەبیب محەمەد کەریمم دەبینی کە چۆن دۆلار بەسەر قوتابیاندا دابەش دەکات. بەناچاری تەنها ئەوەم لەبەردەمدا بوو کە بچم بۆ ئەڵمانیای خۆرئاوا بۆ لای کوڕەکەم، کە دەیخوێند و کاریشی دەکرد لە شاری مێنشن. کوڕە گەورەم محەمەد داواکەی جێبەجێکردم و ئەوەندەی پێدام کە بتوانم بەرێگای وشکانی لە تورکیاوە بگەڕێمەوە.

ئیمـانێکی پـاک و ڕەهـام بە تێکۆشـانی سیاسـی هەبـوو، بەتەواوەتـی لایەنگری هەمـوو هەوڵێکی بەردەوام بـووم لە پێنـاو شۆڕشی پیرۆزی کوردا. دووچاری چەندین جۆر ئەشکەنجە و تیـرۆرو ئـازاربوومەوە. چەنـدین جـار لە لوبنـان دەسـتگیر کـرام. دووچـاری خراپتـرین ئەشـکەنجەو سـوکایەتی بـووومەوە، خۆڕاگربـووم و بەرگەی ئەو هەمـوو عەزاب و سـوکایەتی و ئەشـکەنجانەم بە سـەبرو ئیمـانەوە دەگـرت لە پێنـاو سـەرکەوتنی پرسـە گەورەکەمـان (یەکێتـی کوردسـتان)، خـۆمم بـۆ تەرخـان کردبوو، هیوام دەخواست یەکەم شەهیدی ئەو ڕێگایە بم.

لێرەدا بـۆ خۆبـادان نـا، بەڵکو بـۆ یـادوەرو مێژوو دەڵێم، زۆر جـار ناچـار دەبـووم سـەفەر بکەم بـۆ دەرەوەی لوبنـان و پـارەی کرێ ئۆتۆمبیلم نەبوو، لەگەڵ هەندێ هەڤاڵی خۆم کە باوەڕمان بە ئامانجی شۆڕشەکەمان هەبوو، بەپێ بەنـاو شـاخی هەزار بەهەزار و شـەوانی ئەنگوسـتەچاو، لە سـەرمای کەمەر شـکێنی زسـتاندا، ڕێگامان دەبڕی بـۆ ئامـادەبوون لە کۆبـوونەوە نهێنییەکانی حـزب لەگەڵ ئەنـدامان و هەڤـاڵانی تێکۆشـەری حزبـدا. لەیەکێـک لە سـەردانەکانمدا بە نهێنـی بە ناسـنامەیەکی سـاختەوە، میـوانی خزمێکی خۆم بووم، داوام لە هەڤاڵانم کرد ئامادەبن، دوای ئەوە ڕۆشـتین بـۆ شـوێنێکی نەزانـراو. نیـوەی شـەو بـوو، لە کـاتی کۆبـوونەوەدا ئەو خـزمەم ئاگـاداری کـردم کە زانیـاری گەشـتۆتە دەزگای هەواڵگری و زانیویـانە بە نهێنـی هـاتووم بۆ ئێرە. کاتێک

هاوڕێکانم ئەو هەواڵەیان بیست، زۆر بە خێرایی ئۆتۆمبیلێکیان بۆ پەیداکردم. کاتژمێر یەک و نیوی شەو بوو، سوپاس بۆ خوا بە سەلامەتی گەڕاینەوە بەبێ ئەوەی هیچ کەس پێمان بزانێت.

## لە بەغداوە بۆ کۆشکی ئاشتی لە ناوپردان

ژیانی تێکۆشەرێکی بەشەرەفی حزبی قورس و تاقەتپڕوکێنە، تەنها ئەو کەسانە دەتوانن لەو رێگایەدا بەردەوام بن کە خاوەنی ویژدانێکی پڕ لە خەبات و قوربانیدانن، لە پێناو نمونەی بەرزی نەتەوەی خۆیان کە باوەڕیان پێیەتی.

رۆژی راگەیاندنی بەیانی یازدەی ئازار، رۆژێکی شکۆمەند و مێژوویی بوو. رۆژی هەڵهاتنی خۆری ئازادی و تێکشکاندنی کۆت و بەندی کۆیلایەتی بوو لەگەردنی گەلی کوردی رەسەنمان. شەڕ لە نێوان سوپای عێراق و تێکۆشەرانی کورد راوەستا. رۆژێکی جوان بوو، بە خۆگراتن و قوربانیدان لە پێناو ئەو بەها هاوبەشەی کە هەردوولای شەڕکەر بانگەوازیان بۆ دەکرد. رۆژێکی مێژوویی گەرموگوڕ بوو، خۆشی و کامەرانی دڵی عەرەب و کوردی داگرتبوو. بەبۆنەی ئەو رووداوە مەزن وشکۆمەندەوە، هەستاین بە رێکخستنی ئاهەنگی جەماوەریی لە چەندین شوێنی جیاوازی لوبنان، بۆ ئاهەنگ گێران بەو بۆنە نەمرو پیرۆزە لە مێژووی خەباتی رەسەن، بەرەو ئامانجە نەتەوایەتییەکانمان. رۆشتین بۆ باڵیۆزخانەی عێراق بۆ ئەوەی لە

ناخی دڵێکی پاکەوە بە ئەرکی پیرۆزبایی هەستین، کە هەڵقوڵاوی خەسڵەت و رەسەنایەتی گەلی کوردی شکۆمەندمان بوو، بۆ ئەوەی هەستی خۆمان دەربڕین بەرامبەر سەرکەوتنی برایەتی کورد و عەرەب بەسەر هێزی ئەهریمەن و کۆنەپەرستی و کۆتایی هێنان بە شەڕی خۆکوژی لە نێوان ئەو دوو گەلە شکۆمەند و رەسەنە و راگرتنی ڕشتنی ئەو هەموو خوێنە پاک و بێگەردەی هەردوو گەلی برای کورد و عەرەب.

دوای ئەو برایەتییە دڵسۆزانەیە لە نێوان هەردوو لایەنی کورد و عەرەب، دوای تێپەڕبوونی مانگێک بەسەر ئاهەنگ و خۆشییەکاندا لە لوبنان، کە تیایدا هەموو کوردەکان هەستی راستگۆیانەی خۆیان دەربڕی، حزبمان لە لوبنان بە تێکڕای دەنگ داوایان لێکردم سەردانی عێراق بکەم و چاوم بە زەعیمی شۆڕش، بارزانی بکەوێت. لەسەر ئەو کۆدەنگییە، بڕیاری سەفەرمدا و رۆشتم بۆ باڵیۆزخانەی عێراق، بۆئەوەی کاری پێویست بکەم بۆ وەرگرتنی ڤیزا و رۆشتن بۆ عێراق.

توشی بێهیواییەکی زۆر بووم کاتێک لە باڵیۆزخانەی عێراق پێیانگوتم کە من کەسێکی نا پەسەندم لە لایەن دەسەڵاتدارانی عێراقەوە. کاتێک گوێبیستی ئەوە بووم زەردەخەنە گرتمی و هیچ غەمبار نەبووم بە رەتکردنەوەی داواکەم.

جارێکیان بە رێکەوت دارا تۆفیق ترانزێتی هەبوو لە بەیروت بەرەو ئەورووپا، لە شوێنی کارەکەی خۆم سەردانی کردم، سەلاح

بەدرەدینی لەگەڵدا بوو. باسی زۆر شتمان پێکەوە کرد، لە ناویاندا چیرۆکەکەم لەگەڵ باڵیۆزخانەی عێراق و پەسەند نەبوونم بۆ رۆشتنە ناو خاکی عێراق. ئەو هەڵوێستەی پێناخۆش بوو، بە دبلۆماسیەت و زمانپاراوی خۆی داوای لێبوردنی کرد. هەموو توانای خۆی لەگەڵ باڵیۆزخانەی عێراقدا بەکارهێنا لە پێناو ئەوەی فیزا بۆمن دابین بکات. لە دوای هەوڵێکی زۆر و پەیوەندیکردنێکی زۆر فیزام وەرگرت و سوپاسم کرد بۆ ئەو کارەی.

بڕیاری سەفەرمدا و گەیشتمە فڕۆکەخانەی بەغدا. زۆر سەرم سوڕما کاتێک لەلایەن دەزگای ئاسایشەوە نزیکەی یەک سەعات راگیرام و زۆریان لێکۆڵینەوە لەگەڵدا کردم، تا لە کۆتایدا رێگایان پێدام داخڵی عێراق بم. بەڕێکەوت لەناو فڕۆکەکەدا کەسێکم ناسی پاشناوی قەزاز بوو، سەرچڵی برای و تەواوی ئەندامانی خێزانەکەی لە دەرەوەی فڕۆکە خانە چاوەڕێیان دەکرد. دەستی هاوکارییان بۆ درێژ کردم و لەگەڵ خۆیاندا گەیاندیانمە یەکێک لە هۆتێلەکان. رۆژی دواتر بەیانییەکەی برای هێژا کاک سەرچڵ قەزاز هات بە شوێنمداو لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ نوسینگەکەی و رێزی زۆر لێنام. دواتر لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ لای هەندێ لە وەزیرە کوردەکان، کە بەگوێرەی رێکەوتنی یازدەی ئازار لە وەزارەتە عێراقیەکاندا دامەزرێنرابوون. دڵم خۆش بوو کە دوو رۆژم لە بەغدا بەسەر بردو لەو ماوەیەدا زۆرێک لە برا باشە کوردەکانم ناسی.

سـەرچڵ حەزی کـرد یـارمەتیم بـدات، بـۆیە یەکێـک لە بەرپرسەکانی لقی پێنجی پارتیی راسپارد، کە ئەندازیاری ناسـراو مـحەمەد ئەمین بوو، ئۆتـۆمبیلێکی تـایبەت و یـاوەرێکم بـۆ دابین بکـات بـۆ ئەوەی رێگـا بگـرینەبەر بەرەو کوردسـتان بـۆ نـاوچەی گەلاڵە. لە هەمـان ئەو هـۆتێلەی کە تیایـدا دابەزیبـووم، سـەردار ئاغای کوڕەمامی ئیدریس بارزانیم ناسی.

نیوەی شـەو کاتێک گەیشـتینە گەلاڵە، یـاوەرەکەم دەیزانـی کە هەندێ لە قوتابیانی کورد هـاتوون بـۆ سـەردانی کوردسـتان، منـی بـرد بـۆ لایـان و بەوانـی ناسـاندم. دوای ئەوە پەیوەنـدی گیـرا بە بارەگـای مەکتەبی سیاسـی لە نـاوپردان. دوای مـاوەیەکی کەم بە ئۆتـۆمبیلێکی سـەربازی هـاتن بە شـوێنمداو بردیـانم بـۆ کۆشـکی ئاشتی لە ناوپردان کە مەکتەبی سیاسیش هەر لەوێ بوو.

کوشـکی ئاشـتی پێشـتر خوێنـدنگەیەک بـووە کە چـوار ژوور بووە، بەڵام کاتێک کە سەدام حسێن لەگەڵ بـارزانی کۆدەبێتەوەو دانوسـتانەکان بە جـوانترین شـێوە دەچـوونە پێشـەوەو بەیـانی یازدەی ئازار مۆرکرا، ئەم قوتابخانەیە بوو بە بارەگاو ناویان لێنا کۆشـکی ئاشـتی لە نـاوپردان، کە شـاخی بەرز ئەمـلاو ئەولای تەنیوە، جـگە لە چەنـد روبـارو دارسـتان و رێگـای تەنگەبەر. ئەم زانیارییـانە بـۆمێژوو دەهێـنمە گـۆ، چـونکە لەم بیرەوەریـانەمەدا دەمەوێـت بە ئەمـانەتەوە وێنەیەکـی راسـتگۆیانە بگـوێزمەوە. مـن خـۆم بە پیـاوانی مێـژوو نـوس نـازانم، بەڵکـو تێکۆشـەرێکم

شەرافەتمەندانەو راستگۆیانە دەنوسم. بەدرێژایی تەمەنی خەبات و تێکۆشانی حزبیم بەبێ هیچ پەردەو لادان و هەڵگێرانەوەی راستیی رووداوەکان و لە پێناوی واقع و راستیدا دەنوسم.

لە بیرم دێ کە گەیشتمە کوردستان رێک لە دوای یەکەم رۆژی گەیشتنم، چاوم بە دکتۆر مەحمود عوسمان، ئەندامی لیژنەی مەرکەزی و ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی کەوت. ئەو یەکێک بوو لەو سەرکردە سیاسییانەی لەبارەگای خۆی بینیم، کە وەکو خەندەق لە ژێر زەویدا بوو، بۆ بەهەڵەدابردنی دوژمن چادرێکی لەسەر دانرابوو. دواتر لەگەڵ حەبیب محەمەد کۆبوومەوە، لە یەکەم ساتی چاوپێکەوتنم لەگەڵیدا، لوتبەرزانە دەستی کرد بە فەلسەفەلێدان. جانتایەکی بەدەستەوە بوو هەر رایدەوەشاند و قسەی دەکرد: ئێمە زۆرمان بیستووە لەسەر کەسێکی تێکۆشەربەناوی جەمیل مەحۆ، بەخێرهاتی بۆناو براکانی خۆت.

دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم رەزامەندیم بۆ دیتنی بارزانی بۆهات. لێرە هیچ کەسێک ناتوانێت بەبێ رەزامەندی مەکتەبی سیاسی دیداری بارزانی بکات، دوای ئەوەش دەبێت بارزانی خۆی بە شەخسی لەسەر ئەوکەسە بۆچوونی خۆی بدات، ئیتر یان پەسەندی دەکات، یان رەتی دەکاتەوە. چوومە بارەگاکەیان لە قەسرێ، کە شوێنێکی زۆر جوانە، بەتایبەت لە زستاندا کە دەشت و دوڵ و شاخەکان زۆر جوان دەنوێنن. بارەگای ئیدریس

و مەسـعودیش هەر لەوێ بـوو. دوای ئەو هەمـوو هەوڵە دیـدارەکەم بـۆ سـازکراو چـاوم کەوت بە ئیـدریس و مەسـعود بـارزانی. ئەمەش یەکەمجار بـوو لە تەمەنـی خەبـات و حزبیمـدا. دوای پێشـوازی ئەوان گەیاندیانم بۆ بارەگـای باوکیـان، زەعیمـی شۆڕشـی کـورد مەلا بـارزانی لە گونـدی دیلمـان. هەتـا کـاتژمێر دووی شەو چاوەڕوانی ئەو بووین تا نۆرەم هـات بۆ دیدارەکە، عـادەتی سـەرکردەی شـۆڕش وابـوو کە هەرگیـز بە ڕۆژان پێشوازی لەکەس نەدەکرد.

کە نـۆرەم هـات هەسـتم بە دڵخۆشـییەکی لە ڕادەبەرکـرد بـۆ دیتنی مرۆڤێک وەک ئەوەی لە جیهانێکی تر بم. ئەو گەورەپیـاوەی کە من زۆر پەرۆش بووم بۆ دیدارو زیارەتی، ئەو مرۆڤە مەزنەی کەمن قوربانیمدا بەهەموو موڵک و مـاڵم لە پێنـاو مەسـەلەیەکدا کە ئەو بـوون و مـانەوەیەتی، بەبێ ئەوەی پێشـتر شـەرەفی ناسین و قسـەکردنم لەگەڵیـدا هەبووبێـت. زۆر ڕاسـتگۆیانە ددان بەوەدا دەنێم کاتێک بەو گەشتم و لەنێو دەستەکانیدا بووم، لەشـم کەوتە لەرزین و توشی حاڵەتێکی سۆفیانە بووم کاتێک دەبینم لەبەردەم ئیمامی جیهاددام، هەموو هەست و سۆزی داگیرکردم، لە قـوڵایی نـاخمەوە گـوتم ئەمە لەدوای سەلاحەدینی ئەیـوبی، لە ئەولیاکـانی جیهـادی پیـرۆزە لە پێنـاو بەرزڕاگرتنـی وشـەی هەق و دادپەروەری، ئەوەی ئیسـلام بـانگەوازی بـۆ دەکـات. لە نـزیکیەوە دانیشـتم، پـێگە و دڵ و ئیمـانم بڵنـد بـوونەوە، هەسـتم کـرد

سەرلەنوێ تازە لە دایک دەبمەوە، ئەویش لەوپەڕی سادەییدا بوو، زۆر راستگۆو دلسۆزانە ناخی خۆی دەردەبڕی ئەو لە چاوانی مندا گەورە گەورە بوو. بە دڵێکی بێگەردەوە باسی کوردەکانی لوبنان و پرسی کوردمان بە گشتی دەکرد. قسەکانمان لە دڵەوە بۆ دل بوو، سادە و بێ پەردە بوو، خۆڕسکانە لە قولایی دل دەهاتە دەرێ. خۆشی ویستم، رێزمگرت، پڕ بەدڵ خۆشم ویست. دیدارەکەمان نزیکەی سێ سەعاتی خایاند، بەلام وەک سێ خولەک و سێ چرکە بوون. چاوپێکەوتنەکە بە ئامادەبوونی هەردوو کوڕەکەی ئیدریس و مەسعود و یاوەرەکەی من بوو.

لەکاتی قسەکردنماندا ئەو بیروباوەڕانەی ئالوگۆڕمان کردن لە جەوهەر و ناوەرۆکدا هاوشێوە بوون. دوای کۆتایی کۆبوونەوەکەمان، بارزانی پێیخۆش بوو شەرەفمەندم بکات بە دیداری دووەم و بۆ جارێکی تر لە رۆژی دادێ بۆ بەیانییەکەی لە خزمەتیدا بم، ئەمەشی بۆ ئەوە بوو کە بەگرتنی وێنەیەک بۆ یادگار و بۆ مێژوو پێکەوە رێزملێبنێت وەک دەربڕینی خۆشەویستی خۆی و وەفایەک بۆ تێکۆشانم لە پێناو کوردستان. لە ناخی دڵمەوە هەستم بەوە دەکرد کە ئەو پیاوە بە تەواوی لەمن تێگەشت و زۆر باشی ناسیم و هەڵیسەنگاندم، هەربۆیە من بوومە بەندەی چونکە ئەو پێگەی منی زانی و بە وتەو کردار شەرەفمەندیکردم و رێزی لێنام.

ڕۆژی دووەم چاوەڕوانم کرد تا پاش نیوەڕۆ هات و بە ئامادەبوونی خۆی هەندێ وێنەمان چرکاند کە بە درێژایی ژیانم شانازی پێکەوە دەکەم و شەرەفمەندم بەو بەسەرکردنەوە جوامێرانەیە، هەستم دەکرد دڵم گەورە دەبێت. دواتر هەر بە پاوەری خۆی ڕۆشتین بۆ بارەگای ئیدریس لە قەسری، کە گەیشتینە بارەگا لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزی و منیش بە دوایدا ڕۆشتم. ویستی وەک ڕێزلێنان من لە پێش ئەو بچمە ژوورەوە. فەرمانیدا پێشیکەوم، بەڵام زۆر مکوڕانە ڕەتمکردەوە پێش ئەو بچمەژوورەوە، لە کاتێکدا ئەو پێشەنگمانەو ئێمەش شوێنکەوتووی ئەوین و ڕێبازەکەی دەگرینەبەر. مرۆڤێکی باش و بەڕێزبوو، نمونەی ڕەوشت بەرزی بوو بەرامبەر بە میوانە غەوارەکانی.

چوینە بارەگای ئیدریس و لەناو هۆڵەکە دانیشتین و هەندێ لە سەرکردەکانی شۆڕش لەوێ ئامادە بوون. بارزانی دەستی بە قسان کرد: ئەم پیاوە تێکۆشەرە کاک جەمیل مەحوێیە، سکرتێری پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان. ئەوە یەکەمجار بوو بە ئاشکرا و لەبەردەم سەرکردەکانی حزبدا ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە من بەپرسی یەکەمی کوردەکانی لوبنانم. دوای قسەکردن لەسەر کاروباری گشتی کوردان، داوای مەرەخەسیم لە سەرکردەی شۆڕش، بارزانی کرد، کە بە سۆزێکی باوکانەی گەرمەوە ڕێزیلێنام و گوتم: داواتان لێدەکەم ڕێگام بدەن کە ئیتر من بەڕێبکەومەوە بەرەو وڵاتی خۆم لوبنان، ئیتر ئەویش هەتا لای

ئۆتۆمبیلەکە بۆ ماڵئاواییکردن هات لەگەڵمدا و هیوای سەرکەوتنی بۆ خواستم و گەڕایەوە بۆ ناو هۆڵەکە بۆ تەواوکردنی کۆبوونەوەکە. ڕۆشتم بۆ ناوپردان بۆ مەکتەبی سیاسی، لەوێشەوە بەرەو بەغداو دواتریش بۆ وڵاتەکەی خۆم لوبنان.

## میوانداریم لە کۆنگرەی هەشتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناوپردان

دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک و ڕێکەوتی ٢٣-٥-١٩٧٠ لە شوێنی کارەکەی خۆم بووم، کەسێک هاتە ژوورەوەو سڵاوی لێکردم. ناوی سەلاح بەدرەدین بوو. پێکەوە کەوتینە ناو قسەوباس لەسەر کاروباری سیاسی و بارودۆخی کورد بە شێوەیەکی گشتی. پێی گوتم بەم نزیکانە کۆنگرەی هەشتەمی پارتی دیموکراتی کوردستان دەبەسترێت، تۆ ڕات چییە؟ ویستی بەرچاوروونی لەمن وەربگرێت لەو بارەوە داخوا دەتوانم لە کۆنگرەکە ئامادەبم یان نا. منیش ڕاشکاوانە وەڵامم دایەوە و زۆر سادە گوتم: ئەگەر بانگهێشت بکرێم بۆ بەشداری ئەوە کێشەم نیەو زۆر بەخۆشحاڵییەوە پەسەندی دەکەم و پێمخۆش دەبێت.

سەلاح بەدرەدین پێیی گوتم لەو کۆنگرەیەدا کە لە عێراق دەبەسترێت، نوێنەرێکی پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا بەشدار دەبێت و منیش بە نوێنەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردی لە لوبنان بەشدار دەبم. لە قسەوباسەکانماندا زۆر پرسی سیاسیمان

تـاوتوێکرد. بڵاوکراوەیەکـی پێـدام کە زۆر بە تونـدی هێرشـی دەکردە سەر قوتابیانی کورد لە ئەوروپا. بڵاوکراوەکە بەناوی خوازراو نوسرابوو، داوای لەمن کرد لە چوارچێوەی بڵاوکراوە حزبییەکاندا کە دەریاندەکەین ئەویش بڵاو بکەمەوە، دوای ئەوە روخسەتی لێخواستم و پێی گوتم ئەو پێش من خۆی ئامادەی سەفەر دەکات و لەوێ یەکتر دەبینینەوە لەو کۆنگرەیەی کە بارزانی بەتەمایە بیبەستێت.

دوای سەفەرکردنی سەلاح بەدرەدین بۆ بەغداد بەرۆژێک، کەسێک هات بۆلام کە هیچ دۆستایەتی و پەیوەندییەکمان پێکەوە نەبوو، پێشتر نەمدیبوو، چەفتەو عەگالێکی بەسەرەوە بوو. بە دەم و لەبزێکی پاراو قسەی دەکرد و گوتی: بەڕێز جەمیل مەحۆ لە کوێیە؟ پێمگوت چیت لەو دەوێ؟ کارت هەیە لەگەڵیدا؟ دەیناسیت؟ گوتی نەخێر نایناسم، گوتم تۆ کێیت؟ وتی من پرسیاری جەمیل مەحۆ دەکەم. ئیتر لەو کاتەدا پێمگوت فەرموو من جەمیل مەحۆم، چیت دەوێت و تۆ کێیت؟ دەستمان بە قسان کرد هیچی تێنەگەشتم ئینجا وتی: تۆ دەزانیت من کێم؟ پێمگوت نەخێر هێشتا شەرەفمەند نەبووم بە ناسینت. گوتی ناوم مستەفا بارزانییە. پێمگوت مەبەستت ئەوەیە کە تۆ رابەری شۆڕشی کوردیت؟ گوتی نەخێر بەڵام من لە خێزانی بارزانیم و ناوم مستەفا بارزانییە. دەستی کرد بە گیرفانیدا و ناسنامەیەکی عێراقی بەو ناوە دەرهێنا و پیشانیدام، ئینجا گوتی: من لە رێگەی سوریاوە هاتووم بۆ

سەردانت، چونکە زۆرم لەسەر تۆ بیستووە، لەسەر خەبات و لەسەر لایەنگری بێسنورت بۆ بارزانی، وانیە؟ دواتر راستییەکەی پێگوتم و دەرکەوت کە ناوی راستەقینەی خۆی مستەفا محەمەد جەمیل بەگە. کاتێک ناوی خۆی بۆ ئاشکرا کردم، کەوتەوە بیرم و زۆر باشم ناسی، چونکە برایانی پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا وایان لەمن گەیاندبوو کە ئەم کەسە ئاژانێکی بەکرێگیراوی دەزگای هەواڵگرییە و جاسوسی بەسەر ئازادیخوازانەوە دەکات، بە تایبەت ئەوانەی کە حزبین. ئیتر بە شێوەیەکی دراماتیکی دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانی خۆی و براکەی کە چۆن پشتیوانی بارزانی بوون و چۆن براکەی لە شەڕێکدا بۆ بەرگری لە ژیانی بارزانی زامدار بووە. منیش لێگەڕام لەسەر قسەکانی بەردەوام بێت بەبێ ئەوەی بایەخێکی ئەوتۆی بدەمێ، ئەوەش لەبەر هۆکارێکی سادە کە ئەوە بوو لایەنگری بارزانی بوو. من لەو باوەڕەدا بووم ئەوانەی کە باسی بارزانی بە خراپی ناکەن دوژمنی ئەو نین، بۆیە من مامەڵەم لەگەڵدا کرد بۆئەوەی راستینەی ئەو کەسە بناسم وبزانم بۆچی هاتووە.

کەسێک لە بەیروت دەژیا ناوی مستەفا جاف بوو، کوردی عێراق بوو، بەشێوەی هەمیشەیی لە لوبنان و بەدیاریکراویش لە بەیروت نیشتەجێ بوو. ئەم کەسە وەکو من دەمناسی مرۆڤێکی راڕای بێ بڕیارو بێ باوەڕ بوو، جگە لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هیچ شتێک بۆ ئەو بایەخی نەبوو، لەگەڵ سەرکردایەتی

پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق کاری دەکرد، بۆ هەموو کەسێکیش ناسراو بوو کە مەیلی چەپگەرایی هەبوو، بۆیە زۆربەی سەرکردەکانی شۆڕشی کورد، وەکو دارا تۆفیق، سامی، حەبیب و چەندانی تر کە دەهاتن بۆ بەیروت پێش ئەوەی بچن بۆ سەردانی هیچ کەسێک لەماڵی ئەم سیخوڕە دوو سەرەیە دەمانەوە. ئەم پیاوە لەسەر دووپەت یاری دەکرد. هەمیشە کە دەهاتە سەردانم وەکو کەسێکی بێلایەن لە بەیروت خۆی دەردەخست.

ئەو کەسە ژێر بە ژێر لەگەڵ دوژمنانی بزووتنەوەی کورد لە لوبنان کاری دەکرد، دوژمنایەتییەکی شاراوەی بۆ من هەبوو، بەردەوام دژی من بوو، منیش ئەوەم زۆر بە باشی دەزانی و ئاگاداری وردو درشتی کارەکانی بووم، بەڵام لەبەردەمی خۆیدا خۆم هەڵە دەکرد. ڕۆژێکیان هات بۆ سەردانم و هەڕەشەی ئەوەی دەکرد کە واز لە سیاسەت دێنێت و لە ماڵەوە دادەنیشێت وەک بێلایەنێک بەرامبەر ئەوەی کە تۆمەتباری نەکەم، بەڵام زۆر باشم دەناسی، دەمزانی کە دووزمان و جادوگەرو هیچ و پوچە. بە ڕێکەوت ماوەیەکی کەم بەر لەوەی بڕۆم بۆ بەشداربوون لە کۆنگرەی هەشتەمی پارتی دیموکراتی کوردستان چاوم پێکەوت، داوای لێکردم سەردانی بکەم بۆ ماڵەوە بۆ ئەوەی هەندێ شتی گرنگم بۆ باس بکات، منیش داواکەیم پەسەند کرد. کاتێک چوومە ماڵەکەی بینیم ژمارەیەکی زۆر لەو کوردانەی لوبنان کە بە

ئاشکرا دژایەتی بارزانییان دەکرد لە هۆڵەکەدا دانیشتبوون و بەشێوەیەکی گشتی باسی بارودۆخی کورد لە لوبنان و حزبیان دەکرد.

یەکێکیان دەستی کرد بە باسکردنی ئەو کەسەی ناوی مستەفا محەمەد جەمیل بەگ بوو، گوتی: ئەو کەسە وەکو سیخوڕ و ئاژاوەگێڕ ناسراوە. دوای بیستنی ئەو قسانە هەستام و ڕۆیشتمەوە بۆ شوێنی کارەکەم. ناردم بە شوێن مستەفا محەمەد جەمیل بەگ و بە درێژی هەموو شتانەم بۆ گێڕایەوە کە لەماڵی ئەو کەسە جافە بیستبووم، ڕاشکاوانە داواشم لێکرد کە خۆی یەکلا بکاتەوەو بەرگری لە خۆی بکات، دەنا من هەرگیز ناهێڵم لەگەڵمدا بێت بۆ عێراق کە ئەو بەوجۆرە ناوبانگی خراپ بێت. ئیتر منیش ئەوم لەگەڵ خۆمدا بردو پێکەوە ڕۆشتین بۆ ماڵی ئەو کەسە جافە. کاتێک جاف چاوی بە من کەوت ترس دایگرت، منیش کەمێک ترسەکەیم ڕەواندەوە و گوتم: ئەمە ئەو پیاوەیە کە ئێوە تۆمەتباری دەکەن بە سیخوڕی، ئێستا من بەجێتان دێڵم بۆ ئەوەی خۆتان ئەو بابەتە یەکلا بکەنەوە. کاتێک گوێبیستی ئەوە بوو دەموچاوی مستەفا جاف تێکچوو، چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد، سورهەڵگەڕابوو بە دەنگێکی تێکەڵوپێکەڵ وتی: کە من باسی ئەوم کرد تەنها ئەو قسانەم دەگوتەوە کە لەخەڵکم بیستبوون، من خۆم نایناسم. بەر لەوەی لە ماڵەکەشی بڕۆم پێمگوت من بەم نزیکانە سەفەر دەکەم بۆ عێراق بۆ بەشداریکردن

لە کۆنگرەی هەشتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق.
مستەفاش گوتی: منیش لەگەڵتا دێم خۆ ئێستا ئیتر پەسەندی دەکەیت؟ منیش لەوەلامدا گوتم نەخێر دەتوانیت بفەرموویت لەگەڵما بێیت.

پێش سەفەرکردنمان بۆ کوردستانی عێراق، هەندێ بلاوکراوەی حزبم ئامادەکردبوو، لەگەڵ هەندی بلاڤۆکی تر، بۆئەوەی دابەشی کەم بەسەر ئەندامانی کۆنگرەدا، هەموو ئەو بلاوکراوانەشم خستبووە ژێر جلەکانمەوە. پێش ئەوەی سواری فڕۆکە بین لێم نزیک بۆوەو گوتی: هەندێ بلاوکراوەی تایبەت بە حزبت لەگەڵ خۆتا هێناوە؟ گوتم بەڵێ هەندێ شتم لەگەڵ خۆما هێناوە.

کاتێک فڕۆکە هەستاو دەستی بە فڕین کرد، بە هاوڕێکەم وت بەڵکو کەمێک یارمەتیم بدەیت و هەندێ لەو چاپەمەنی و بلاوکراوانەی کە هەڵمگرتوون بدەم بە تۆ، ئیتر دەموچاوی زەرد هەڵگەڕا و نیشانەکانی شڵەژاندنی لێدەرکەوتن و لە ترسان هەڵدەلەرزی، منیش ئارامم دەکردەوەو هانم دەدا تا دواجار قایلم کرد، ئەویش هیچ دەرەتانێکم لەبەردەمدا نەما ئەوە نەبێت کە پێمگوت: یان بەشێک لە بلاوکراوەکان هەڵدەگریت یان لێم دووردەکەوەو ئیتر نەتبینمەوە. ئیتر ئەویش غیرەتی دایە بەر خۆی و هەندێ لە بلاوکراوەکانی هەڵگرت و ئاخنییە نێو جلەکانی. هەستم کرد هیچ دڵخۆش نییە بەو ئەرکە و شڵەژان بە سیمایەوە

دیـار بـوو، بە درێژایـی گەشـتەکەمان یەک وشـە قسـەی نەکـرد.
کاتێک گەیشتینە فرۆکە خانە پێمگوت: پێشمکەوە بۆ ژوورەوە بۆ
مۆرکردنی پاسـپۆرتەکە، هـیچ کـارو کـردەوەیەک نەکەیـت ئامـاژە
بێـت بـۆ ئەوەی کە یەکتـر دەناسـین و پـێکەوەین هەتـا دوای
مـۆرکردنی پاسـپۆرتەکە. لە کـاتی پشـکنیندا روداوێکـی خۆشـم
بەسەرداهات، هەندێ لە کەلوپەلەکانم لە جانتاکە بەربوونەوە بۆ
سـەرزەوی منـیش هـیچ خـۆم تێکـنەداو خـۆم نەوی نەکـرد بـۆ
هەڵگرتنەوەیـان لە ترسـی ئەوەی نەبـادا کارەکەمـان ئاشـکرا بێت،
ناچـار کەلوپەلەکـانم لەسـەر زەوی، هەر لە شـوێنی خۆیانـدا
بەجێهێشـت، کاتێک هـاورێکەم ئەو رووداوەی بینـی کە بەسـەرمدا
هات، لەترساندا هەمـوو گیانی کەوتبـووە لەرزین. لە فرۆکە خـانە
چـوینە دەرەوە و بەرەو یەکێک لە هۆتێلەکـانی پایتەخـت رۆشـتین
کە نـاوی سـندیباد بـوو. لە بەغـدا مسـتەفا جەمیـل پێـی وتـم:
بەدرێژایـی ژیـانم هـیچ کـاتێ دووچـاری هەڵوێسـتی ئـاوا نـاخۆش
نەبوومەتەوە.

مسـتەفا دەیویسـت سـەردانی هەنـدی لەو هاورێیـانەی خـۆی
بکـات کە لە سـوریا هەڵهـاتبوون، ئەوانـی دەناسـی و زۆربەشـیان
سەربە هۆزی شـمەر بـوون، کاتێک ئێـوارە گەڕایەوە پێیراگەیاندم
کە سابیری کوڕی بـارزانی و عەبدول موهەیمەن، لەگەڵ هەندێک
لە ئەندامانی خێزانەکانیاندا لە بەغـدان، هەروەهـا زانـیم کە سـبەی
ئەوانە دەگەڕێنەوە بۆ کوردستان، پێتچۆنە ئێمەش لەگەڵ ئەواندا

بڕۆین، دوای ئەوەی لقی پێنجی پارتی دیموکراتی کوردستان، بەڵگەنامەی پشتگیریمان بۆ دەکات و ئۆتۆمبیلمان بۆ دابین دەکەن لە بەغداوە بمانبات بۆ هەولێر. ڕۆژی دادێ سواری ئۆتۆمبیلەکەی سابیر و عەبدول موهەیمەن بووین. لە ڕێگا کەمێک لامانداو هەندێ وێنەی یادگاریمان چرکاند.

کاتێک گەیشتینە هەولێر، زانیمان کە دکتۆر مەحمود عوسمان و مەسعود بارزانی بە ناوچە گوندنشینەکاندا دەگەڕێن و ئێوارە دەگەنە هەولێر و لەوێشەوە ڕێگای حاجی ئۆمەران دەگرنە بەر. چاوەڕێی ئەوانمانکرد و دواتر لەگەڵیاندا ڕۆیشتین بۆ لقی دووی پارتی لە هەولێر و هەندێ وێنەی یادگاریمان چرکاند. تاریکی کرد و لە یەکێک لە هۆتێلەکانی هەولێر ماینەوە، سەرلە بەیانی ئەو ڕۆژە لە یەکێک لە گۆڕەپانە گشتییەکاندا ئاهەنگێک ساز دەکرا. جەماوەرێکی زۆر ئامادەبوون، دکتۆر مەحمود عوسمان و مەسعود بارزانی و پارێزگاری هەولێر کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی عێراقەوە دانرابوو. لەدوای کۆتایی وتارەکان، پێکەوە ڕۆشتین بۆ یانەی ئەفسەران بۆ خوانی نیوەڕۆ. ژمارەیەکی زۆر لە گەورەپیاوانی کورد و عێراقی کە لە هەولێر بوون، بانگهێشت کرابوون.

دوای نانخواردن، ئامادەکاری کرا بۆ ڕۆشتن بەرەو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش. مستەفا جەمیل ڕۆشت و لەناو ئۆتۆمبیلەکەی مەسعود بارزانی دانیشت، منیش بە تەنها مامەوەو

کەس بانگی نەکردم بۆ ناو ئۆتۆمبیلی خۆی، بۆیە منیش بە ناچاری چوومە ناو یەکێک لە ئۆتۆمبیلە جیپەکان کە تایبەت بووبە پاسەوانەکانی مەسعود بارزانی و جگە لە خۆم هەشت کەسی تری تێدابوو. مستەفا محەمەد جەمیل لە تەنشت مەسعود بارزانی دانشتبوو، ریکۆدەرو رادیۆیەکی پێشکەش بە مەسعود بارزانی کردبوو، کە لە لوبنان کڕیبووی و هێشتا پارەکەشی نەدابوو، بە بیانوی ئەوەی کە بەو نزیکانە دەگەڕێتەوەو نرخەکەی دەدات.

## شەڕ لە بەغدا و ئاژاوە لە ناوپردان

گەیشتینە هاوینەهەواری سەلاحەدین، ئۆتۆمبیلەکە وەستا. مەسعود بارزانی و دکتۆر مەحمود عوسمان و عەزیز عەقراوی دابەزین بۆ ئەوەی کۆبوونەوە بە خەڵک بکەن. مەسعود وەستا و بەو بۆنەیەوە وتارێکی پێشکەشکرد. عەزیز عەقراوی دوای ئەو وتارێکی خوێندەوەو کۆتایی بە کۆبوونەوەکە هێنا و هەموویان سواری ئۆتۆمبیلەکان بوونەوە و منیش سواری هەمان ئۆتۆمبیلی (جیپی سەربازی) بوومەوە. بەهۆی تەنگوتروسکی ئۆتۆمبیلەکەوە خەریک بوو دەخنکام. هێندەم ئارەقە لێدەچۆڕا، جلەکانم هەمووی خوسابوون. ئێوارەکەی گەیشتینە حاجی ئۆمەران. من هێزم تیا نەمابوو. زۆر بێزارو ماندوو بووم، لە کاتێکدا مستەفای محەمەد جەمیل زۆر بە کەیف و سەفا بوو، ئەوەشی دەزانی کە

بارزانییەکان پێشتر ئەویان ناسیوە، چونکە لە رەچەڵەکی خێزانی بەگزادەکان بوو، بۆیە بارزانییەکان زۆریان رێزلێدەگرت، لە کاتێکدا مامەڵەی منیان بەوجۆرە نەدەکرد، چونکە دەیانزانی من لە رەچەڵەکی بەگزادەکان نیم، بۆیە وایانکرد لە ناو ئۆتۆمبیلی پاسەوانەکاندا بم و بەو جۆرە لە هەولێرەوە هەتا حاجی ئۆمەران بەفەلاکەتم بەرن.

میوانی بارەگای بارزانی بووم، لەوێ شێخ محەمەد عیسام بینی، کە یەکەم جار بوو سەردانی کوردستانی دەکرد، ئەوەش لەسەر بنەمای پێشنیازی من بوو لە سەفەری پێشوومدا، کە داوام لە بارزانی کرد بانگهێشتی بکات. پێشتر شێخ محەمەد عیسا داوای لە من کرد نامەیەکی ئەو بگەیەنم بە بارزانی، کاتێک گەرامەوە وەلامی بارزانیم بۆ هات کە تیایدا رەزامەندی ئەوەی دەربرییبوو. من و مستەفا جەمیل بەگ پێکەوە دەماینەوە و دەنوستین. ژوورێکی تایبەت بۆ هەردوکمان ئامادەکرابوو.

لێرەدا دەمەوێت سوپاس و پێزانینی خۆم بۆ مەلا مستەفای بارزانی تۆماربکەم، کە میوانداریيەکی زۆر گەرم و شەرەفمەندی کردم. رۆژانە سەردانیم دەکرد، پێکەوە هەتا دەمەو ئێواران بەناو چیا جوان و ئەفسوناوییەکانی کوردستاندا دەگەراین. جگە لەو میوانداری و بەسۆزییەی، زۆر رێز و پێزانینی هەبوو بۆم، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە من هەڵوێستی راستگۆیانە و پاکم هەبوو بەرامبەر بە خودی خۆی، ئەویش لە ناخی خۆیدا هەستی

بەو سۆزدارییەی من دەکرد، بۆیە پەیوەندیم لەگەڵ زەعیمی شۆڕش و ڕۆحی شۆڕشەکە لەسەر بنەمای ڕێزو حورمەت بوو.

نزیکەی پازدە ڕۆژم لە میوانداری بارزانی بەسەر برد، ڕێکەوتی بەستنی کۆنگرەکە دوواخرا. ڕۆژی ١٩٧٠/٦/١٤ بارزانی بە یاوەری برا گەورەکەی، شێخ بابۆ، شەرەفمەندی کردم بە سەردانیکردنم لە ژوورەکەی خۆم. ئەوە یەکەمجار بوو بارزانی لە ژوورەکەی خۆم بەسەرم بکاتەوە. بەڕێکەوت مستەفا محەمەد جەمیل بەگ لەوێ بوو، لەسەر زەوی دانیشتین، قسەوباسمان لەسەر چەندین پرسی جیاواز کرد. لە ژوورەکەی بەرامبەرمدا سەلاح بەدرەدین و شێخ محەمەد عیسا چاوەڕوانی بارزانی بوون تا چاویان پێکەوێت و قسەی لەگەڵدا بکەن. پێش ئەوەی بارزانی بچێتە دەرەوە پێمگوت: گەورەم ماوەی مانەوەو ئیقامەکەم خەریکە تەواو دەبێت و کۆنگرەش دوواخراوە، داواکارم لە جەنابتان ڕێگەم بدەن بچم بۆ بەغدا بۆ ئەوەی ئیقامەکەم نوێ بکەمەوە و دواتر بگەڕێمەوە بۆ کوردستان.

لێرەدا بارزانی گاڵتەیەکی دۆستانەی لەگەڵدا کردم و پێی گوتم: جا ئەوەندەت پارە پێیە؟ لەوەڵامدا گوتم بەڵێ گەورەم پارەم پێیە، کەچی دەستیکرد بە گیرفانمداو جزدانی پارەکەمی دەرهێنا و تەماشای کرد و گوتی ئەوەی لەناو جزدانەکتدایە ئەوەندە نیە بەشی ڕۆشتن و گەڕانەوەو خەرجیی خۆت بکات. ئینجا دەستی برد بۆ گیرفانی خۆی و بڕێکی باشی پارە خستە ناو جزدانەکەم و گوتی:

نـــامەیەکی خۆمـــت دەدەمـــێ بیـــدە بەدەســـت وەزیـــری ئاوەدانکردنەوەی باکور سامی عەبدول رەحمان کە لەسەرپشکی شـۆڕش دانـراوە، بـۆ ئەوەی هاوکاریـت بکـات و ئاسـانکاریت بـۆ بکـات و کـاری ئیقـامەکەت بـۆ جێبەجـێ بکـات. سوپاســی ئەو دەستپێشـخەرییە جـوانەم لێکـرد و گـوتم نەخێـر تکـایە نامەوێـت بەڕێزت بەو کارانەوە بێزار بکەم و نـامەم بۆ بنوسیت، مـن خـۆم باش دەیناسـم و ئەویش زۆر بـاش مـن دەناسـێت، کەچـی گـوتی: بـرام جەمیـل، تـۆ پـێش ئەوەی ببێـت بە وەزیـر ناسـیوتە، ئێسـتا وەزیرە کوردەکانمان کە بەو پلەیە گەیشـتوون لەوەتـای بـوون بە وەزیـر کەس ناناسـن. ئیتـر دواتـر ئەو رۆشـت بـۆ نوسـینگەکەی خـۆی و لەگەڵ شـێخ عیسـا و سـەلاح بەدرەدین دەسـتی بە قسـان کـرد. گـوێمـان لەدەنگـی بـوو کە هـاواری دەکـرد بەسـەر سـەلاح بەدرەدیـن و هەڕەشـەی لێـدەکرد و هێرشـی دەکـردە سـەر بیروباوەڕە هاوردەکراوەکانیان و جنێوی پێدەداو دەیگوت: سـەگی کوڕی سەگ.

وەکو گوێڕایەڵی بۆ فەرمـانی جەنـابی بـارزانی، بە سوپاسـەوە نامەکەم وەرگرت کە بۆ وەزیـری ئاوەدانکردنەوە ئاراسـتەکرابوو. رۆژی دادێ چـووم بـۆ دیـوانی وەزارەت و لە چـاوەڕوانی هـاتنی وەزیـری بەڕێزدابـووم. لەو کـاتەدا لەبەردەم دەرگـای دەرەوەدا بووم. کاتژمێر هەشتی تەواو بە ئۆتـۆمبیلە حکومییەکەی گەیشت و دابەزی. دەسـتی سـڵاوم بەرزکـردەوە: رۆژبـاش کـاک سـامی،

بەڵام بەداخەوە وەڵامی سڵاوەکەمی نەدایەوە، لوتبەرزانە سەری بەرزکردەوە و چاویلکەی لە چاوکردبوو. زۆر بە خێرایی یەکێک لە پاسەوانەکان دەرگای ئەسانسۆرەکەی بۆ کردەوە، منیش بە خێرایی دوای کەوتم و لە هۆڵی چاوەڕوانی لە بەیانیەوە هەتا کۆتایی دەوام چاوەڕێمکرد. هەرچەندە نامەکەی بارزانیم بەدەست گەیاندبوو، هەروەها دەیزانی من لە هۆڵی چاوەڕوانی دانیشتووم. کاتی دەوام کۆتایی هات و بانگی نەکردم، ڕۆژی دووەم ڕۆشتمەوە بارودۆخەکە بەهەمان شێوە بوو، ڕەفتارەکەی هەمان جۆر بوو. زۆر توڕە بووم نەمتوانی زیاتر بەرگەی ئەو لوتبەرزی و پۆزلێدانەی بگرم، ئیتر دەستم کرد بە هات و هاوارو جنێودان بە وەزیرو بە کوردو بەوکەسەشی کە ئەوی داناوە بە وەزیر بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی کورد بکات لەو پۆستە هەستیارەدا. بە توندی هاوارم دەکرد تا جێگرەکەی هات و ڕۆشتەوە هەواڵەکەی بۆ وەزیر بردەوەو پێیگوتبوو کە ئەو ئاژاوەیە هەمووی سەرچاوەکەی جەمیل مەحۆیە. فەرمانی پێدابوو کە بانگم کاتە ژوورەوە، لە کاتی پێشوازیمدا هاتبووە ئەودیو نوسینگەکەی و بە زمانی کوردی پێی وتم: ئەو توڕەبوونەی بۆچییە، ئینجا دانیشتین بۆ قسەکردن و پێی گوتم:

هۆکاری چییە تۆ بەیان و بڵاوکراوە لە دژی ئێمە دەردەکەیت؟ منیش وتم ئەی هۆکاری چییە ئێوە هەڵوێستی نادروست لە دژی حزبی ئێمە دەنوێنن لە لوبنان؟ بێدەنگ بوو، هیچ وەڵامێکی

نەدامەوە. ئینجا بانگی کوڕە خاڵەکەی کرد کە لەهەمان کاتیشدا جێگری بوو، بۆ ئەوەی بمبات بۆ بەشی پاسپۆرت. لەوێ دۆسیێی جەمیل مەحۆیان هەڵدایەوە، سەرۆکی بەشەکە پێی گوتم: تۆیت جەمیل مەحۆ؟ گوتم بەڵێ. ئینجا گوتی: تۆ چۆن داخڵی ئەم وڵاتە بوویت؟ پێمگوت بە پاسپۆرتی لوبنانی. گوتی: بۆ تۆ قەدەغەیە هەرگیز پێ بخەیتە ناو خاکی عێراق، من ماوەی ٢٤ کاژێرت بۆ دادەنێم بۆ ئەوەی دەستبەجێ وڵات بەجێبێڵیت، بەپێچەوانەوە ئەگەر نەڕۆیت ئەوە یاسا ڕەچاوکراوەکانت لەبەرامبەر جێبەجێ دەکەم و دەتخەمە زیندانەوە. کە ئەوەم بیست گەڕامەوە بۆ دیوانی وەزیرو هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە. ئەویش لەگەڵ هاوپیشەی خۆی وەزیری ناوخۆ قسەی کرد و پێیگوت کە بە گوێرەی ڕێکەوتنی یازدەی ئازار هەموو کۆتوبەندەکان لەسەر کورد هەڵگیراون. جەمیل مەحۆ بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی هەشتی حزبدا هاتووە، بەڵام لەبەر هۆکاری نەخوازراو کۆنگرەکەمان کەمێک دواخراوە، بۆیە داوا لە پایەداری بەڕێزتان دەکەم، بەپەلە ئەو کارەمان بۆ مەیسەربکەن و مافی مانەوەی تەنها یەک مانگی بدەنێ.

بەڵام سەبارەت بە دۆسیێکەم و ئەو ڕاپۆرتانەی لە بەڕێوبەرایەتی ئاسایش و بەشی هەواڵگری عێراقی لەسەرم هەبوون، هەر باس ناکرێت، دۆسیێیەکی زۆر ئەستورو قەبە لە ناوەرۆکدا، یاوەرەکەم کە کوردێکی عێراقی بوو گوتی: کاک

جەمیل دوای ئەوەی کە مەلەفەکەی خۆتت بینی بەوجۆرە، حەز ئەکەیت وێنەیەکی ئەو مەلەفەت بۆ کۆپی بکەم؟ پێمگوت نا پێویست بەوە ناکات، چونکە من لە عێراق نیشتەجێ نیم و نامەوێت کێشە بۆ ئێوە دروست بکەم، سوپاسی خەمخۆری و پشتیوانیت ئەکەم.

دوای ئەوەی بیست رۆژ مافی مانەوەم بۆ تازە کرایەوە، حەزم کرد کەمێک بگەڕێم و ماندوو بوونی خۆم بڕەوێنمەوە. رۆشتم بۆ شەقامی رەشید، کە گەورەترین شەقامی عێراقە و گەیشتمە بازاڕێک کە هەموو جۆرە کەلوپەلێکی تێدا دەفرۆشرا. کەسێکم بینی دووربینێکی گەورەی بەدەستەوە بوو دەیفرۆشت. پرسیاری نرخەکەیم کرد داوای ٢٣ دیناری دەکرد، لە راستیدا نرخی راستەقینەی خۆی زۆر لەوە زیاتر بوو. زۆر بە خۆشحاڵییەوە کڕیم و گەڕامەوە بۆ حاجی ئۆمەران و وەک دیارییەکی سادە پێشکەشم کرد بە بارزانی. کە چاوم پێکەوت زۆر دڵخۆش بوو بە دیارییەکە و زۆر سوپاسی کردم و پێی وتم: کە گەڕایتەوە بۆ لوبنان ئەبێ دووربینێکی ئەورووپیم بۆ بکڕیت، ناونیشان و خەسڵەتەکانی پێدام، خۆشی دووربینێکی روسی زۆر باشی هەبوو. لە مانەوەمدا لە خزمەتیدا بەردەوام لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ گەڕان، بەسەر شاخ و لوتکە جوانەکاندا دەڕۆیشتین، سەیری ئەسپی رەسەنمان دەکرد. لەم سەروبەندەدا چەندین شاند و رێکخراوی کوردی لە ناوخۆی عێراق و وڵاتانی جیاوازەوە

دەهاتن بۆ ناوپردان بۆ مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆ ئەوەی بەشداری لە کۆنگرەدا بکەن. هەموو ڕێکخراوەکان بەگوێرەی بانگهێشتنامەی ڕەسمی مەکتەبی سیاسی دەهاتن، تەنها جەمیل مەحۆ نەبێت کە بەبێ هیچ بانگهێشتێکی ڕەسمی هاتبووە کوردستان، چونکە بۆ هەموو کەسێک ئاشکرا بوو کە ئەو لەلایەن زەعیمی شۆڕشەوە، مەلا مستەفای بارزانی پێگەی تایبەتی خۆی هەیە. لەبەر دڵسۆزی و چەسپاوی بیروباوەڕم بەرامبەر بە سەرکردەی شۆڕش، کەوتبوومە بەر نەفرەتی مەکتەبی سیاسی. لەنێو ئەو شاندانەی کە بانگهێشتی کۆنگرە کرابوون، شاندێکی پارتی دیموکراتی کوردی سوریا بوو لەگەڵ ژمارەیەکی تر لەو کوردانەی سوریا کە نوێنەرایەتی هەندێ ڕێکخراوی کوردییان دەکرد لە سوریا.

بەر لەوەی سەلاح بەدرەدین سەفەر بکات بۆ عێراق، بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی حزب لە ناوپردان، لە نێوان من و ئەودا ڕێکەوتنێکی سیاسی لە لوبنان کرا، هەروەها بەیانێکی پێدام کە بەناوێکی خوازراو نوسرابوو بۆ ئەوەی لە بڵاوکراوەی حزبیدا لە لوبنان بڵاوبێتەوەو لە کاتی کۆنگرەدا دابەش بکرێت بەسەر ئامادەبواندا، کە تیادا هێرش دەکاتە سەر قوتابیانی ئەوروپا. لەگەڵ گەیشتنی بە بارەگای حزب و بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ناوپردان، لەگەڵ هەریەکە لە حەبیب محەمەد کەریم و محەمەد مەحمود عەبدول ڕەحمان، ناسراو بە سامی عەبدول ڕەحمان و

دارا تۆفیق عەتار، لەگەڵیاندا ڕێککەوتبوو کە بروسکەیەک ڕەوانە بکەن بۆ لوبنان تا کەسێکی ئەڵقەلەگوێی خۆیان بانگهێشت بکەن گوایا نوێنەرایەتی پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان دەکات. ئامانجی ئەمە ئەوەبوو کە فرسەت بۆ من نەمێنێت بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی حزب، لەبەر ئەوەی من نزیکم لە بارزانی. من ئاگام لەم پیلانە نەبوو کە بەوجۆرە دارێژراوە لە دژم. ئەوەی زۆر جێگای سەرسوڕمان و هەڵوەستەکردن بوو بۆم ئەوەبوو کە سێ ڕۆژ بەر لە دەستپێکردنی کۆنگرە بیستم یەکێک لە ئەڵقەلەگوێکانی خۆیان گەیشتۆتە ئەوێ و چەند کوردێکی لوبنانیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، کە دوورو نزیک لە گۆڕەپانی تێکۆشانی نەتەوایەتیدا نەبوون، ئەمە جگە لەوەی کە هەموویان بەوە ناسرابوون کە دژی ئازادیخوازان و خەباتکاران بوون و کلکی دەزگا هەواڵگریەکان بوون لە دژی ئەو حزبەی کەمن سەرکردایەتیم دەکرد و دژی شۆڕشی کورد بوون لە عێراق.

هەر بەگوێرەی پیلانەکەی خۆیان، زۆربەی بەکرێگیراوەکان هاتبوون، هەروەها شاندێکی قوتابیانی ئەوروپاش هاتبوو. دوای ئەوەی پیلانەکەیان بەوجۆرە دارشتبوو، هەموویان پێکەوە لە دژی من یەکیان گرتبوو، سەرباری ئەوەی کە دەیانزانی من لە میوانداری بارزانیدا بووم و دەیانزانی من چ پێگەیەکم لای زەعیمی شۆڕش هەیە. سەرباری هەموو ئەوانەش فەرمانیان بە

ئەڵقە لەگوێکانی خۆیان دابوو کە لەناو کۆنگرە دەنگۆی ئەوە بڵاو بکەنەوە گوایا جەمیل مەحۆ لە لوبنان لەناو حزبدا زۆر پەسەندکراو نیە بۆیە بانگهێشت نامەی بۆ رەوانە نەکراوە. کاتێک ئەم هەواڵانە دەگاتەوە بە گوێی زەعیمی شۆڕش زۆر تورە دەبێت و فەرمانێکی زۆر توند بۆ مەکتەبی سیاسی دەردەکات کە بە پەلە بانگهێشت نامەیەکی تایبەت و رەسمیم ئاراستە بکەن بۆ بەشداری لە کۆنگرە، ئەگەر نا ئەوا خۆی ناچار دەبێت بانگهێشت نامەی خۆیم بۆ رەوانە بکات، ئەگەر تەنها یەک رۆژیش مابێت بۆ بەستنی کۆنگرە. ئا بەو جۆرە بووە کە من بانگهێشت نامەیەکی زارەکی (شەفەویم) بۆ بەشداری لە کۆنگرە پێگەیشت.

## وتارەکەم کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستانی هەژاند

لە ژوورەکەمدا بە تەنها بووم، وەک ئەوەی لە خەڵوەتدا بم، خۆم ئامادە دەکرد بۆ نوسینی ئەو گوتارەی کە لە کۆنگرەکەدا دەمخوێندەوە. ئیدریس بارزانی خەڵوەتەکەی بڕیم و هات بۆلام تا بزانێ چی ئەکەم، منیش لەوەڵامدا گوتم خەریکی ئامادەکردنی ئەو وتارەم کە بە نیازم لە کردنەوەی کۆنگرەدا بیخوێنمەوە. داوای لێکردم بۆی بخوێنمەوە تا بزانێت چیم نوسیوە. داواکەیم بەجێهێنا، کە لە خوێندنەوەی وتارەکە تەواو بووم، لاپەڕەیەکی هەڵگرت و ئەم دەستەواژەیەی لەسەر نوسی: دەبێت پارتی دیموکراتی کوردستان پاک بکەینەوە لە خەڵکانی گومانلێکراو،

ئینجا دەستیکرد بە وەسف و پیاهەڵدانی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست و شۆڕشی ١٧-٣٠ گەلاوێژ. کاتێک ئەوەم خوێندەوە کە نوسیبووی، هەستم کرد ترس دەخزێتە ناو دڵمەوە. لەو باوەڕەدا بووم کە ئەو دەیەوێت تاقیم بکاتەوە، بۆ ئەوەی بزانێت من هەڵوێستم چی دەبێت. بەر لەوەی لە ژوورەکە بڕواتە دەرەوە، بانگی شێخ محەمەد عیسای کرد، کە بە رەچەڵەک کوردی سوریا بوو، داوای لێکرد هاوکاریم بکات لە داڕشتنی وتارەکە بەوجۆرەی کە مەبەستی بوو لە وەسف کردنی حزبی بەعسی عێراقی و پیاهەڵدان پێیداو بە خەباتی نەتەوایەتییدا، پاشان هێرش کردنە سەر سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان. لەگەڵ شێخ محەمەد عیسا بەجێی هێشتم و رۆشت. شێخ دەستی بە نوسین کرد تا تەواوی کرد و پاشان رۆشت بۆ لای ئیدریس بارزانی و پێشانیدا. ئیدریس بە تەواوی رەزامەند بوو بە وتارەکە، ئیتر منیش دەستمکرد بە نوسینی وتارەکە بە دەستوخەتی خۆم، بەلام هەموو ئەو رەشنوسانەم لای خۆم هەڵگرت کە بە خەتی ئیدریس و شێخ محەمەد عیسا نوسرابوون، لەبەر ئەوەی لە دڵی خۆمدا دەمگوت رەنگە رۆژێک لە رۆژان بارودۆخێک بێتە پێشەوە پێویستیم پێیان بێت. هەر بەوجۆرەش کەوتەوە.

عەسرانی هەموو رۆژێک بارزانی حەزی دەکرد لەگەڵیدا بم، سواری ئۆتۆمبیل دەبووین و دەچووین بۆ ئەو شاخ و کێوانە و سەیری راهێنانی ئەسپی رەسەنمان دەکرد لە نێوان خۆی و

ئەوانەی لەگەڵیدا بوون. دیمەنی ئەسپسواری زۆر جوانمان دەبینی، هەتا کاتی خۆرئاوا بوون تەماشای پێشبڕکێی ئەسپەکانمان دەکرد. ئێوارە لە کاتی گەڕانەوەماندا، لەسەر کورسییەکی دوواوە لەپاڵ بارزانیدا دانیشتبووم، شێخ بابۆی برای لەگەڵ شۆفێرەکەدا بوو. لەکاتی قسەکردنماندا کتوپڕ بیرۆکەیەکم بۆ هات و پێمگوت: گەورەم ئەوە وتارەکەمە کە بۆ کۆنگرە ئامادەم کردووە بیخوێنمەوە، لەسەر ڕێنمایی کاک ئیدریس نوسیومە، ڕێنمایی جەنابتان چییە بۆ ئەوەی باشتری بکەین، ئەگەر پێویستیش بکات وتارەکە بە تەواوی دەگۆڕین. لێیوەرگرتم، دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم. بیرم دەکردەوەو پرسیاری زۆرم لە خۆم دەکرد، بە تایبەت کە ڕۆشتم بۆ بەغداو هەواڵگری عێراق ئامادە نەبوو ئیقامەکەم بۆ درێژ بکاتەوە بە بیانوی ئەوەی کە من کەسێکی پەسەندکراو نیم لە عێراق، ئینجا دواتر وەزیری ئاوەدانکردنەوەی باکور خۆی دێتە گۆڕێ و داوا لە وەزیری ناوخۆ دەکات و تەنها بیست ڕۆژم بۆ نوێ دەبێتەوە. لە بەیروت باڵیۆزخانەی عێراقی ئامادە نابێت فیزەم بداتی لەبەر ئەوەی من بۆم نیە سەفەر بۆ عێراق بکەم چونکە کەسێکی مەترسیدارم! ئەی ئێستا چۆنە ئیدرس خۆی دێت و داوام لێدەکات وەسفی حزبی بەعسی عێراقی بکەم و هێرش بکەمە سەر سەرکردایەتی شۆڕشی کورد؟

بە درێژایی شەو گفتوگۆم لەگەڵ خۆمدا دەکرد، چاوەکانم هیچ نەچوونە خەو. لەبەر خۆمەوە دەمگوت ئەم کارە بکەم یان نا؟ بەڵام ئەو شەیتانەی کە ناوی ئیدریس بوو، ئامانجێکی ئەهریمەنانەی هەبوو، دەیویست لە رێگای جەمیل مەحوەوە، زەبر لە هەندێ کەسانی سەرکردایەتی بوەشێنێت، ئەمەش وایکرد بترسم لەوەی کە بکرێمە قوربانی ململانێکانی ناوخۆی خۆیان. لە کاتێکدا من دۆشدامابووم و لەناو ئەو خەیاڵانەدا کێنگڵم دەدا، پاسەوانەکەی مەلا بارزانی کە ناوی ئەحمەد بوو، پەتی خەیاڵەکانی بچڕیم و وتارەکەمی بەدەستەوە بوو کە لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا دابووم بە بارزانی بۆ ئەوەی رێنمایی خۆی و سەرنجەکانی بخاتە سەری. زەرفەکەم کردەوە، تەماشام کرد مەلا مستەفا بارزانی بەبێ هیچ رەخنەیەک وتارەکەی وەک خۆی پەسەند کردووە، لە کاتێکدا مەسعود و دارا تۆفیق لە رێگای بەیروتەوە سەفەری ئەوروپایان کردبوو.

بۆ بەیانی رۆژی دواتر، کە رۆژی بەستنی کۆنگرە بوو، خۆم ئامادە دەکرد بچم بۆ شوێنی کۆنگرە، ئیدریس بارزانی بانگی کردم تا بە ئۆتۆمبیلە سورە بچووکەکەی خۆی، لە گەڵیدا برۆم بۆ شوێنی بەستنی کۆنگرە لە ناوپردان. ئەوە فرسەتێکی باش بوو بۆ ئەوەی هەندێ وێنەی یادگاری بچرکێنین. من هەمیشە دوور دەمروانی، وێنەم دەگرت بۆ رۆژی حساب. دوای ئەوە کەوتینە رێ. کە گەیشتینە ناوپردان، بینیمان شاندەکان و کەسایەتییەکان

بەرێگـــاوەن بـــۆ ئامـــادەبوونی کـــۆنگرە. هەمـــووان لەبەردەم ڕەشـــماڵێکدا وەســـتابوون کە بـــۆ پشـــوودان تەرخـــان کرابـــوو. شاندەکان دەستیان کرد بە چوونە ژوورەوە بۆ هۆڵی کۆنگرە، کە بریتـــی بـــوو لە خێـــوەتێکی گەورە لەنـــاو گۆڕەپـــانی قوتابخـــانەی نـــاوپردان لە نزیـــک کۆشـــکی ئاشـــتی دانرابـــوو. هەمـــوو ئەنـــدامانی کۆنگرەش کـارتی بانگهێشتنامەکەیان بەدەستەوە بوو، بۆ ئەوەی مـاوەی چـوونە ژوورەوەیـان پێبدرێت، تەنهـا مـن نەبێت کە هـیچ بەڵگەنـــامەیەکی ڕەســـمیم لە لایەن مەکتەبـــی سیاســـی پـــارتی دیمـوکراتی کوردسـتان بۆ نەکرابـوو. گەیشتمە بەردەم دەرگـاکە، هەریەکە لە فرانســـوا هەریـــری و مـــحەمەد عەزیـــز و چەنـــدین بەرپرسی تـری دەزگـای هەواڵگری پاراسـتن لەبەردەم دەرگـاکەدا وەسـتابوون، هەر کەسێک بانگهێشـت نـامەی بەدەسـتەوە نەبـوایە ڕێگـای چـوونە ژوورەوەیـان نەدەدا. کاتێـک ئەوانە منیـان بینـی فرانســوا هەریـری بە پرتـاو هـات بـۆ پێشـوازیم، سـەرکردەکانی تریش هاتن و پێشوازییەکی زۆر گەرمیان لێکردم، لەگەڵمدا هـاتن بۆ هۆڵی کۆنگرە و لە ڕیزی پێشـەوە لە نزیـک کورسـییەکەی مەلا مستەفای بـارزانی منیـان دانیشـاند. لەو سـەروبەندەدا ئیتـر وردە وردە ئەنـدامانی ئەو شـاندە دەرکەوتـن کە لە لوبنـان و سـوریاوە بانگ کرابوون، هەروەها شاندی قوتابیانی ئەورووپا. هەرهەموویان کـارتی ڕەسـمی خۆیـان پێبـوو. لە ڕیـزی پێشـەوە لە نزیـک منەوە ســـەرکردەکانی پـــارتی دیمـــوکراتی کوردســـتان دانیشـــتبوون،

هەروەها نوێنەری حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست و هەندی شاند و کەسایەتی رەسمی و دیاری ئەورووپا کە سۆزیان بۆ پرسی کورد هەبوو، دانیشتبوون.

کۆنگرە دەستی بە کارەکانی کرد، یەکەمین کەس کە وتەی پێشکەشکرد سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان، حەبیب محەمەد کەریم بوو، دوای ئەویش بەرپرسەکانی هەندێک لە رێکخراوەکانی پارتی. دواتر نۆرە هاتە سەر نوێنەری پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا، سەلاح بەدرەدین ئەم وتارەی پێشکەش کرد. رێگاش نەدرا کە هەریەکە لە حەمید دەروێش و جگەر خوێن و چەند کەسێکی تر لە سەرکردەکانی حزب لە سوریا، لەو کۆنگرەیە وتار پێشکەش بکەن.

دوای ئەوە بێژەرەکە رایگەیاند: ئێستاش وتارێکمان بۆ هاتووە لە لایەن رێکخراوی پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان، کە لەجیاتی ئەو پێشکەشتانی دەکەین. ئەو کەسە کوردەی لە لوبنانەوە هاتبوو بۆ کۆنگرە نەیدەتوانی خۆی وتار بخوێنێتەوە چونکە نەخوێندەوار بوو، لەسەر داوای حەبیب محەمەد کەریم و سەلاح بەدرەدین هاتبوو. هەموو ئەو کارانە نارەحەتیان کردم. بە ئانقەست ئەوەیان کردبوو بۆ ئەوەی من پەراوێز و گۆشەگیر بکەن.

دوای ماوەیەکی کورت، بێژەرەکە هاتەوەو مایکرۆفۆنەکەی گرت و رایگەیاند کە سکرتێری رێکخراوی لاوانی دیموکراتی کورد لە سوریا و لوبنان، بەڕێز جەمیل مەحۆ، وتاری پارتی

دیموکراتی کورد لە لوبنان پێشکەش دەکات. لە هۆڵەکەدا بوو بە چەپڵە ڕێزان. زۆر بە شانازی وسەربەرزانە چوومە سەر مینبەرەکە و لەبەردەم ئامادەبووانی کۆنگرە دەستم کرد بە خوێندنەوەی وتارەکەم. لە وتەکەمدا زۆر بە توندی و لەبەردەم نوێنەرانی کورد و لەناوجەرگەی بارەگاکانی خۆیاندا لە ناوپردان، هێرش دەکەمە سەر هەندێ لە سەرانی پارتی.

ئەمانە هەمووی بە ئامادەبوونی ڕابەری شۆڕش مەلا مستەفای بارزانی بوو، کاتێ لە وتارەکەمدا ئاماژەم بۆ گرنگی پاککردنەوەی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان کرد لە خەڵکانی ناپەسەند و گومانلێکراو. لەناو هۆڵی کۆنگرەدا بوو بە چەپڵەڕێزانێکی زۆر و بەردەوام بۆ چەند جارێک. دوای تەواوبوونم لە خوێندنەوەی وتارەکە، هەستمکرد لە سیمای بارزانیدا زۆر بە ڕوونی و ئاشکرا دیار بوو کە خۆشحاڵ بووە، هەروەها لە سیمای زۆرێک لە ئامادەبووانیشدا هەر وا بوو، بەڵام سەرانی حزب سیمایان گۆڕابوو، دەموچاویان گرژ ببوو. کاتێک بەشی یەکەمی کارەکانی کۆنگرە تەواو بوو، یەکەم کەس کە هات بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ناوەڕۆکی وتارەکەم سەردار ئاغای ژنبرای ئیدریس بارزانی بوو. لەیەک کاتدا هەستم دەکرد مەلول و پەشۆکاو بوو، گوتی: کاک جەمیل ئەوە چییە؟ ئەوەندە بوێر بوویت بەو شێوەیە وەسفی حزبی بەعس بکەیت و ئەوەندە توند و شەڕانگێزانە هێرش بکەیتە سەر سەرکردایەتی شۆڕش؟ بە

کورتی وەڵامم دایەوەو گوتم: تکات لێدەکەم کاک سەردار لەو بارەوە دەم گیر مەکە لە دەمم، چونکە من کاری خۆم و بەرپرسیاریەتی خۆم زۆر باشتر لە هەر کەسێکی تر دەزانم. ئیتر یەک وشەی نەوت و شوێنەکەی بەجێهێشت. دوای ئەو عەزیز عەقراوی هات، هەوڵیدا هۆکارو پاڵنەرەکانی ئەو هێرشە توندەم بۆ سەرکردایەتی حزبەکەیان و ئەو هەموو وەسف و پیاهەڵدانەم بۆ حزبی بەعس بزانێت. پێمگوت: ئەگەر پێتانخۆشە گفتوگۆ لەو بارەوە بکەین ئەوە من هیچ لاریم لەوە نییە و ئامادەم بەڵام بە مەرجێک سکرتێری حزبەکەتان ئامادە بێت. دوای ئەوە چووم بۆ سەردانی شاندی قوتابیانی کورد، ئەوانەی ئامادەی کۆنگرەکە ببون، کە چوومە بارەگاکەیان، سەیرمکرد ساڵەح یوسفی ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان لەوێ بوو. لەگەڵ قوتابییەکاندا سەرقاڵی باسکردنی کاروباری شۆڕش و بارودۆخ و مەسەلەی کورد بوو، شێخ محەمەد عیسی کە کوردێکی سوریا بوو ئەویش لە پاڵیدا بوو کە خۆی بەدەستی خۆی و لەسەر داواو ڕێنمایی ئیدریس وتارەکەی بۆ نوسیبووم. شێخ عیساش لەبەردەم قوتابییەکاندا دەستی کرد بە هێرشکردنە سەرم بەهۆی وتارەکەمەوە، تاوەکو ڕووی ناشرینی خۆی سپی بکاتەوە، لە کاتێکدا بە دەستەکانی خۆی وتارەکەی نوسیبوو. سڵاوم لێکردن و لە ناویاندا دانیشتم، ئیتر دەستی بەقسان کرد و پرسیاری هۆکاری هێرش کردنە سەریانم لە کۆنگرە دەکرد،

منیش بە ناچاری لەگەڵیدا کەوتمە گفتوگۆ. هەندێ لە سەکردەکانی قوتابیانیش لە ئەوروپا لەوێ بوون. بە دووروودرێژی و زۆر بە رونی ئەو هۆکارانەم بۆ ڕوونکردەوە کە وایانکرد من بەوجۆرە هەڵوێست بنوێنم و پێمگوتن: کۆنگرەکە لە بنەمای گیانی برایەتی کورد و ئەو دیموکراسییەتە راستەقینەیە لایداوە کە لە دروشمە بێناوەڕۆک و پوچەکانیانەوە بانگەشەیان بۆ دەکرد، بەڵگەشم بۆ ئەمە ئەوەیە کە نیوەی ئامادەبووانی کۆنگرەکە ئاژان و جاسوسن.

لەدوای کۆتایی کۆنگرە، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان، دەستیان بە جوڵە کرد، ململانێکان لە نێوان کادرانی حزبدا بە ئاشکرا دەستیان بە تەقینەوە کرد. دەستکرا بە دارشتنی پیلان و دروستکردنی باڵ و کوتلە لە نێوان ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و دەرەوەیدا. ئەم کۆنگرەیە هۆکارێک و بۆنەیەک بوو بۆ من بۆ گوتنی ئەوەی کە پێمخۆش بوو بیڵێم بەئاشکرا و لەبەردەم سەرکردە و بەرپرسە گەورەکاندا، رەخنەی لادان و کردەوە دزێوەکانیان بکەم لەدژی گەلی کوردی تێکۆشەرمان، کە بەر لەهەموو شت پێویستی بە سەرکردەی بەشەرەف و مێرخاس هەبوو کە بتوانن خەبات بکەن لە پێناوی بەرزکردنەوەی پێگەیی و کۆکردنەوەی لە چوارچێوەی بەرەیەکی نیشتمانی دیموکراتیدا[21].

---

[21] ئەوەی جێگەی سەرنجە جەمیل مەحو بە هیچ شێوەیەک ئاماژە بۆ دیوە نهێنی و شاراوەکانی ئەم کۆنگرەیە ناکات. ئایا نەیویستووە باسی بکات یاخود هەر ئاگادار

دژایەتیکردنی بە ئاشکرا لە دژی من، لە لایەن ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دەستپێکرد. مکوڕ بووم لەسەر هەڵوێستەکانم، دڵسۆز و خۆڕاگر بووم بۆ بیروباوەڕم، گرنگیم بە هیچ کام لە سەرکردەو بەرپرسەکان نەدەدا تەنانەت بۆ حەبیب محەمەد کەریمی سکرتێری حزبیش. باوەڕم بەوە هەبوو کە رابەری شۆڕش و زەعیمەکەی مستەفا بارزانی و هەردوو کوڕەکەی لایەنگریم دەکەن و زۆر بەباشی دەزانن کە چەندە دڵسۆزیانم. هیچ کارێکم بەبێ رەزامەندی ئەوان نەدەکرد، بەبێ پرس و راوێژ بەوان هیچم نەدەکرد، پەیوەندی سیاسیم لەگەڵیاندا لەباشترین دۆخدا بوو. زۆر دڵسۆزانە لە پێناوی حزبدا، ئارەزووە سیاسییەکان و رێنماییەکانی ئەوانم جێبەجێ دەکرد. قەناعەتێکی ویژدانیی زۆر بەهێزم هەبوو بەوەی کە مەلا مستەفا و ئیدریسی کوڕی هەرگیز واز لە هاوکاری و هاوسۆزی من ناهێنن، متمانەیەکی زۆر کوێرانەو بێ سنورم بە بارزانی هەبوو. لەو

---

نەبووە؟ بە بۆچوونی من ئاگاداری نهێنییەکانی ئەو کۆنگرەیە نەبووە، دەنا بە دوورو نزیک دەبوو کەمێک باسی بکردبا، یان هەر هیچ نەبوایە بە یەک دێڕیش بوایە ئاماژەی بۆ بکردایە. ئەم کۆنگرەیە یەکەم هەنگاوی عەمەلی بوو لە لایەن بارزانییەوە بۆ تەوریسکردنی حزب و تاپۆکردنی لەسەر کوڕەکانی. بۆیە لەو کۆنگرەیەدا تەزویر بۆ ئیدریس و مەسعود کرا بۆ ئەوەی دەنگیان وەکو یەک بێت، تا کێشە بۆ بنەماڵە دروست نەبێ وەکو جۆرجیس فەتحولا باسی دەکات، جوتە برا یەکی ٤٥٠ دەنگی وەکو یەکیان هێنا و گەیشتنە لوتکەی ناوەندی بڕیار. بڕوانە جرجیس فتح الله، زيارة للماضي القريب، ستوكهولم، دار الشمس للطباعة و النشر، ص ٦٧) – وەرگێڕی کوردی –

باوەڕەدابووم کە ئەو دۆستی هەموو کوردە بەبێ هیچ جیاکاری و جیاکردنەوەیەک. ئەوە من بووم کە ناوی بارزانی و شۆڕشی کوردم لە گۆڕەپانی لوبنانیدا چەسپاند.

لە دوا ڕۆژەکانی کۆنگرەدا چاوم بە شێخ بابۆ، برا گەورەی بارزانی کەوت، دوای ئەوەی وەکو ڕێزێک بۆ پایەو پلەی هەستامە سەرپێ و سڵاوم لێکرد، گوتی: کاک جەمیل ناوەڕۆکی وتارەکەت لە کۆنگرە زۆر جوان و گرنگ بوو، هەموو کەسێک باسی دەکات و ستایشت دەکەن لەسەری. منیش پێمگوت زۆر سوپاست دەکەم گەورەم بۆ ئەو شایەتیە کە لەلای من زۆر بەنرخەو شانازی پێوە دەکەم.

بۆ ئێوارەکەی ڕۆشتم بۆ بارەگای سەرۆکی شۆڕش بۆ ئەوەی مەرەخەسی لێبخوازم و بگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم، لوبنان. ڕەزامەندی خۆی بۆ ئەوە دامێ و شەرەفمەندی کردم بە پێدانی ڕێگاپێدانێکی ڕەسمی بەناوی خۆی کە بەخەتی ئیدریسی کوڕی نوسرابوو، بۆ ئەوەی من وتە بێژی ڕەسمی ئەو بم لە لوبنان. هەتا ئەمڕۆش بەشانازییەوە ئەو ڕێگاپێدانەم لای خۆم پاراستووە. هەروەها تکای ئەوەم لێکرد کە هەندێ نامەم بۆ بنوسێت بۆ هەندێ لە کەسایەتییەکانی لوبنان بۆ سوپاسکردنیان بەرامبەر بە هەڵوێستەکانیان لە هەمبەر پشتگیریکردن و پشتیوانیان بۆ شۆڕشەکەمان لە ناوەندە نێودەوڵەتییەکاندا. ئەو داوایەشی پەسەند کردم. هەروەها داوام لێکرد نامەیەکی تایبەت بۆ سەرۆک

کۆمـاری ئەوکـاتەی لوبنـان بەڕێـز شـارل حلـو بنوسـێت، کە لێبوردنێکی تایبەتی بۆ یەکێک لە هاوڵاتییە کوردەکان دەرکرد، کە بە ١٥ ساڵ زیندانی حوکمی درابوو. لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتدا هەموو ئەو نامانەمان نوسی. دوای ئەوە مستەفا بارزانی بانگی کردم بۆ ئەوەی بە تەنها بمبینێت. چوار نامەی دامێ و ڕێنمایی ئەوەشی کردم کە پەیوەندی من و ئەو ئیتر ڕاستەوخۆ دەبێت بەبێ هیچ میانگیرێک. دوای ئەوانە ئیتر مەرەخەسیم لە بارزانی خواست بۆ سەفەر، ڕۆژی دادێ بەبێ ئەوەی سەردانی هیچ کەسێکی مەکتەب سیاسی بکەم، حاجی ئۆمەرانم، بەرەو لوبنان بەجێهێشت.

## سەرەتای پیلانگێڕی لە دژم

دوای گەیشتنەوەم بۆ لوبنان، کارتێکی بانگهێشتی ڕەسمیم لەلایەن یەکێتی قوتابیانی ئەورووپاوە بەدەست گەیشت، بۆ ئامادە بوون لە کۆنگرەی سیازدەی ڕێکخراوەکەیان لە ستۆکهۆڵم. داوەتنامەکەم خستە بەردەم سەرکردایەتی حزب و ڕەزامەندی لەسەر درا. بلیتی سەفەرم بە فڕۆکە لە بەیروت بڕی. لە گەیشتنمدا، هەندێ قوتابی لە پێشوازیمدا بوون و بەو بۆنەیەوە ئاهەنگیان گێڕا و لە یەکێک لە هۆتێلەکان میوانداریيان کردم. بە ڕێکەوت بەر لە دەستپێکردنی کۆنگرە بە ڕۆژێک هەواڵی گەیشتنی محەمەد حەبیب کەریم وەک نوێنەری پارتی دیموکراتی

کوردستانم بیست. له بەرپرسە بالاکانی قوتابیان هەر یەکە له شاخەوان ئەحمەد و عەزیز رەزا هاتن بۆ لام و داوایان لێکردم لەگەڵیاندا بچم بۆ سەردانی حەبیب محەمەد کەریم له یەکێک لەهۆتێلەکانی پایتەخت. به سوپاسەوە داواکەیانم پەسەند کرد و رۆشتین بۆ ئەو هۆتێلەی که حەبیب محەمەد کەریم و هەڤاڵێکی لێیدابەزیبوون. کەمێک قسەو باسمان کرد و دوای ئەوە له هۆتێلەکە چوینە دەرەوەو دەستمان به گەڕان کرد به شەقامەکانی پایتەختدا تا گەیشتینە یەکێک له قاوەخانەکان. چوینە ژوورەوە دانیشتین و قسەوباسی زۆرمان کرد لەسەر کاروباری حزبی، هەتا نۆرە هاتە سەر قسەکردن لەبارەی پارتی دیموکراتی کورد له لوبنان. حەبیب دەستیکرد به قسەکردن وبه زاراوە عێراقیەکە وتی: کاکه کەی دەگەڕێیتەوە بۆ لوبنان تا بتوانین لەوێ یەکتر ببینین و هەندێ قسە بکەین، منیش پێمگوت: دەتوانم هۆکاری هاتنت بۆ لوبنان بزانم بۆ ئەوەی لەوێ قسەم لەگەڵدا بکەیت؟ گوتی: دەمەوێت لەگەڵ هەندێ له کادری حزبەکەتان قسه بکەم و ناکۆکیەکانتان چارەسەر بکەم. که ئەو قسانەم بیست، پێمگوت: زۆرسوپاسی پەرۆشی زۆرت دەکەم بۆ کوردەکانی لوبنان، بەڵام بەداخەوە له نێوان کوردەکانی لوبناندا هیچ ناکۆکییەک بوونی نیە. بەدرێژایی قسەکردنم لەگەڵیدا دڵخۆش و دەم به خەندە بوو. له جۆری قسەکردن و شێوازی دەربڕینیدا خۆی به پیاوێکی پایەبەرز و دەستڕۆیشتوو دەزانی له ناو سەرکردایەتی بارزانیدا،

منـیش دەسـتمکرد بە گیرفانمـدا و ئەو ڕێگەپێـدانە ڕەسـمییەم پێشـاندا کە زەعیمـی شـۆڕش بـارزانی پێیـدابووم کە منـی وەک نـوێنەرو وتەبێـژی ڕەسـمیی خـۆی دەستنیشـان کردبـوو. ڕێگەپێـدانەکەی لێـوەرگرتم و دەسـتیکرد بە خوێنـدنەوەی، دەموچـاوی گرژبـوو و ئـارەقە بە نێوچاوانیـدا دەهـاتە خـوارەوە. هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە نەبوو، ئینجا گوتی: بەهەرحاڵ لە دوای تەواوبـوونی ئەو کـۆنگرەیە دەڕۆمەوە بـۆ کوردسـتانی عێـراق و لەگەڵ بارزانیدا لەسەر ئەو بابەتە قسە دەکەین کە تایبەت بوو بە پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان. لێرەدا بەڕێز شاخەوان ئەحمەد قسەکانی پێبڕی و گوتی "کاک جەمیل وتـارێکی ئامـادەکردووە بۆ کۆنگرە بە منـی گوت کە پیلانگێڕیی سەرانی پـارتی دیمـوکراتی کورد لە سوریا ڕسوا دەکات و بە توندی هێرش دەکاتە سـەریان، لە سـەرو هەموویـانەوە سـەلاح بەدرەدیـن، تـۆ ڕات چییە کـاک حەبیـب؟". کە گوێبیسـتی ئەوە بـوو لە کـاک شـاخەوان ئەحـمەد، داوای لێکـردم دەقـی وتـارەکەی پیشـانبدەم کە بە نیـازم لە کۆنگرەکەدا بیخوێنمەوە. بە گوێیم کرد و وێنەیەک لە وتارەکەم خستە بەردەمـی. هەنـدێ دەسـتەواژەی لابـرد کە تیایـدا باسـی سەلاح بەدرەدین کرابوو، هەروەهـا هەندێ شتی تری سڕییەوە، دیسـانەوە هەمـوو ئەو وشـانەی لابـردن کە مـن بۆ ستایشکردنی بـارزانی نوسـیبووم، لە کۆتاییـدا کـار گەیشـتە ئەوەی کە سـێ لاپەڕەی سڕییەوەو تەنهـا یەک لاپەڕەی بـۆ هێشـتمەوە. هۆکـاری

قایـل بوونیشـم بەوە ئەوە بـوو کە نەمدەویسـت لە سـتۆکهۆلم دووبەرەکییەکـان بتەقێـنمەوە. دوای ئەوە رۆژنـامەیەکی دەنگـی کـوردی هەڵگـرت کە زمانحـاڵی حزبەکەمـان بـوو لە لوبنـان، دەسـتیکرد بە خوێنـدنەوەی و دەسـتی کـرد بە رەخنەگـرتن لە هەندێ سەرکردەی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق.

دوای کۆتـایی کـۆنگرە، مەلا مسـتەفا بـارزانیم ئاگـادارکردەوە لەوەی کە حەبیـب مـحەمەد کەریـم چـی لە وتـارەکەم کـردووە و دامە دەسـتی بـۆ ئەوەی نییەتـی هەنـدێ لە سـەرکردەکانی خـۆی بزانێـــت. دوای گەڕانەوەم لە ســـتۆکهۆڵم و بەشـــداربوونم لە کۆنگرەی قوتابیـان، خوالێخۆشـبوو کەمـال جونبـولات[٢٢] وەزیـری ناوخۆ بوو، پێیراگەیاندم کە هەندێ لەو پارت و رێکخراوانەی کە لە رابـووردوودا بەبـێ مۆڵەت کاریـانکردووە، مۆڵەتێ رەسـمییان لەوەزارەتـی نـاوخۆ وەرگرتـووە. منـیش ویسـتم ئەو هەلە زێـڕینە بقـۆزمەوە بـۆ ئەوەی سـودی لێـوەربگرین و بتـوانین کاروبـاری حزبیی خۆمان بە ئاشکرا ئەنجام بدەین. هـاوڕێ لەگەڵ شـاندێکی حزبیـی گەورەدا، سـەردانی بەڕێـز کەمـال جونبـولاتم کـرد لە کۆشکی موختارە. کۆبوونەوەمان لەگەڵدا کرد و پرسـی خۆمـان و داواکارییەکانی رەوەندی کوردیمان لە لوبنان بۆ باسکرد و داوای

---

[٢٢]کەمـال جونبـولات (١٩١٧-١٩٧٧) رابەری دروزەکانی لوبنان بـوو، دامەزرێنەری حزبی پێشکەوتنخوازی سۆشیالیست بوو. سەرکردەیەکی بیرمەند و کەسایەتییەکی بەناوبانگی لوبنانی بوو. ساڵی ١٩٧٧ تیرۆر کراو وەلید جونبولادی کوڕی شـوێنی ئەوی گرتەوە. — وەرگێڕی کوردی –

مۆڵەتپێدانی ڕەسمیمان کرد بۆ ئەوەی بتوانین کارو چالاکییە سیاسی و حزبییەکانی خۆمان، وەکو هەموو حزب و ڕێکخراوەکانی تر، بە ئاشکراو بەشێوەیەکی یاسایی ئەنجام بدەین. لێرەدا بە پێویستی دەزانم بەناوی خۆم و بەناوی هەموو کوردەکانی لوبنان سوپاسی ئەو تێگەشتنەی بەڕێز کەمال جونبولات بکەم، بۆ داواکارییە ڕەواکانمان و ئاگاداربوونی لە هەموو کێشەکانمان و ڕەزامەندی پیشاندا بە پێدانی مۆڵەتی ڕەسمی و زۆری لێکردم بۆ ئەوەی پەلە بکەم لە دەستپێکردنی داواکەدا و لە ماوەی دوو ڕۆژ تەواوی بکەم، پێش ئەوەی حکومەت هەرەس بێنێت. بە پەلە داوایەکم بەرزکردەوە هاوپێچ لەگەڵیدا پەیڕەوی ناوخۆ و پرۆگرامی حزبەکەم بەرزکردەوە، وێڕای هەندێ ئاستەنگ کە لەلایەن ڕەوەندی کوردەوە بۆمان دروستکرا.

دواجار ڕۆژی ٢٤ی ئەیلولی ١٩٧٠ بوو، لەو ڕۆژەدا مۆڵەتنامەی ڕەسمیم بۆ پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان لە وەزارەتی ناوخۆ بەدەستهێنا. ئەو ڕۆژە بە ڕۆژێکی مێژوویی دەزانم، خۆشترین ڕۆژی ژیانم بووە، دوای تێکۆشانێکی بێوچان لە پێناوی کوردی لوبنان و پشتیوانی کردنی پرسی کورد ئەوەمان بەدەستهێنا... مۆڵەتەکەشمان لە ڕۆژنامەی ڕەسمیدا بڵاو کردەوە.

دوای هەفتەیەک لە وەرگرتنی مۆڵەتنامەی رەسمیی بریاری سەفەرکردنم دا بۆ کوردستانی عێراق، بۆ ئەوەی چاوم بە بارزانی و سەرکردەکانی شۆرش بکەوێت و ئەو مزگێنییە خۆشەیان پێبدەم، مزگێنیەک کە خۆم و هەموو کوردە شەرەفمەندەکانی لوبنان لە سەرئاگر بووین لە چاوەروانیماندا بۆی، تا بتوانین تێکۆشان وخەباتی خۆمان بە ئاشکرا بکەین.

کە گەیشتمە فرۆکەخانەی بەغدا، بەرێکەوت بەرێز بورهان جاف و خێزانەکەی خاتوو توبا خانم بینی، کە پێشتر لە لوبنان ئەوانم ناسیبوو. زۆر خۆشحاڵ بوون بە هاتنم و رێگەیان پێندەدام لە هۆتێل دابەزم، بەڵکو خۆشحاڵ بوون کە میوانی ئەوان بم، بەسوپاسەوە بۆ میوانداری و پێشوازییەکەیان، داواکەیانم جێبەجێ کرد. حەزم کرد هۆکاری سەفەرکردنەکەمیان بۆ کوردستان بۆ باس بکەم. پێمراگەیاندن کە لە لایەن وەزارەتی ناوخۆوە مۆڵەتنامەی رەسمیم بۆ پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان وەرگرتووە بۆ ئەوەی لەمەودوا بە ئاشکرا کارەکانی خۆمان بکەین و هۆکاری هاتنەکەشم بۆ باسکردن، کە دەمەوێت ئەو مزگێنییە بە برا کوردەکانمان لە کوردستان بگەیەنم و دیدار لەگەڵ سەرکردەکانی شۆرش بکەم و راوێژیان لەگەڵدا بکەم بۆ ئەوەی پێکەوە هاوکاری یەک بین لەپێناو بەرژەوەندییە باڵاکانی گەلی کورد لە هەر کوێ بێت. ئەوەیان زۆر پێخۆش بوو، گوتیان بیرۆکەیەکی زۆر باشە، هەموو کەسێک ئامادەیە بە زووترین کات

و بەبێ هیچ مەرجێک، دەستی هاوکاری درێژ بکات، بە تایبەت کە مۆڵەتی پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان روداوێکی زۆر مێژوویی و مەزنە و رێگاخۆشکەر دەبێت بۆ خەبات و تێکۆشانمان لە پێناو بەدەستهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانمان و سەرکەوتنە بۆ هەموو کورد بە شێوەیەکی گشتی.

رۆژی دواتر بەرەو کوردستان سەفەرم کرد، گەیشتمە حاجی ئۆمەران و رۆشتم بۆ بارەگای بارزانی، چووم بۆ دیوانی بارەگا، لە هۆڵی چاوەڕوانی مەسعود بارزانی و حەبیب محەمەد کەریم دانیشتبوون، سڵاوم لێکردن بەڵام بە شێوەیەکی زۆر لەخۆبایی و لوتبەرزانە وەڵامیان دامەوە، لە نزیکیانەوە دانیشتم. حەبیب ئاوڕی دایەوە بۆ ئەوەی قسەم لەگەڵدا بکات، بەڵام من زۆر رووم پێنەدا. دەستیکرد بە قسان و وتی: بێگومان تۆ بەهۆی ئەو بروسکەیەوە هاتویت کە بۆمان ناردیت وایە؟ پێمگوت: هیچ شتێک لەبارەی ئەو بروسکەیەوە نازانم کە تۆ باسی دەکەیت. هۆکاری سەرەکی هاتنم بۆ ئێرە ئەوەیە کە ئەمەوێت پێتان رابگەیەنم پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان مۆڵەتنامەی رەسمی لە وەزارەتی ناوخۆ وەرگرتووە، ئێستا ئیتر دەتوانین بە ئاشکرا کارەکانی خۆمان بکەین. هەندێ لەو نوسراوانەم بڕیبوون لە رۆژنامەکان کە لەسەر مۆڵەتنامە رەسمییەکە نوسرابوون و لەگەڵ خۆما هێنابووم، حەبیب وەریگرتن و دەستکرد بە خوێندنەوەیان، ئیتر رەنگوڕووی گۆڕا و شڵەژانی پێوە دیار بوو، دوای تەواو بوونی لە

خوێندنەوەیان دایە دەستی مەسعود بارزانی بۆ ئەوەی ئەویش تەماشایان بکات. دوای ماوەیەکی کورت هۆڵەکەیان بەجێهێشت بەبێ ئەوەی یەک وشە بڵێن. دوای ئەوە سەبارەت بە مۆڵەتنامەکە مەلا مستەفا بارزانیم ئاگادار کردەوە زۆری پێخۆش بوو.

لە گەڕانەوەیدا بۆ کوردستان لەدوای کۆنگرەی قوتابیان، حەبیب محەمەد کەریم، راپۆرتێکی خراپی لەسەر من دابووە مەلا مستەفا، لەگەڵ هەندێ لە بڵاوکراوەکانی حزبمان کە ئەو کاتە بەناوی "دەنگی رێکخراوی دیموکراتی کورد لە سوریا و لوبنان" دەردەکرا و تیایدا هەندێ وێنەی کاریکاتێرمان لەسەر کۆنگرەکە بڵاو کردبۆوە. کە رۆشتم بۆ کوردستان سەرکردایەتی زۆر لێم تورەو نیگەران بوو، وەکو جاران پێشوازیم لێنەکرا، نەمدەزانی هۆکاری ئەوە چییە. سێ دانە رۆژ لە دیوەخانی بارزانی دانرام بەبێ ئەوەی کەسێک پرسیاری هۆکاری هاتنم بکات. رۆژی چوارەم نامەیەکم بۆ بارزانی نوسی و مۆڵەتی چاوپێکەوتنیم داوا کرد. لە ئێوارەدا رەزامەندی هات و لەیەکێک لە ژوورەکانی بارەگا لەگەڵیدا کۆبوومەوە، شێخ بابۆی برا گەورەی و هەندێ لە خزمان و مستەفا جەمیل بەگ لەوێ بوون، هەمووومان لە خزمەتی مەلا مستەفا بارزانی دانیشتین. نزیکەی سەعاتێک لەلای ماینەوە، بە درێژایی ئەو کاتە خۆی سەرقاڵ کردبوو بە هەندێ کاری سوکەوە وەک هەڵکۆڵینی هەندێ شت[22]، بەبێ ئەوەی هیچ

---

[22] بارزانی بەردەوام خەریکی داتاشین و دروستکردنی دار سەبیلی جگەرە بوو، رەنگە ئەوەی نوسەر لێرەدا ئاماژەی بۆدەکات دار سەبیل بێت. رۆژنامەنوسی

قسەیەکم بە یەک وشەش لەگەڵدا بکات. تەماشایەکی شێخ بابۆی براگەورەیم کرد و داوام لێکرد قسەیەکم لای بارزانی بۆ بکات، ئەویش بە بارزانی گوت: مەلا مستەفا ئەوە بۆ ئیش و کاری جەمیل تەواو ناکەیت بۆ ئەوەی بتوانێت زوو بگەڕێتەوە بۆ لوبنان. بارزانی وەڵامی دایەوە و گوتی: لەنێوان هەردوو لایاندا گیرم خواردووە، یان ئەوەتا دەست لەکار کێشانەوەی حەبیب محەمەد کەریم و دکتۆر مەحمود عوسمان لە کاری سەرکردایەتی حزب پەسەند بکەم، یان ئەوەتا ڕێگەپێدانە رەسمییەکەی خۆم لە جەمیل وەربگرمەوە، ئینجا بەردەوام بوو لە قسەکردن و گوتی: جەمیل دڵسۆزترین کوردی لوبنانە بۆ شۆڕش و بۆ مەسەلەی کورد، نامەوێت هەرگیز دەستبەرداری بم، هەمان شتیش لەبارەی حەبیب محەمەد کەریم و دکتۆر مەحمود عوسمان دەڵێم، ئەوانیش دڵسۆزی شۆڕشن، کاتێک بە بۆمبی ناپاڵم بۆردومانیان دەکردین لە گەڵمدا مانەوە. کاتێک گوێبیستی قسەکانی بارزانی بووم، ئیتر وێنەی پیلانەکە لەبەرچاوم بە تەواوی ئاشکرا بوو، دڵنیا بوومەوە کە مەکتەبی سیاسی پیلانێکی ترسناکی بۆ داڕشتووم بۆ ئەوەی فشار بخەنە سەر بارزانی بیخەنە بەردەم دیفاکتۆی ئەوەی یان دەست لەکارکێشانەوە یان وەرگرتنەوەی ڕێگەپێدانەکەی من.

---

بەناوبانگی کورد کامەران قەرەداغی لە چاوپێکەوتنیدا لەگەڵ پێگەی درج لە رۆژی ٢٥-٣-٢٠١٩ سەبارەت بە دار سەبیلەکانی مەلا مستەفا دەڵێت: بارزانی بەردەوام خەریکی داتاشینی قامیش بوو نەشتەریکی تیژی بەدەستەوە بوو، دارەکەی هەڵدەکۆڵی. کاتێک قسەی لەگەڵ میوانەکاندا دەکرد چاوی هەر لەسەر دار سەبیلەکان بوو، سەیری میوانەکانی نەدەکرد. بڕوانە پێگەی درج کامیران قرەداغي، شاهد علی ثورة الکرد، ٦، مازقنا مع ایران و مع انفسنا. - وەرگێڕی کوردی -

نەمتوانی لەوە زیاتر بێدەنگ بم رووم کردە مەلا مستەفا بارزانی و گوتم: گەورەم هیچ زانیاریم لەسەر ئەوە نەبوو کە مەکتەبی سیاسی حزبەکەتان سیاسەتێکی ئەوەندە دوژمنانەی بەرامبەر من گرتۆتە بەر، ناشزانم هۆکاری چییە. داوا دەکەم رێگەم پێبدەن کە لەگەڵیاندا گفتوگۆ بکەم و بزانم هۆکارەکان چین و راستییەکان لەبەردەم جەنابتاندا روون بێتەوە، من ئامادەم رووبەڕووی هەموویان بوەستم و وەڵامیان بدەمەوە. کە لە قسەکانم بوومەوە مەلا مستەفا لە ژوورەکەی رۆشتە دەرەوە بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ، منیش دوای ئەو رۆشتم بۆ ژووری نوستن.

رۆژی دواتر بەیانی زوو، پاسەوانەکەی ئیدریس لە دەرگایدا، داوای لێکردم لەسەر جادەکە چاوەڕوان بم، بەبێ ئەوەی هیچی تر بڵێت. بیرم لەوە دەکردەوە کە پێی گوتم، ئیتر دڵەڕاوکە دایگرتم. رەنگە بارزانی فەرمانی دەستگیرکردنم بدات لەبەر ئەوەی کە پێمگوت ئالنگاری مەکتەبی سیاسی دەکەم ئەگەر بێن گفتوگۆم لەگەڵدا بکەن. ساتێک لەسەر جادەکە وەستام، دوای ئەوە ئیدریسم بینی بە ئۆتۆمبیلە بچوکە سورەکەی خۆی هات و داوای لێکردم لەگەڵیدا سەرکەوم بۆ ناوپردان بۆ بارەگای مەکتەبی سیاسی. داوام لێکرد بۆم روونبکاتەوە کە بۆچی دەبێت لەگەڵ ئەودا بڕۆم؟ پێیگوتم: من فەرمانی باوکم جێبەجێ دەکەم، دەتبەم بۆ بارەگای مەکتەبی سیاسی تاوەکو پێکەوە گفتوگۆ بکەن و بتوانن ناکۆکی و هەڵە تێگەیشتنەکانی نێوانتان چارەسەر بکەن و راستییەکان ئاشکرا بکرێن. هەستم بە ئاسودەیی ناخم کرد

کـاتێ گـوێم لەوە بـوو، زانـیم کە دەسـتگیرنەکراوم، بەڵکـو مەلا مستەفا بارزانی پێی خۆش بووە ئەوە جێبەجێ بکات کە من داوام لێکرد بۆ ئەوەی راسـتییەکان ئاشکرا بکرێن. ئەسعەد خۆشـەوی لەگەڵماندا بوو، گەیشتینە ناوپردان، ئیدریس داوای لێکردم جارێ لە دەرەوە چاوەڕوان بم، هەتا بانگی ژوورەوەم دەکەن. نزیکەی یەک سـەعات و نیـو لەژێـر هەتـاودا هەڵپروکـام تـا بـۆ دواجـار فەرمان دەرکراو یەکێک لە پاسەوانەکانی مەکتەبی سیاسی هات و داوای چوونە ژوورەوەی لێکردم. رۆشتمە ژوورەوە، ئیدریس و حەبیب محەمەد کەریم و دکتۆر مەحمود عوسـمان، کە هەموویـان ئەنـدامانی مەکـتەب سیاسـی بـوون، دانیشـتبوون. وەک داب و نەریتی رێز، سڵاوم لێکردن، بەڵام بەداخەوە کەسیان هەڵنەستانە سـەرپێ و لە شـوێنی خۆیانـدا نەجـوڵان و سـڵاویان نەسـەندەوە. راسـتەوخۆ لە نزیـک حەبیـبەوە دانیشـتم. بەبـێ هـیچ پێشـەکییەک دەستیان بە قسـان کـرد و منیش پێمگـوتن: دەبێت گفتوگۆکانمـان لەسـەر بنەمـای دیموکراسـیەت بێـت و لە گفتوگۆکانمانـدا رێـزی ئـازادی رادەربـڕین و وشـە بگـرین، ئەگەر نـا ئەوا مـن بێـدەنگ دەمێـنم و یەک وشـەش قسـە نـاکەم. دکتـۆر مەحمـود عوسـمان وەڵامـی دایەوەو گـوتی: ئـازادی رەهـات هەیە بـۆ قسـەکردن و دەربڕینـی بۆچوونەکـانی خـۆت. حەبیـب وێنەیەکـی لە پەیـڕەوی نـاوخۆی حزبەکەمـانی پێبوو، لاپەڕەکـانی ئەمدیوئەودیو دەکـرد و دەیخوێندەوە و بە دەموپلە ناسراوەکەی خۆی گوتی: ئەوە لێرەدا ئەو وشـەیەی سۆشـیالزمە چییە لەنـاو پەیڕەوەکەتانـدا هـاتوو، تـۆ

سۆشیالیستی؟ منیش لەوەلامدا گوتم، ئەگەر تۆ وشەی سۆشیالزمەکەت لا پەسەند نیە، ئەوە ڕێگام پێبدە کە پێت بڵێم نیوەی سەرکردایەتی حزبەکەتان شیوعین و تۆش خۆت یەکێکیت لەوان. دکتۆر مەحمود بە وەڵامەکەم خەنی و گوتی بەڕاستی گفتوگۆکانمان بە گیانێکی وەرزشیانەی دروست و لە کەشێکی تەواو دیموکراسیانەدا بەڕێوە دەچێت. ئینجا نۆرەی حەبیب کەریم هات بۆ قسەکردن و بە ئیدریسی گوت: ئەزبەنی ئێستا نۆرەی تۆیە بۆ قسەکردن، ئیدریس دەستی کرد بە قسەکردن و پێیگوتم: جەمیل دوای ئەوەی ڕێگاتان پێدراوە بە شێوەیەکی یاسایی چالاکی سیاسی خۆتان بکەن، پارتی دوای لێکۆڵینەوە لەو بابەتە لەو باوەڕەدایە کە ئێوە ئیتر پێویستیتان بەو ڕێگەپێدانە نەماوە کە مەلا مستەفا بە ئێوەی داوە، بۆیە دەبێت بۆمانی بگەڕێنیتەوە. منیش پێمگوت لاریم لەوە نیە کە بۆتان بگەڕێنمەوە بەڵام بەداخەوە لەگەڵ خۆما نەمهێناوە و لە لوبنان جێمهێشتووە، چونکە ئەگەر من لەگەڵ ئێوەدا بم لێرە پێویستیم بەوە نابێت. لە ڕاستیدا ڕێگەپێدانەکەم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو، بە ئانقەست پێمگوتن کە نەمهێناوە بۆ ئەوەی بتوانم وێنەیەکی ڕاستەقینەی لەبەر بگرمەوە و فۆتۆکۆپی بکەم. حەبیب جارێکی تر دەستی کردەوە بە قسەو گوتی: ئەزبەنی ڕێگە بدە عەزیز عەقراوی کە بە نیازی سەفەرکردنە بۆ ئەوروپا، سەرێک لە لوبنان بدات و ڕێگەپێدانەکە لە کاک جەمیل وەربگرێتەوە.

مەبەستی ئەم هەموو کۆبوونەوەو قسەکردن و پێچ لێدانە ئەوە بوو کە بە هەر شێوەیەک لە شێوەکان بتوانن رێگەپێدانەکە لەمن وەربگرنەوە، ئەویش لە تۆڵەی ئەوەی کە من لە کۆنگرەکەدا ئەوانم بەجۆرێک رسوا کرد کە دەنگدانەوەیەکی فراوانی هەبوو لەناو ئەندامانی کۆنگرە. بەر لەوەی قسەکانمان کۆتایی بێت، داوام لێکردن هاوکاری دارایی پێشکەش بە حزبەکەمان بکەن، لەو ساتەدا هەموو ئەوانەی لە کۆبوونەوەکەدا بوون تەماشای یەکتریان دەکرد بەبێ ئەوەی هیچ وەلامێکم بدەنەوە. هیچ بەڵێنێکم بۆ هاوکاریکردن لەوانەوە وەرنەگرت، تەنها هێندە نەبێت کە عەزیز عەقراوی دەنێرن بۆ ئەوێ و بەگوێرەی رێنماییەکانی شۆڕش قسەم لەگەڵدا دەکات.

دوای هەفتەیەک عەزیز عەقراوی گەیشتە لوبنان ، بەر لەوەی پەیوەندیم پێوە بکات، لەگەڵ هەندێک لەو کوردە سوریانەی کە نیشتەجێی لوبنان بوون کۆبوونەوەی کردبوو، لەگەڵیاندا رێکەوتبوو بۆ ئەوەی لە کاتێکی گونجاودا پیلانێک لە دژی من جێبەجێ بکەن. دوای ئەوە پەیوەندی پێوەکردم و هات بۆ لام بۆ ماڵەوە. چەندین قسەو باسمان کرد، یەکەم شت کە داوای کرد ئەوە بووکە ئەو رێگەپێدانەی بدەمەوە کە بارزانی پێیدابووم. دوای دڵنیا بوون لە وەرگرتنەوەی، قسەکانی تەواو کردو گوتی: بەر لەوەی لەگەڵ تۆ کۆبوومەوە لەگەڵ هەندێ کوردی دیکەدا کۆبوومەوە، من سەفەری ئەورووپا دەکەم دەتوانیت کوردەکان

ئاگاداربکەیتەوەو هانیان بدەیت بۆ ئەوەی بێنە ناو حزبەوە. دوای ماوەی مانگێک لە دەرچوونی بەیاننامەی رەسمیی حزب، کۆنگرەیەک ساز دەکەین و سەرکردایەتی نوێ بە گوێرەی دیدو بۆچوونی شۆڕش بۆ حزبەکە هەڵدەبژێرین، تا ئەو کاتەش من لە سەفەر دێمەوەو ناوی سەرکردە نوێیەکان وەردەگرم. دوای سەفەرکردنی ئەو بەیاننامەو بانگەوازێکمان بۆ کوردەکانی لوبنان دەرکرد، تیایدا هانماندان کە بێنە ناو حزبەوە. دوای تێپەڕبوونی مانگێک بەسەر بەیانی ناوبراودا، بە گوێرەی رێکەوتنم لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد کۆنگرەمان گرێدا. خۆم وردو درشتی ئەوپیلانەم دەزانی کە دایانڕشتبوو بۆ ئەوەی لە لوبنان جێبەجێی بکەن لەڕێگای هەڵبژاردنی سەرکردایەتی نوێ بەبێ من.

هەڵبژاردن بە رێورەسمی ئاسایی ئەنجامدرا، سەرکردایەتی نوێ لەو کەسانە دروستکرا کە ناویان لە وەزارەتی ناوخۆ تۆمارکراوەو مۆڵەتەکە بە ناویانەوە وەرگیراوە، ئەمە بەگوێرەی یاسا پەیڕەوکراوەکانی ناوخۆی لوبنان. دوای ئەوەی عەزیز عەقراوی گەڕایەوە بۆ لوبنان و کۆنگرەو هەڵبژاردن ئەنجام درابوون، پێشبینی ئەوەی نەکردبوو کە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بەو جۆرە بێت، ئەمە بۆ ئەو شۆکێکی گەورە بوو. تەماشای ناوی دەرچووەکانی کرد هیچ کام لەو کەسانەی تێدا نەبوو کە بەکرێگیراوی سەرکردایەتی پارتی بوون، بۆیە ئەنجامی

هەڵبژاردنەکانی پەسەند نەکرد و بەتوندی گوتی: من هەرگیز ددان بە شەرعیەتی ئەو سەرکردایەتییەدا نانێم.

گفتوگۆیەکی توند لە نێوانماندا رویدا، بەهۆی ئەوەوە پەیوەندی کرد بە حەبیب کەریمی سکرتێری پارتی لە بەغداد و باسی بارودۆخەکەو سەرکردایەتی نوێی حزبی لە لوبنان بۆ کرد، ئینجا هێڵەکەی داخستەوەو بەرەو عێراق گەڕایەوە. بەرلەوەی لوبنان بەجێبهێڵێت هات بۆ لام و گوتی: ئێمە لە سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە عێراق، هەرگیز ددان بە شەرعیەتی سەرکردایەتی تازەی حزبەکەتان نانێین، تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت کە ئەویش ئەوەیە رەزامەند بن بە زیادکردنی هەندێ کەس بۆ دەستەی سەرکردایەتی بەگوێرەی خواست و ئیرادەو رێنمایی ئێمە. پێمگوت دەتوانم بزانم ئەوانە کێن کە تۆ بە دەستوپەیوەندی خۆتانی دەزانن؟ گوتی: دەبێت چوار کەسی کوردی سوریا بخەنە نێو لیستی سەرکردایەتی خۆتان. منیش زۆر بابەتیانە بۆم باسکرد کە ئەمە ناکرێت و یاساکانی لوبنان رێگەی پێنادەن، هۆکاری ئەوەش ئەوەیە کە ئەو حزبە کوردییە لوبنانییە نەک حزبێکی نهێنی سوری و عێراقی تا هەندێ لە سەرکردەکانی کوردی غەیرە لوبنانی بن، جگە لە هەموو ئەوانەش پەیرەوی ناوخۆی حزبەکە رێگا نادات. لەوەڵامدا گوتی: ئەوە کۆتا داخوازی ئێمەیە و دەستبەرداری نابین، ئەگەر پەسەندی نەکەیت ئەوە دەبێت لەگەڵمدا بێیت بۆ ناوپردان لەوێ گفتو لەبارەی

کێشـەکانمانەوە دەکەیـن لەبەردەمـی بـارزانی خـۆی، پێمگـوت بەڕاستی پێت بڵێم من ناتوانم هەموو ڕۆژێک سەفەر بکەم و بێم و بڕۆم پارەی سەفەرم نیە. گوتی ئەگەر ئەوە هۆکار بێت ئەوە مـن ئامـادەم پارەی تێچـوونی هـاتن و ڕۆشتنەوەت بـۆ مەیسەر بکەم. منیش کۆبوونەوەیەکی ناکاوم لەگەڵ سەرکردایەتی حزبدا ئەنجامـدا، ڕێگایـان پێـدام لەگەڵ عەقـراوی بچـم بـۆ نـاوپردان. پیلانەکە ئەوە بوو کە ئیرادەی خۆیـان بەسەرماندا زاڵ بکەن تا بتوانن دەسەلاتی خۆیان بەسەر حزب و کوردی لوبناندا بسەپێنن.

## هەوڵێکـی نەزۆک بـۆ تێکـدانی ئەو حـزبەی کە مـن سەرکردایەتی دەکەم لە لوبنان

سێ ڕۆژ بەر لەوەی عەزیز عەقراوی لە گەشتەکەی خۆی لە ئەوروپاوە بۆ لوبنان بگەڕێتەوە، لە شوێنی کارەکەم بووم، کتوپڕ کەسێک هـاتە ژوورەوە و داوای دیتنـی جەمیل مەحـۆی کـرد. فەرمووم لێکرد و دامنیشـاند. پێمگوت جەمیل مەحۆت بۆ چییە؟ گـوتی لە عێـراقەوە هـاتووم و نـامەیەکم لە عوبێـدولا بـارزانی هـاوڕێی بـۆ هێنـاوە، کە زانیـویەتی ئەم کەسـە سـەفەری لوبنـان دەکـات داوای لێکـردووە ئەم نـامەیەی بـۆ بگەیەنێـت. نـامەکەم وەرگـرت و خوێنـدمەوە. نـامەکە لە ڕاسـتیدا لە لایەن عوبێدولا کـوڕە گەورەی بـارزانی ئیمـزا کرابـوو. داوام لێکـرد سـڵاوم بگەیەنێت بە شێخ عوبێدولا، بەڵام وەڵامی نامەکەم نەدایەوە.

کاتێک عەزیز عەقراوی هات، داوای لێکردم لەگەڵیدا بڕۆم بۆ کوردستان. لەگەڵیدا ڕۆشتم بۆ ئەوەی بارزانی هیچ بیرۆکەیەکی خراپی لا دروست نەبێت لەسەرم، هەروەها ڕۆشتم بۆ ئەوەی بەرگری لەخۆم بکەم و ناوەڕۆکی ئەو هەموو ڕاپۆرتە درۆینانە ڕاست بکەمەوە کە مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لە عێراق لە دژی من بۆ بارزانیان بەرز کردبۆوە. بەر لەوەی بڕۆین هەندێ ڕۆژنامەی لوبنانی دەنگوباسێکیان لەسەر هەوڵێکی تیرۆر کردنی ئیدریس بارزانیان لە بەغدا، بڵاو کردبۆوە. گەیشتینە بەغداد و لە یەکێک لە هۆتێلەکانی بەغداد دابەزین. بۆ بەیانی عەزیز عەقراوی بە تەنها لە هۆتێلەکە بەجێی هێشتم و ڕۆشتبوو بۆ بارەگای ڕۆژنامەی (التاخي – برایەتی) بۆ ئەوەی لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم کۆببێتەوە. دوای ماوەیەکی کەم، چەند کەسێک هاتن بۆ هۆتێل و هەواڵی عەزیز عەقراوییان لێپرسیم. دوای ئەوە لەگەڵیاندا ڕۆشتم بۆ نەخۆشخانەی جەمهوری بۆ دڵنیابوون لە تەندروستی بەرواری کە یاوەری ئیدریس بوو، قاچی زامدار ببوو لە ئەنجامی هەوڵی تیرۆرکردنی ئیدریسدا. کە چوومە ژوورەوە چاوم بە ساڵەح یوسفی و هەندێ لە سەرکردەکانی پارتی کەوت. دوای دڵنیا بوون لە تەندروستی بریندارەکە، پێکەوە گەڕاینەوە بۆ هۆتێلەکە بۆ ئەوەی چاوەڕوانی گەڕانەوەی عەزیز عەقراوی بین. کاتێ کە پاش نیوەڕۆ گەڕایەوە هەموو پێکەوە نانی نیوەڕۆمان خوارد. دوای تەواو بوونمان

عەزیز عەقراوی داوای لێکردم یاوەری بم بۆ بەسەرکردنەوەی کاروباری پارتی لە کەرکوک. کە گەیشتینە ئەوێ لە میوانداری بارەگادا بووین. منیان لە ژوورێکدا دانا لەژێر چاودێری توندا.

سێ رۆژ لە کەرکوک ماینەوە و دواتر رۆیشتین بۆ هەولێر کە بارەگای حزبی لێبوو. لەوێ سەردانی پارێزگار عەبدول وەهاب ئەتروشیمان کرد، دواتر هەستاین بە سەردانی بەڕێوەبەری پۆلیس شێخ رەزا، دوای ئەوە بەردەوام بووین لە رۆشتن بەرەو گەلاڵە. ئێوارە گەیشتینە ئەوێ و لە یەکێک لە هۆتێلەکان دابەزین، بەرە بەیانی رۆژی دواتر لە هۆتێلەکە دەرچووین و لەنێو شەقامەکانی گەلاڵە پیاسەمان کرد و هەندێ وێنەمان بۆ یادگاری و بۆ مێژوو چرکاند. بە رێکەوت چوینە ناو دوکانێکەوە بۆ کڕینی کەلوپەل، لەناو دوکانەکە سەبری بۆتانیمان بینی لەگەڵ کەسێکی تر کە بەرپرسێکی مەکتەب سیاسی بوو. لە نێوان سەبری بۆتانی و عەزیز عەقراوی گفتوگۆیەکی سەرپێیی کرا، بەرپرسەکە ئاوڕێکی دایەوە و بە عەزیز عەقراوی وت کە بارزانی بە فەرمانێکی تایبەت لێبوردنی بۆ هەریەکە لە جەلال تالەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد و عومەر دەبابەو عەلی عەسکەری دەرکردووە و رێگای داون کە بێنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش و لە کۆشکی باخۆس بمێننەوە. عەزیز عەقراوی وەڵامی دایەوەو گوتی: من بە توندی لە دژی گەڕانەوەی ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تالەبانیم بۆ ناو شۆڕش. ئەگەر بارزانی لەوانە بوراوەو قایل بووە کە بگەڕێنەوە،

ئەوا من واز لە شۆڕش دێنم، چونکە باشترە حەماڵی بکەم وەک لەوەی لەناو شۆڕشدا بم. کاتێک بینیم کە گفتوگۆکە بەرەو دەمارگیری دەڕوات رووی دەمم کردە عەزیز عەقراوی و گوتم: پێشنیاز دەکەم لە جیاتی ئەوەی حەماڵی بکەیت بێیت بۆلامان بۆ لوبنان لەوێ بەئەندامی حزب وەرت دەگرین. ئیتر هەموویان بۆ ئەو پێشنیازە دەستیان کرد بە پێکەنین و کەشێکی خۆش هاتە ئاراو گفتوگۆکان هێمن بوونەوە. دوای ئەوە بەرەو ناوپردان کەوتینە رێ. کە گەیشتینە ئەوێ چاومان بە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کەوت و لەوێ لە ژوورێکی تایبەت بە خۆیان لەژێر چاودێری توندا میوانداری کرام، هەستم بەوە نەکرد کە ئەوانە دەیانەوێت ناکۆکییەکانمان چارەسەر بکەین.

عەزیز عەقراوی منی دەستگیرکرد و بە یەخسیری منی دایە دەست مەکتەبی سیاسی. لەو کاتەدا دنیا زۆر سارد بوو، بەفر بە چڕی دەباری. لەناخی خۆما هیچ ئاسودە نەبووم، بەڵکو بێزارو دڵەڕاوکەم بوو. یەک هەفتەی رەبەق لە ژوورەکەدا منیان زیندان کرد بەبێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانم. دواتر بە شێوازی تایبەتی خۆم ئەوەم زانی کە عەزیز عەقراوی راپۆرتێکی وردو درشتی داوە بە مەکتەبی سیاسی بەهۆی گرێدانی کۆنگرەی تازەی حزبەکەمان. لەراپۆرتەکەدا سەرکردایەتی تازەی حزبمان رەتدەکاتەوە، کە دەرەنجامی کۆنگرەو هەڵبژاردن دەستنیشان کراون و بە گوێرەی رێنمایی و یاسا پەیڕەوکراوەکانی لوبنان

کۆنگرەمـــان کردبـــوو. لە جیـــاتی ئەوەی داوای کۆبـــونەوەیەکی تـــایبەت بکـــات لە نێـــوان مـــن و ئەنـــدامانی مەکتەبـــی سیاســـی بە ئامـــادەبوونی خـــودی عەزیـــز عەقـــراوی، بـــۆ ئەوەی کاروبارەکـــان روون بکـــرێنەوە و دەریـــچەیەک بـــۆ چارەســـەرکردنی نـــاکۆکی و گرفتەکانمـــان، بـــدۆزێتەوە، کەچـــی عەزیـــز عەقـــراوی دوای ئەوەی منی دایە دەست مەکتەبی سیاسی، خۆی دیار نەما!.

بـــووم بە بەنـــدکراوێکی مەکتەبـــی سیاســـی، تـــاکە شـــتێک کە دەمتـــوانی بیکەم ســـەبرو ددان بەخـــۆدا گـــرتن بـــوو. لە ژوورەکەدا بەنـــدکراوێکی تـــری لێبـــوو کە نەمدەناســـی دکتۆرێـــک بـــوو کـــوردی تورکیا بـــوو، لەگەڵ دکتـــۆر شـــڤان نـــاکۆکی هەبووە، ســـەرکردایەتی ئەو کـــاتە لایەنگـــری ئەمیـــانی دەکـــرد، بـــۆیە داوایـــان لەو دکتـــۆرە کردبوو کە واز بێنێت و بڕوات بۆ یەکێک لە وڵاتە ئەوروپییەکان. ئەو دکتـــۆرە پێـــی گـــوتم: کـــاک جەمیـــل ئەمـــانە بیســـت ســـاڵیش خزمەتیان بکەیت هەر نابیت بە برایان وەک کۆیلە سەیرت ئەکەن. ئەم دکتۆرە دوای ئەوەی دڵسۆزی منی هەستپێکرد باسی هەموو ئەو خزمەتگـــوزاری و قوربانیـــدانیانەی خـــۆی بـــۆ گێـــڕامەوە کە چەنـــــدین ســـــاڵ پێشکەشـــــی شۆڕشـــــی کـــــردوون و بەوپەڕی دڵسۆزیەوە کاری کردووە، هەروەهـا سـەرکۆنەی ئەوانەی دەکرد کە پشتیوانی خەڵکانی ناشەریف و نانیشتمانییان دەکرد.

هەفـتەیەک بەسـەر دەسـتگیرکردنمدا تێـپەڕی، بـارودۆخم زۆر خـراپ بـوو، بەزەییم بە خۆمـدا دەهـاتەوە. لەو بـاوەڕەدا بـووم کە

دەستگیرکردنم بەو شێوەیە درێژە دەکێشێت، بۆیە بڕیارمدا نامەیەک بۆ بارزانی بنوسم و بە دوورو درێژی هۆکارەکانی ناکۆکیم لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی روون بکەمەوە و هەموو پیلانگێڕییەکانیان لە دژی من و لە دژی حزب لە لوبنان، ئاشکرا بکەم. هەروەها باسی ئەو راپۆرتە بکەم کە عەزیز عەقراوی لە دژی من بەرزی کردۆتەوە، هەمووی بیرو بۆچۆنی خۆیەتی و من هیچ ناچمە ژێر باری ئەوە هەتا گفتوگۆیەکی رەسمی لەو بارەوە نەکرێت و بۆچوونی هەردولامان بە بەڵگە و بورهانەوە نەخرێتە بەردەم. نامەکەم زۆر کاریگەربوو لای بارزانی و دەستبەجێ دوای گەیشتنی نامەکە بە ماوەیەکی کەم، مەکتەبی سیاسی رەزامەندی دەربڕیبوو بۆ دیدارم لەگەڵ بارزانی.

لە بارەگای مەکتەبی سیاسییەوە لە ناوپردان، بە ئۆتۆمبیلێکی سەربازی رۆیشتم بۆ دیلمان، سەرۆکی دەزگای هەواڵگری ئەوکاتە شەکیب عەقراوی و دارا تۆفیق عەتار و سابیری کوڕی بارزانیم لەگەڵدا بوون. ئێوارە گەیشتینە ئەوێ و لە دیوەخان منیان دانا. لەوێ چاوم بە بەڕێز فاخرمێرگە سوری و شەفیق ئاغا و شێخ محەمەد عیسی کەوت کە دەهاتنە ژوورەوە. مستەفا بەگ لەو کاتەدا ببوو بە یاریدەدەری بارزانی، ناوی میوان و سەردانکەرانی بۆ دەبردە ژوورەوە. کە لە دیوەخانەکە هاتە دەرەوە پێمگوت مەوعیدی چاوپێکەوتنم هەیە لەگەڵ بارزانی و

دەبێت بە تەنها قسە بکەین چونکە کاری تایبەتە. مستەفا بەگ ڕۆیشت و دوای نیو سەعات هاتەوە و خۆی نزیک خستەوە لێم و چرپاندی بە گوێمدا: عوبێدولا سڵاوی هەیە بۆت و دەڵێت نەکەی هەرگیز نەکەی لای بارزانی باسی ئەو کەسە بکەیت کە ناردم بۆ لات بۆ بەیروت. پێمگوت: مستەفا چۆن دەبێت من ئەو شتە لە سەرکردەی شۆڕش بشارمەوە و پێی نەڵێم، ئەو متمانەی زۆری بە من هەیە، ئەمە واتای ئەوەیە کەمن شایەنی ئەو متمانەیە نیم. مستەفا بەگیش گوتی: گوێگرە جەمیل، ئەو پەیوەندییە تایبەتەی نێوان تۆ و عوبێدولا نابێت هیچ کەس هەرگیز بیزانێت. ئینجا زۆری هەوڵدا لەگەڵمدا بۆ ئەوەی قایلم بکات لای بارزانی باسی نەکەم. لەو کاتەدا بۆچوونم گۆڕا و باوەڕی پێهێنام کە هیچ لای بارزانی باس نەکەم و دەست نەخەمە نێو کاروباری ناوخۆی ئەوانەوە. مستەفا بەگ ئەوەی پێگوتم و منیش نەمدەزانی ئەو ناکۆکییە چییە لە نێوان عوبێدولاو بارزانی باوکیدا.

هەر بە کارە شەیتانییەکانی خۆی، مستەفا بەگ داوای لێکردم کە بە ئەندامی حزب وەریبگرم، دوو وێنەی دامێ، منیش فۆرمی ئەندامێتیم هەمیشە لە جانتاکەی خۆمدا هەڵدەگرت، لەگەڵ ناسنامەی ئەندامێتی. ناسنامەی حزبم پێدا و ئەویش ئیمزای کرد. فۆرمی ئەندام بوونی ئەو ژمارە ٨٢ی ڕۆژی ٣٠-١٠-١٩٧٠ ی لەسەر بوو.

بە گوێرەی ئەوەی کە من نوێنەری بارزانی بووم لە لوبنان، پێویستی دەکرد کە خۆی یاخود ئیدریس و مەسعود کەسێکیان لە ناکۆکییەکانی خۆیان و عوبێدوڵا ئاگاداریان بکردمایەتەوە، بەڵام منیان بە ئاگری ناکۆکییەکانی خۆیان سوتاند. بەبێ ئەوەی هیچ ئاگادار بم و هیچ پەیوەندییەکم هەبێت بەو قسانەی کە دەگوتران لەسەر جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵا لە دژی باوکی یاخود لە دژی شۆڕش.

دیدارەکەم لەگەڵ بارزانی کرد. بە هیچ جۆرێک باسی ئەو راپۆرتە نەکرا کە عەزیز عەقراوی لە دژی من نووسیبووی، بەڵام ئیدریس بە شێخ محەمەد عیسای گوت کە مەکتەبی سیاسی جەمیلی دەستگیر کردووە و ئێمەش لە چنگی ئاسنینی ئەوان رزگارمان کردووە. رۆژی دواتر ئیدریس هات بۆ لام و پێی گوتم کە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی راپۆرتەکەی عەزیز عەقراویان بینیوە و بڕیاریانداوە کە نوێنەرێکی مەکتەبی سیاسی رەوانە بکەن بۆ بەیروت بۆ ئەوەی ناکۆکیەکانتان چارەسەر بکات. دوای ئەوە نامەیەکی دامێ بۆ ئەوەی بیدەم بە دکتۆر مەحمود عوسمان، کە من چاوم پێی کەوت پێکەوە گفتوگۆمان کرد و لەسەر چەند خاڵێک رێککەوتین کە گرنگترینیان ئەوە بوو بە گەڕانەوەی من بۆ لوبنان کێشەکانمان چارەسەر بکەین و دەقی رێکەوتنەکەشی پێدام. زیاتر لەوەی چاوەڕێم دەکرد لە کوردستان مامەوە، پارەم هیچ پێنەمابوو. داوام لە دکتۆر مەحمود عوسمان کرد ١٥ دینارم

بداتی، بەوە توانیم بگەڕێمەوە بۆ لوبنان. لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەی کە لە نێوانماندا ڕویدا لەو باوەڕەدا بووم کە ئێمە ناگەینە هیچ چارەسەرێکی بنەڕەتی بۆ کێشەکان. تەنها شتێک کە ئەوان بە منیان گوت ئەوە بوو کەسێک ڕەوانەی بەیروت دەکەن بۆ چارەسەری کێشەکان.

لە کاتی دەستبەسەربوونمدا لە بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ناوپردان، لەگەڵ پاسەوانەکاندا قسەم دەکرد. ئەوان راشکاوانە بە منیان دەگوت کە مانگانە بڕی پێنج دینار موچە وەردەگرن. وێڕای ئەو موچە کەمە ئەوان ڕەزامەند بوون بەو جۆرە ژیانە. یەکێکیان گوتی: بەداخەوە هەرچەندە ئێمە پێشمەرگەین بەڵام هیچ جۆرە ڕێزێکمان لەکن ئەندامانی مەکتەبی سیاسی نیە، کاتێک کەسێکیان بەلاماندا تێپەڕ دەبێت، بەوپەڕی حورمەتەوە سڵاوی لێدەکەین، بەڵام بەداخەوە ئەوان سڵاو ناسەننەوە. کاتێک حەبیب محەمەد کەریم بەلاماندا دەڕوات ئەوەندە لوت بەرزو لەخۆباییە خۆی بە هەموو شت دەزانێت.

گەڕامەوە بۆ بەیروت، لە دوای تێپەڕبوونی پازدە ڕۆژ بەسەر گەڕانەوەمدا، لەگەڵ ئەندامانی لیژنەی ناوەندی حزبدا کۆبوونەوەم کرد، هەرچیم بەسەردا هاتبوو لە کوردستان، هەر هەموویم باس کرد. ئینجا دارا تۆفیق وەک نوێنەر گەیشتە لوبنان و لەلایەن مەکتەبی سیاسی پارتی بەڵگەنامەیەکی ڕەسمی بۆکرابوو، کە مەلا مستەفا بارزانی ئیمزای کردبوو، وێنەیەکی ئەو ڕێکەوتنەکەشی

لەگەڵدا هاوپێچ کرابوو کە لە نێوان من و ئەواندا کرابوو بە ئامانجی چارەسەرکردنی ئەو خاڵانەی کە لە ناوپردان لەسەری کۆک نەبووین بە ئامادە بوونی هەریەکە لە حەبیب محەمەد کەریم و دکتۆر مەحمود عوسمان و ئیدریس بارزانی.

بە گەیشتنی دارا بۆ فرۆکە خانەی بەیروت، تەلەفۆنی بۆ کردم و نامەکەی مەکتەبی سیاسی دامێ، کە دەقی ڕێکەوتنەکەی نێوانمانی تێدا بوو بەمجۆرەی خوارەوە:

1. نوێنەری شۆڕش دێت بۆ لوبنان، بۆ ئەوەی هاوکاری حزب بکات و لەگەڵ هەموو کوردەکانی لوبنان کۆبوونەوە بکات و هانیان بدات بۆ بوونە ئەندام لە حزب و هاوکاریکردنی سکرتێری گشتی ئەو حزبە بەڕێز جەمیل مەحۆ.
2. دوای ڕەتکردنەوەی دەرەنجامی کۆنگرەی یەکەم، کۆنگرەیەکی تازە دەبەسترێت و سەرکردایەتییەکی نوێ بۆ حزبەکە هەڵدەبژێردرێت، بە ئامادەبوونی نوێنەری شۆڕش و ڕێکەوتن لە نێوان نوێنەری ئێمەو بەڕێز جەمیل مەحۆ بۆ دیارکردنی سەرکردایەتی نوێ.

دوای ئەوەی هەموو نامەکانم لە مەلا مستەفا بارزانی و مەکتەبی سیاسی وەرگرت بەهەموو بەندەکانی ڕێکەوتنەکە قایل بووم. دارا تۆفیق عەتار داوای ئەوەی لێکردم کە ڕێکەپێدانێکی بە دەستوخەت بۆ بنوسم بەناوی حزبەوە بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئارەزووی خۆی و سەربەستانە هەموو ئەو شوێنانە بگەڕێت کە

کوردی تێدا نیشتەجێیە، هەروەها داوای لێکردم کۆبوونەوە لەگەڵ سەرکردایەتی حزب و هەموو ئەندامەکانیدا بکات. ئەوەی پێویست بوو لەو بارەوە فەرمانمدا جێبەجێ بکرێت.

کۆبوونەوەکە لە ماڵی دارا تۆفیق نوێنەری شۆڕش کرا. لە کاتی کۆبوونەوەکەدا داوای لێکردم بەهیچ جۆرێک هیچ قسەیەک نەکەم، بۆ ئەوەی ماوەی پێبدەم خۆی لەگەڵ هەریەکە لە ئەندامەکان قسە بکات، بە ئامانجی ئەوەی بە دید و بۆچوونی هەموویان ئاشنا بێت و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات. پروپاگەندەی بێ سەرو بەرەی ئەوەیان بڵاوکردبۆوە کە گوایا جەمیل مەحۆ لە حزبەکەدا دەستی بەسەر هەموو شتێکدا گرتووە و هەرچییەک خۆی بیەوێت ئەوە دەکات بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەنجومەنی سەرکردایەتی و حزب بۆ راوێژ و ئاڵوگۆڕی بیروڕا. لەبەر هەموو ئەوانە دەیویست بە تەنها لەگەڵ یەکە یەکەی ئەندامانی حزبەکەدا قسە بکات و بزانێت تاچەندە ئەو پروپاگەندانە راستن، بۆیە یەکە یەکە لەگەڵیاندا قسەی کرد. وەکو نوێنەری شۆڕش بە ئامادە بوونی سکرتێری گشتی حزب جەمیل مەحۆ، لەگەڵ یەکە بەیەکی ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیدا قسەی کرد.

دارا دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵیاندا، هەندێ پرسیاری لێدەکردن کە لە دەرەوەی بابەتەکەدا بوو، دوور بوو لەو رێکەوتنەی کە ئیمزا کرابوو. ئایا سکرتێری حزب ئاگادارتان دەکاتەوە لەو کارانەی کە ئەنجامی دەدات؟ وەڵام : بەڵێ ئاگاداری

هەموو شتێکن، سکرتێری گشتی ئەو بڕیارانە جێبەجێ دەکات کە لیژنەی ناوەندی حزب لەسەری ڕێک دەکەوێت. ئینجا دوای ئەوە ناو و ناونیشان و ساڵی پەیوەندی کردنی هەموویان و چەندین زانیاری تری تۆمار کرد. دوای تەواو بوونی لە کۆبوونەوەکە و بەر لەوەی هۆڵەکە بەجێبهێڵێت، ئامادەبووان داوایان لێکرد ئەو لاپەڕەیە بدڕێنێت کە ناو و ناونیشانی ئەوانی تێدا تۆمار کردووە. چاوەڕوانی ئەو هەڵوێستەی لەوان نەدەکرد، بۆیە بە ڕقەوە لاپەڕەکەی دڕاند و بە توڕەییەوە ڕوی لەوان کردو پێی وتن : بە جاسوسم دەزانن؟

دارا عەتار لە بەیروت مانگێک مایەوە، بەچەندین ڕێگا هەوڵیدا نەخشە پیلانگێڕییەکەی خۆی جێبەجێ بکات بۆ لەناوبردنی حزبەکەی لوبنان و چاندنی تۆوی دووبەرەکی لە نێوان کوردەکانی ئەوێدا. بە درێژایی مانەوەی هیچ دەرفەت و بۆنەیەک نەما نەیقۆزێتەوە بۆ هێرشکردنە سەر من و حزبەکە، درۆی هەڵدەبەست، پروپاگەندەی خراپی بڵاو دەکردەوە بەئامانجی ئەوەی دووبەرەکی بخاتە نێو ریزەکانی کوردەوە. زۆری هەوڵدا بە نهێنی پەیوەندی بکات بە یەکە یەکەی ئەندامانی حزبەوە بۆ ئەوەی واز لە حزبەکە بێنن و پشت بکەنە سکرتێری حزب، گوایا ئەمە لەبەر بەرژەوەندی گەلی کورد دەکات.

ئەم بەکرێگیراوە ژیانێکی زۆر ئاسودە و دەست بڵاوی بەسەر دەبرد، لە گرانترین و جوانترین هۆتێلەکانی بەیروت دەژیا لە

(الروشة)[٢٤] . کوڕەکەی شێخ مەحمود بە ڕێکەوت لە هەمان هۆتێل بوو، پێم گوت: دارا تۆفیق بۆ ریش هاتووە سمێلیشی نایە بان[٢٥].
ئەو تەلەفۆنی بۆ یەکە یەکەی کوردەکانی لوبنان دەکرد، بەڵام ناکام دەبوو سەرکەوتوو نەدەبوو لە تێپەڕاندنی پیلانەکانیدا و شکستی دەخوارد. پێمڕاگەیەندرا کە ئەو دەستیکردبوو بە جموجوڵی تێکدەرانە لەنێو ریزی کوردەکانی لوبنان، پەیوەندی بە زۆرێک لە سەرکردەکان و کادرە حزبییەکان و ئەندامانی لقی ناوچەکان کردبوو. کاتێک کە دڵنیا بووم ئەو کردەوە تێکدەرانانەی ئەو بە پێچەوانەی ئەو ڕێکەوتنەیە کە مۆرمان کردووە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش، پێمخۆش بوو بە شێوەیەکی سیاسیانە مامەڵە بکەم، ڕێنمایم دا بە هەندێک لەو ئەندامانەی حزب کە جێگەی متمانەم بوون، وەلامی داخوازییەکانی دارا بدەنەوەو لە گەڵیدا کۆببنەوە. داوام لێکردن زۆر بە توندی هێرش بکەنە سەرم، بۆ ئەوەی بتوانم لەو ڕێگایەوە نیازە چەپەڵەکانی تێبگەم کە بە کورتی بریتی بوو لە تێکدانی یەکڕیزی کورد و دردۆنگکردنی خەڵک لە بوونە ئەندام لە

---

[٢٤] ڕەوشە لە شاری بەیروت یەکێکە لە ناوچە هەرە گران و جوانەکان، دەکەوێتە سەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست و بەشێکی گرنگە لە کۆرنیشی بەیروت.- وەرگێڕی کوردی-.

[٢٥] لە ڕاستیدا نوسەر ئیدیۆمێکی عەرەبی لوبنانی بەکار هێناوە (خرج من تحت الدلف لتحت المزراب) لە بەرامبەر ئەمەدا ڕەنگە ئەو ئیدیۆمەی من بەکارم هێناوە نزیکترین بێت – وەرگێڕی کوردی – .

حزبێکدا کە بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی ئەوان دەکرد بۆ ئەوەی ئاواتەکانیان بهێنێتە دی بە مەرازی نەتەوەیی خۆیان بگەن. هەرچی لە دەستی هات کردی بۆ ئەوەی زۆرینەی کوردەکان لەگەڵ خۆیدا کۆبکاتەوە و بتوانێت لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا من کەنارگیر بکات و بەتەواوەتی لە حزب وەدەرمنێت و بە چەندین تۆمەت تاوانبارم بکات.

بەڵام شکستی دەخوارد، پیلانگێڕییەکانی شکستیان خوارد، سەرباری هەموو دەم چەورکردن و بەڵێنەکانیش، نەیتوانی ورەو پێزانین و خۆشەویستی کوردەکانی لوبنان بۆمن تێکبشکێنێت. هەرچەندە لە هەموو کۆڕو کۆبوونەوەو دانیشتنەکانیدا ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە ئەو نوێنەری شەرعیی بارزانییە، بەڵام زۆربەی جارەکان ئەندامانی حزب رووبەڕووی دەوەستانەوە کاتێک ناوی منی دەبرد و بە توندی هێرشی دەکردە سەرم. هەمیشە دووبارەی دەکردەوە کە شۆڕش ناخوازێت جەمیل مەحۆ سکرتێری حزب بێت، دەبێت کەسێکی تر بدۆزینەوە بۆ شوێنی ئەو، من لەسەر داوای سەرکردایەتی شۆڕش لێرەم.

دارا تۆفیق عەتار بەناو بەیروتدا دەسووڕایەوە، بە چەپ و راستدا هێرشی دەکردە سەرم، منیش داوام لێکرد بە گوێرەی رێکەوتنەکەی نێوان حزبی ئێمەو سەرکردایەتی شۆڕش با کۆنگرەیەکی نوێ ساز بکەین و هەڵبژاردنێک بە سەرپەرشتی خۆت ساز بکەین و بەمەش کۆتایی بە وتی وتی بێنین، کەچی

لەوەلامــدا گــوتی: "مــن بدان بەو ریکەوتــنەی نێــوان تــۆ و سەرکردایەتی شۆڕشدا نانێم". لەو وەلامەیدا تێگەشتم کە ئەو بە نیازە سەرکردایەتی تازەی حزب بە تەسکییەی خۆی بێت و چوار کوردی سوریاشــی تێدا بێت. لە گەل ئەو بۆچوونەدا نەبـووم، چونکە نایاسایی بوو، بۆم روون دەکردەوە کە ئەوە پەسەند نیە، چونکە لە پرۆگرام و پەیرەوی ناوخۆی حزبدا باس کراوە کە سەرکردایەتی بە هەلبژاردنێکی ئازاد و خاوێن هەلدەبژێردرێت. دارا لێــرەدا ددانــی بەوەدا نــا کە ئەگەر بێتــو هەلبــژاردن بە سەرپەرشتی خۆشی بکرێت ئەوە لەسەدا سەد ئەنجامەکەی لە بەرژەوەندی من دەبێت، بۆیە سەرکردایەتی شۆڕش سەرلەنوێ بە توندی فەرمانی کردووە بە دارا عەتار کە سەرکردایەتییەکی نوێ بە تەسکیە دروست بکرێت. بەمجۆرە ئەو تەنها بەوە قایل دەبوو کە خۆی دەیەوێت و ریکەتنەکە تەنها بە مەرەکەبی سەر وەرەقە دەزانێت.

دارا تۆفیق عەتار لە ناوەرۆکی ریکەوتنەکە لایدا جگە لەوەی بە ئاشکرا پێشێلی پرۆگرام و پەیرەوی ناوخۆی حزبی دەکرد، لە گیــانی برایەتــی نێــوان کــوردان و دیموکراســیەت، کە حــزبە کۆنەپەرستەکەی بانگەشــەی بــۆ دەکرد،لایـدەدا. بەردەوام بــوو لەسەر پیلانگێڕان وکردەوە تێکدەرەکانی خۆی. نامەو بروسکەی یەک لەدوای یەک بــۆ بارەگــای رۆژنــامەی برایەتــی و حەبیــب محەمەد کەریمی سکرتیری پارتی دیموکراتی کوردستان دەناردن.

هەنگاو بە هەنگاو پیلانەکانی خۆی لە دژی حزب و سکرتێری حزبەکە دەنارد. راپۆرتی درۆینە و هەڵبەستراوی دەنارد کە دووربوون لە راستییەوە، بۆ ئەوانی دەنوسی کە گوایا هەموو کوردەکانی لوبنان لە گەڵیدان دژی جەمیل مەحو. کاتێکیش لەگەڵیدا دادەنیشتم و دەکەوتمە گفتوگۆ لەسەر ئەو راپۆرتانەی کە رەوانەیان دەکات، دەیگوت: تۆ ئیستا بە تەنها ماویتەوەو کەست لە حزبدا لەگەڵ نەماوە! منیش زۆر بە سادەیی وەڵامم دەدایەوە و دەمگوت ئەگەر وایەو من بە تەنها خۆم ماومەتەوە وەرە با هەڵبژاردنێک بکەین و ئاشکرا بێت بۆ رایگشتی کورد لە لوبنان و دەرەوەی لوبنان کە جەمیل مەحو بە تەنها ماوەتەوەو شایەنی دەرکردنە.

هەمیشە پێمدەگوت: دارا تۆ بۆچی خۆت لە راستییەکان دەدزیتەوە، بۆچی هەڵدێیت لەبەردەم شەرعیەت و دیموکراسییەتی راستەقینە؟ وەڵامی دەدامەوەو دەیگوت: ئەگەر مل کەچی فەرمانەکانی شۆرش نەبیت، ئەوە حزب لە لوبنان وەک دارێکی وشکی بێ گەڵاو بێ بەر دەبێت. بۆ ئەوەی قوڵترو چڕتر دژایەتیم بکات و پیلانگێرییەکانی تەواو بکات، پەیوەندی بە سەرۆکی پارتە لوبنانییەکان و هێزە سیاسییەکانی لوبنانەوە دەکرد و بۆی روون دەکردنەوە کە شۆرشی کورد و رابەرەکەی مستەفا بارزانی، ددان بە پارتی دیموکراتی کورد لە لوبان نانێن بە سەرکردایەتی جەمیل مەحو، وێرای ئەوەش هیچ پەیوەندییەک

له نێوان شۆڕش و جەمیل مەحۆدا بوونی نیە. بیخەنە بەرچاوی خۆتان ئەو هەموو ژەهرەی لە دژی گەلی کورد و لە دژی من بلاو دەکردەوە، کە تەنها لە خزمەت دوژمنەکانماندا بوو، ئامۆژگاریم دەکرد کە واز لەو پروپاگەندە بێ شەرمانەیە بێنێت. بە گیانێکی برایانەی راستگۆ قسەم لەگەڵدا دەکرد، بەڵام بەداخەوە هیچ کاریگەر نەبوو لەسەری، بەڵکو هەموو بەهاو نەریتەکانی ژێر پێ خستبوو، کۆتا جار پێمگوت دارا گوێبگرە: من گوێ بە هیچکام لە سەرکردەکانتان نادەم، مل کەچی بڕیاری هیچ کەسێک نابم جگە لە رابەری شۆڕش؛ بارزانی، ئەگەر بە ڕاست ئەوەی ئێوە دەیڵێن راوبۆچوونی بارزانییە، ئەوا من ئامادەم دیدو بۆچوونی ئەو پەسەند بکەم، چونکە لەو باوەڕەدا بووم کە بارزانی سەرکردەیەکی ژیری شۆڕشە و راستییەکان بە وردی دەزانێت و ئەوەش دەزانێت کە لوبنان دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن سەروەرییە، دەستور و قەوارە و یاسای خۆی هەیە کە ڕێگا نادات لەناو حزبێکی لوبنانیدا خەڵکانی غەیرە لوبنانی تێدا بێت، چونکە هەر حزبێک لە لوبنان دەبێت ملکەچی یاساکان بێت. خۆشم بە تەواوی و بەبێ هیچ گومانێک لەو باوەڕەدا بووم بارزانی پیاوێکی هەقانییە و باوەڕی بە ئاژاوەو گێرەشێوێنی نیە و دەست وەرنادات لە کاروباری هیچ لایەنێکی کورد لە دەرەوە، باوەڕی رەهام بەوە هەبوو. چەندین جار کە من خۆی لە خزمەتیدا بووم لە حاجی ئۆمەران، گوێم لەوە بووە کە زۆر دژی

ئەوە بوو پارتی دیموکراتی کوردستان دەست وەربدات لە کاروباری حزبە کوردییەکانی دەرەوەی شۆڕش، بۆیە لەو باوەڕەدا بووم کە بارزانی ئەو گرێیە چارەسەر دەکات کە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی حزبەکەی دروستیان کردووە، بەبێ ئەوەی پرسیاری بۆچوونی ئەویان کردبێت یاخود ئاگاداریان کردبێت. بڕوایەکی تەواوی قوڵ و ویژدانیم هەبوو بەوەی کە ئەگەر بێتو هەر هەڵتێکەشتنێک یاخود بەرکەوتنێک لە نێوان من و مەکتەبی سیاسیدا ڕووبدات ئەوە بە دڵنیاییەوە بارزانی لایەنگری من دەکات، چونکە باوەڕەم وا بوو کە مەلا مستەفا بارزانی سەرکردەیەکی مەزنی دوور بین بوو، فریادڕەسی گەل بوو.

دارا تۆفیق عەتار شکستی خوارد لە جێبەجێکردنی پیلانەکەی و ئەرکە تێکدەرانەکەی لە دژی حزبەکەمان، هەروەک چۆن شکستی هێنا لەوەی کە بتوانێت کوردەکانی سوریا و تورکیا و عێراق، ئەوانەی نیشتەجێی لوبنان بوون، لە دژی ئێمە هانبدات. شکستی هێنا لە کردەوە گومانلێکراوەکانیدا بۆ تێکدانی یەکڕیزی کوردەکانی لوبنان بە سەرکردایەتی حزبەکەیان و لێدان لە کەرامەتی جەمیل مەحۆی سکرتێری حزب. سەرباری ئەوەی کە شۆڕشی کورد و هێزە کۆنەپەرستەکانی ناوخۆ پشتیوانی بوون، تەنانەت هەندێ لایەنیش کە خۆیان بە چەپ دەزانی، لەبەر ئەوەی دارا عەتار ڕاڕا بوو، چەندین ڕوخساری جیاوازی هەبوو.

لەبەردەم شیوعییە چەپەکاندا بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە خۆی مارکسییە و سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانیش چەندین کەسی مارکسی لەخۆ دەگرت لەوانەش حەبیب محەمەد کەریم، سالەح یوسفی، دارا تۆفیق، نوری شاوەیس و سامی عەبدول رەحمان و چەندانی تر کە بە نهێنی و بە ئاشکرا و بە گوێرەی بارودۆخ مارکسی بوون و لەهەمان کاتیشدا بەکرێگیراوی ئیمپریالیزم و هێزە کۆنەپەرستەکانی دنیا بوون. دارا عەتار لە یەک کاتدا بە دوو کارت گەمەی دەکرد، یەکەمیان لە دژی حزبەکەمان و دووەمیش لە پێناو دەرکردنی جەمیل مەحۆ و داماڵینی لە پلەی سکرتێری حزب.

وێڕای ئەوەی هێزەکانی چەپ و ڕاست هاوکاری دارا بوون بەو پێیەی کە ئەو نوێنەری شۆڕشی کورد بوو لە عێراق، بەڵام هەموو ئەو پیلانانەی کە بەنهێنی لە دژی من دایانڕشتبوو، شکستی خوارد، ئیرادەی گەلی کورد لە لوبنان بەهێزو یەکڕیز مایەوە و لە دڵسۆزی و تێگەشتنیاندا لایەنگری من بوون. ئەو ئیرادە پتەوە بەهێزتر بوو لە پیلانە چەپەڵەکانیان، بەهێزتر بوو لە دەستوەردانە راستەوخۆکانیان لەکاروباری ناوخۆی حزبەکەمان. کاتێ دارا عەتار بۆی ئاشکرا بوو کە لە ئەرکەکەیدا سەرکەوتوو نابێت، راپۆرتێکی دووروودرێژی نارد بۆ سەرکردایەتییەکەیان و داوای کردبوو کە بارزانی خۆی بێتە ناو کارەکە، بۆ ئەوەی رادەیەک بۆ کاریگەری و فراوانبوونی لایەنگرانی خەڵک لەو حزبە

دابنرێـت، داوایـان لە مەلا مسـتەفا بـارزانی کردبـوو کە خـۆی فەرمانێک بنوسێت و داوام لێبکات مەرجەکانی دارا عەتار پەسـەند بکەم بۆ ئەوەی ئابروی خۆی بپارێزێت.

دوای ئەوەی کە شـەکەت بـوو، گەیشـتە ئەو بـاوەڕەی کە ناتوانێـت ئەو حـزبە بڕوخێنێـت و زەفەر بەپـێگەی حزبیـی مـن بەرێت، پەنای بۆ فێڵێکی تر برد کە هیچ کەمترو سەفیلتر نەبوو لەوانی تر. ڕۆژێکیـان لە ئەپارتمـانتەکەی خـۆیەوە تەلەفـۆنی بـۆ کـردم و داوای کـرد پـێکەوە لای خـۆی لە (الروشـة) بەتەنهـا کۆببینەوە و گفتوگۆ پێکەوە بکەین بۆ ئەوەی سنورێک بـۆ ناکۆکی و هەڵەتێگەشتن دابنرێت و چارەسەرێکی عادیلانە بـۆ ئەو قەیرانە بدۆزینەوە کە لەنێـوان حـزبەکەی لوبنانمـان و پارتی دیمـوکراتی کوردسـتانی عێـراق هـاتۆتە ئـاراوە، ئەمەش لە بەرژەوەنـدی شۆڕشی کورد و نەهێشتنی ناکۆییەکان و پێکەوە کارێک بکەین بـۆ هەمـوو لایەک بە خێـر بگەڕێـتەوە و بـۆ پێشـەوە بەرەو ئەو ئامانجـانەی کە هەموومـان بـانگەوازی بـۆ دەکەیـن لە پێنـاو پاراسـتنی شـۆڕش و سـەرکەوتنیدا لە تێکۆشـانی نەتەوەیـی هـاوبەش. کە گوێم لە قسـەکانی بوو لە تەلەفۆندا، لە دڵـی خۆمدا پێکەنیـنم بەو قسـە جوانـانە دەهـات. داواکەیـم پەسـەند کـرد بە سوپاسـەوە بـۆ خەمخـۆری بەرامـبەر بە شـۆڕش و ئامـانجە

نەتەوەییەکانی و سەرکەوتنی لە گۆڕەپانی سیاسیدا. قایل بووم بەوەی کە لە رەوشە لە باڵەخانەی (البوتاجي) لەگەڵیدا دانیشم و گفتوگۆ بکەم.

لێرەدا من راشکاوانە ددان بەوەدا دەنێم کە باوەڕم بە نییەت پاکی ئەو نەبوو، بۆیە دەستم کرد بە بیرکردنەوە، زۆر بە قوڵی بیرم دەکردەوە تا بزانم لە دوای هەموو ئەو شتانەی کە کردنی و لە دوای ئەو هەموو پیلانانەی کە دایڕشتن و ئەو هەموو چەواشەکارییانە، بە تەمای چییە. لە دڵی خۆمدا گوتم جا لەوە زیاتر کە کردونی دەبێت چی تر بکات، لە کاتێکدا من نەفسیەت و بۆچوون و نیازەکانی دەزانم، گوتم گرنگ نییە، بەڵام کتوپڕ بیرۆکەیەکم بۆ هات. پێش ئەوەی بچم بۆ دانیشتن و قسەکردن لەگەڵیدا رۆیشتم بۆ فرۆشگایەک ئامێرێکی بچکۆلەی تۆمارکردنی دەنگم کڕی کە لەگیرفاندا دادەنرێت. فرۆشیارەکە سیفاتەکان و چۆنییەتی بەکارهێنان و دانانی لە هەر شوێنێکدا بۆ باسکردم. کاتێک فرۆشیارەکە باسی خەسڵەتەکانی ئەو ئامێری تۆمارکردنەی بۆ باسکردم، ئەوەندە دڵ خۆش بووم وەک دڵخۆشبوونم بە دیاری جەژن ئەو کاتەی منداڵێکی بچوک بووم. هەڵمگرت، زۆر دڵخۆش و شاگەشکە بووم. بە فرۆشیارەکەم گوت ئەگەر لەناو جانتاکەمدا دایبنێم هەر دەنگ تۆمار دەکات؟ پێیگوتم بەڵێ بێگومان. ئیتر دڵخۆشییەکەم زیاتر بوو. لەناو جانتاکەمدا خستمە نێو لاپەڕەو بەڵگەکانمەوە. لەکاتی دیاریکراودا چووم بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە و ئامێری تۆمارەکەشم کردەوە. مەبەستم

لەمە ئەوە بوو هەموو وتەکانی خۆم و هەموو قسەکانی ئەویش تۆمار بکەم، بۆ ئەوەی ئەو تۆمارە بەڵگەی حاشاهەڵنەگر بێت و هەموو ئەو قسەو گفتوگۆیانەمان بەبێ کەم و زیاد و لادان تۆماربێت. گفتوگۆ لە نێوانماندا دەستیپێکرد. ئامێری تۆمارەکە هەموو ئەو شتانەی کە لەنێوانماندا وترا تۆمار دەکرد. دارا دەستی کرد بە هێرشکردنە سەر حزبەکەمان و بەدەنگی بەرز گوتی (من لێرە لە لوبنان نوێنەری شۆرشم من بارزانیم). قسەی زۆر توندی دەکرد بە واتای ئەوەی کە جەمیل مەحۆ دوور دەبێت لە هەموو بزووتنەوەو حزبێکی کوردی ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانمان نەبێت. بە رێکەوت هەندی لە ئاژانەکانی خۆی لە کوردەکانی سوریا لەوێ بوون، بەجۆرێک خستبوویە مێشکی ئەمانەوە کە ئەو دەتوانێت هەموویان بخاتە ناو سەرکردایەتی حزبەوە لە لوبنان، ئەمانە ماستاوچی بوون و وەک سێبەری خۆی بە رۆژ و شەو بەدواوەی بوون. لەم کۆبوونەوەیەدا نەگەیشتینە هیچ تێگەشتنێک و هیچ چارەسەرێکی گونجاو بۆ نزیککردنەوەی دیدو بۆچوونەکان. دارا وەکو پێشەی جارانی پێداگر بوو لەسەر قسەکانی خۆی، سوربوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت کوردەکانی سوریا بە تەسکیە بخرێنە ناو سەرکردایەتی حزبەوە. منیش لە لایەن خۆمەوە بەهیچ شێوەیەک قایل نەبووم بەوەی کە ئەو دەیویست بەناوی شۆرشەوە بەسەر منیدا بسەپێنیت بەو پێیەی کە ئەو نوێنەری شۆرشەو خۆی بە بارزانی دەزانی و دەبوو ئەوەی کە ئەو دەخوازێت بەبێ هیچ سێ و

دوویەکێ جێبەجێ بکرێت. ئەوەی بەڕاستی جێگای سەرسوڕمان بوو بۆم ئەوە بوو کە دارا عەتار و حەبیب محەمەد کەریم و هەر یەکێک لە ئەندامانی سەرکردایەتی لە ناو پارتیدا خۆی بەوە دەزانی کە گەشتۆتە پلەیەکی زانستی بەرز، پرسیارم لە خۆم دەکرد بۆچی ئەوەندە سورن لەسەر ئەوەی کە شەڕی لابەلا بە حزبی ئێمە بفرۆشن، بەتایبەت کە بزووتنەوەکەی ئێمە هێشتا سەرەتای بوو، ئێمەش لە پێناوی هەمان ڕێبازدا خەباتمان دەکرد کە شۆڕش خەباتی بۆ دەکات. پرسیارم لە خۆم دەکرد کە داخۆ هۆکاری دژایەتیکردنی ئێمە دەبێت چی بێت، بۆچی هەوڵ دەدەن دەست بەسەر کاروباری ناوخۆی حزبی ئێمەدا بگرن؟ بەڵام نەدەگەیشتمە هیچ دەرئەنجامێک.دوای ئەوەی بۆم دەرکەوت هاوکاری لەنێوان ئێمەو نوێنەری شۆڕشدا بێسوودە، پەیوەندی نێوان هەردوو حزب پچڕا، چونکە من هیچ هیوایەکم بە هاوکاری ئەوان نەما، لەگەڵ ئەوەشدا من هیچ ڕێگایەک نەمایەوە پەنای بۆ نەبەم بۆ ئەوەی دید و بۆچوونەکانمان نزیک بکەمەوە و پێکەوە لە ڕێگای تێکۆشانی هاوبەش لە پێناو گەلی کورد بەردەوام بین. لەو باوەڕەدا بووم لە چوارچێوەی تواناکانی خۆمان لە لوبنان بەوپەڕی دڵسۆزی و خۆشەویستییەوە کار بکەین. چوار کەسی ئەندامی حزبمان کە خاوەنی پێگەو ناوبانگی باش بوون لەنێو رەوەندی کورد لە لوبنان و هەموو هاولاتییە شەرەفمەندەکانی لوبنان، تەرخانکرد بۆ ئەوەی لەسەرتا سەری لوبنان و لەهەر شوێنێک کە کوردی تێدایە، دەست بەگەڕان بکەن بۆ کۆکردنەوەی

پیتاک و رونکردنەوەی ئەو ناکۆکییانەی کە سەرکردەکانی شۆڕشی کورد لە پێش هەموویانەوە دارا تۆفیق عەتاری تێکدەر پەیرەوی دەکەن و لادانیان لە بیروباوەڕی راستەقینەی برایەتی نێو کوردان.

بەخت یارمان بوو، ئەو کەسانەی بۆ ئەو کارە ئەرکدار کرابوون، توانیبویان پیتاک کۆبکەنەوە و هۆکاری ناکۆکییەکان رون بکەنەوە و کارەکەی خۆیانیان بە باشترین شێوە جێبەجێ کردبوو، ئەنجامەکەی زۆر باش و بەسود بوو. لەناوچەی (القنطاری) بارەگایەکمان بۆ حزب بەکرێ گرت. لە مەراسیمێکدا بە رەسمی ئاهەنگی کردنەوەمان گێڕا. بۆ ئاهەنگی کردنەوەکە چەندین کەسایەتی سیاسی و خانەدانی لوبنانیمان بانگهێشت کرد، بۆ ئەوەی لەم بۆنە خۆشەدا بەشداریمان بکەن. لەناو بانگکراوەکاندا شێخ (بیار الجمیل[٢٦]) سەرۆکی پارتی کەتائیبی لوبنانی و سەرکردەکانی تری حزبەکە و (فرید جبران) بە نوێنەرایەتی کەمال بەگی جونبولات و هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی پارتی کوتلەی نیشتمانی و نوێنەرانی هەندی لە پارت و رێکخراوە رەسمییەکانی لوبنان ئامادە بوون.

---

[٢٦]حزبی کەتائبی لوبنانی ساڵی١٩٣٦ دروست بوو. لەسەردەمی خۆیدا یەکێک بوو لە حزبە راستڕەوە بەهێزەکانی لوبنان. لە دوای جەنگی ناوخۆی لوبنان، ئەم حزبە وردە وردە رۆڵی کەم بووە، بە تایبەت دوای ئەوەی دامەزرێنەرەکەی (بیار الجمیل) لە ساڵی ١٩٨٤ کۆچی دوایی کردو لە دوای ئەمیش بەهۆی کوژرانی چەند کەسایەتییەکی دیاری حزبەکە، ئیتر ئەو حزبە پەرتەوازەو لاواز مایەوە و تا ئێستاش هەر بە لاوازی لە گۆڕەپانی سیاسی لوبناندا کار دەکات. – وەرگێڕی کوردی –.

لە هەمان ئەو رۆژەدا دارا عەتار ئاهەنگێکی هاوشێوەی لە ماڵی یەکێک لە کوردەکانی سوریا لە نزیک بارەگای ئێمە ساز کردبوو، دارا لەوبەرەوە لەسەر شۆستەی بەرامبەر بارەگاکەمان بەچاوی خۆی دەیبینی کە چۆن کەسایەتییە سیاسی و رەسمی و حزبییەکان دێن بۆ بارەگای حزبەکەمان، ئەویش لەولاوە چەند کەسێکی غەوارەی ناردبووە بەردەم بارەگای حزبەکەمان بۆ ئەوەی شوێنی مانەوەی نوێنەری شۆڕشی کوردیان پیشان بدات. ئەم مانۆڤەرە مندالانەیە شکستی خوارد. سەرکەوتنی ئاهەنگەکەمان زۆر زۆر جوان و قەشەنگ بوو. بەر لەوەی بارەگای حزبەکەمان بکەینەوە دوو بروسکەم نارد، دانەیەک بۆ حزبی بەعسی عێراق و دووەمیش بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ ئەوەی بەشداربن لەگەڵمان لە کردنەوەی بارەگادا. حزبی بەعس داواکەمانی پەسەند کرد و شاندێکی رەسمی خۆی نارد، بەڵام پارتی دیموکراتی کوردستان هیچ نوێنەرێکی خۆی نەنارد، هەر ئەوەشی باشتر بوو.

دوای ئەوەی کردنەوەی بارەگاکەمان بەو شێوەیە بەڕێوە چوو کە، چەندین کەسایەتی سیاسی و خانەدان بۆ پیرۆزبایی هاتبوون، ئاشکرامان کرد کە ئێمە ئیتر سەربەخۆ بووین لە هەموو بزووتنەوە کوردییەکانی دەرەوە. دارا تۆفیق نەیتوانی زیاتر لە لوبنان بمێنێتەوە، وێڕای دارشتنی ئەو هەموو پیلانە و بڵاوکردنەوەی ئەو هەموو پروپاگەندە پوچانە، لوبنانی جێهێشت و بەدەست بەتاڵی گەڕایەوە بۆ عێراق. چەندین راپۆرتی پوچ و

چروکـی لە دژی مـن و حـزبەکەم بـۆ مەکتەبـی سیاسـی پـارتی دیموکراتی کوردستان لە عێراق پێشکەش کردبوو.

لەو کاتـانەدا ئـاژانێکی تـری ئیـدریس هەبـوو بەنـاوی کەمـال جەمیل ئاغـا، کە کـوردی سـوریا بـوو، لە بەرژەوەنـدی شۆڕشـی کـورد کـاری دەکـرد. هـاوژینەکەی ژنێکـی ئەڵمـانی بـوو کە لە بەیـروت نیشـتەجێ بـوو. ئەم پیـاوە لە نێـوان بەیـروت و بەغـداو کوردسـتان بەردەوام لە هـاتوچۆدا بـوو، زانیـاری کـۆدەکردەو دەیبـرد بـۆ بارەگـای بـارزانی. کاتێـک ئەم ئـاژانە دەگەڕایەوە بـۆ بەیروت، بەردەوام دەهات بۆ سـەردانم بـۆ ئەوەی چەنـدە بتوانێت زانیاری وەربگرێت و بینێرێت بۆ ناوپردان لە کوردستان.

## تۆمەتبارکردنم بە خیانەتی گەورەو بەکرێگیراوی

دوای ئەوەی دارا تۆفیق عەتار بەهیوا بڕاوی سەفەری کردەوە بۆ بەغدا، دووبـارە گەڕایەوە بـۆ بەیروت، ئەم جارەیـان نـامەیەکی بە خەتی بارزانی هێنابوو. نـامەکەی دامـێ و خوێنـدمەوە، بـارزانی داوای کردبوو کە لە جیاتی چوار کەس، دوو کەس لە کوردەکـانی سوریا لە سەرکردایەتی حزب لە لوبنان پەسـەند بکەم. لە کۆتـایی نـامەکەدا بـارزانی داوای کردبـوو سـەردانی بکەم بـۆ کوردسـتان. دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی نامەکە بوومەوە، زۆر بە جدی بیرم کـردەوە، لە نـاخی خۆمـدا پرسـیارم دەکـرد، ئایـا ڕەوایە ڕابەری شـۆڕش پشـتگیری ئەو سـەرکردایەتییە گەنـدەڵە لادەرە بکـات، کە

پیلان له دژی ماف و ئاواته‌کانی گه‌لی کوردمان ده‌گێڕێت له لوبنان؟ ئه‌وه راسته بارزانی کارێکی ئاوا ده‌کات؟ پرسیارگه‌لێکی زۆر به خه‌یاڵمدا ده‌هات، به‌بێ ئه‌وه‌ی هیچ وه‌ڵامێکیان هه‌بێت. زۆر سه‌رم سوڕمابوو. ناچار بووم کۆبوونه‌وه‌یه‌کی نائاسایی به سه‌رکردایه‌تی حزب بکه‌م بۆ گفتوگۆکردنی ئه‌و پرسه مه‌ترسیداره بزانین قایل بین یاخود نا. له‌و کۆبوونه‌وه‌یه‌دا زۆرینه له دژی ئه‌وه بوون که سه‌فه‌ر بکه‌م بۆ کوردستان، ته‌نها سێ که‌س له ئه‌ندامان قایل بوون به‌و سه‌فه‌ره. کورده‌کانی سوریا بۆچوونێکی تایبه‌تیان هه‌بوو به‌وه‌ی که سه‌رکردایه‌تی حزب پێویسته هاوکاری دارایی له‌هه‌ر سه‌رچاوه‌یه‌که‌وه بێت په‌سه‌ند بکات، بۆئه‌وه‌ی حزبه‌که بتوانێت خه‌رجی و مه‌سره‌فه‌کانی خۆی بدات، یان ئه‌وه‌تا ده‌بێت به‌بێ هیچ چه‌ندو چۆنێک بچێته ژێر رکێفی فه‌رمانه‌کانی شۆڕشه‌وه. هه‌ندێ پێتاکمان کۆکرده‌وه و تکتی فڕۆکه‌م بڕی بۆ گه‌شت کردن له به‌یروته‌وه بۆ به‌غدا. که‌سێکی کوردی سوریا به‌ناوی عه‌بدولکه‌ریم ئیبراهیم ناسراو به عه‌بدی ئیبراهیم داوای لێکردم یاوه‌ریم بکات، بۆ ئه‌وه‌ی وه‌ک شایه‌تێک له گه‌ڵما بێت له‌سه‌ر ره‌فتاره دوژمنکاره‌کانی دارا تۆفیق عه‌تار له‌دژی پارته‌که‌مان پارتی دیموکراتی کورد له لوبنان، بۆ ئه‌و مه‌به‌سته رۆشت بۆ باره‌گای شۆڕش. به‌ر له‌وه‌ی سه‌فه‌ر بکه‌ین له رۆژنامه‌که‌ماندا (ده‌نگی کورد) له لاپه‌ڕه‌ی یه‌که‌میدا ئه‌م هه‌واڵه‌مان بلاو کرده‌وه " گه‌شتی سکرتێری گشتی حزب به‌یاوه‌ری شاندێک بۆ عێراق". له‌گه‌ڵ گه‌یشتنمان بۆ به‌غدا، ته‌له‌فۆنم بۆ رۆژنامه‌ی

(التآخي)، زمان حالّی پارتی کرد، حەبیب محەمەد کەریم داوای لێکردم بەرلەوەی بڕۆم بۆ باکور، سەردانێکی بکەم. گەنجێکی عێراقی بەناوی حسێن ئەحمەد کە لەیەکێک لە زانکۆکانی بەیروت دەیخوێند و تازە پەیوەندی کردبوو بە حزبەوەو کردبوومان بە سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی حزبمان، بۆ پشوو گەڕابۆوە بۆ بەغدا، بە گەیشتنم تەلەفۆنم بۆ کرد و ئەویش هات بۆ لام بۆ هۆتێل و داوای لێکردم لەگەڵمدا سەفەر بکات بۆ کوردستان بۆ ئەوەی راشکاوانە لەبەردەم بەرپرسانی سەرکردایەتی شۆڕش بۆچوونی خۆی لەسەر دارا تۆفیق عەتار دەرببڕێت و پێیان بڵێت ئەوەی کە ئەو دەیکات تەنها کارێکی تێکدەرانەیە لە دەرەوەی گیانی برایەتی کوردان و بەرژەوەندی نەتەوایەتیمانە، کە زۆر بە پەرۆشەوە دەیپارێزین و دەمانەوێت بەهێزی بکەین. پێمگوت کە من لە رۆژنامەی (التآخي) مەوعیدی کۆبوونەوەم هەیە لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم، خواستی خۆی پیشاندام بۆ ئەوەی چاوی بەویش بکەوێت. لەگەڵ حسێن ئەحمەد لە کاتی دیاریکراودا رۆیشتین. چووینە نوسینگەی حەبیب محەمەد کەریم و سڵاومان کردو دانیشتین. لە پاش کەمێک عەلی عەبدوڵا هاتە ژوورەوە، بەبێ ئەوەی هیچ سڵاوێکمان لێبکات، هەروەک چۆن پێشتریش حەبیب محەمەد کەریم سڵاوەکەی نەسەندینەوە، گوێمان پێنەدەدان. بە حەبیب محەمەد کەریمم گوت: نامەیەکم بۆ ناردبوویت و تیایدا بارودۆخی لوبنانم بۆت نوسیبوو، بەڵام هیچ وەڵامێکی نامەکەم وەرنەگرتەوە. لە وەڵامدا گوتی: نامەکەت درەنگ گەیشتە دەستم.

بۆ زانیاری من نامەیەکی دوور و درێژم بە دەستی کوڕە مامی سامی عەبدول ڕەحمان، وەزیری ئاوەدانکردنەوەی باکور، کە بۆ کاری تایبەت هاتبووە بەیروت، بۆ ناردبوو. لە کاتی گفتوگۆکانماندا باسی چەندین پرس و پرۆژەی حزبیمان کرد، ئەو فرسەتەم بەهەل زانی و بۆچوونی تایبەتی خۆمم دابە حەبیب محەمەد کەریم، کە ئەویش ئەوە بوو دارا تۆفیق عەتار و عەزیز عەقراوی بگۆڕین بەو خەڵکە حزبییانەی کە ناسراون بە دەستپاکی و دڵسۆزییان بۆ ڕێبازی بارزانی، نەک ئەوانەی کە بانگەشە بۆ بیروباوەڕی هاوردەکراو دەکەن. هەروەها داوام لێکرد کە خۆی بە شەخسی بێت بۆ لوبنان، بۆ ڕێکەوتن و لابردنی هەموو ئەو ئاستەنگانەی کە دێتە ڕێگامان و دەبێت هەموومان پێکەوە یەک دەست بین.

کاتێک بە سەرسوڕمانەوە هۆکاری نەهاتنیم بۆ لوبنان لێپرسی گوتی: کاکە تۆ بارزانی نیت تۆ لوبنانیت. پێمگوت: بەڵێ شانازی بە لوبنانی بوونمەوە دەکەم، بەڵام کە دەڵێیت من بارزانی نیم، ئەوە ڕاستە کەمن سەر بە خێڵی بارزانی نیم، بەڵام شانازی بە بارزانییەوە دەکەم، وەک سەرکردەو پاڵەوان و فریادڕەسی گەلێکی مەزن بڕوام پێیەتی. کە گوێی لەم قسانە بوو، دەستی کرد بە پێکەنین و بێپسانەوە قاقای لێدەدا، وەک مرۆڤێک کە ئەقڵی خۆی لەدەست دابێت، ئینجا بەو پەڕی پڕوپوچی دەستی کرد بەقسە کە مایەی پێکەنین بوو. پێمگوت: حەبیب ئەوە چیت بەسەرهاتووە، هیچ هۆکارێک هەیە بۆ ئەو پێکەنینە هستیریەت؟

با ئێمەش لەگەڵتا پێکەنین. ئینجا وازی لە قاقا هستریییەکانی خۆی هێناو دەموچاوی گرژ کرد و بە شێوازە بەدڕەفتارەکەی خۆی گوتی: دەبێت بڕۆیت بۆ باکور منیش خۆم لەدوای دوو رۆژی تر دێم.

کە لە نوسینگەکەی ئەو چووەمە دەرەوە لە رۆژنامەی (التآخي)، لە دەرەوە ئەو قوتابییەی کە لە گەڵمدا بوو ئەحمەد حسێن، چاوەڕوانی دەکرد. ئەویشیان بانگ کردە ژوورەوە بۆ لای حەبیب، ماوەیەک لە نوسینگەکەی حەبیب مایەوەو دواتر هاتە دەرەوە و داوای لێبوردنی لێکردم کە ناتوانێت لە گەڵمدا بێت بۆ کوردستان، چونکە ئۆتۆمبیلەکەی بەرگەی ئەو هەموو هەڵبەزو دابەزەی شاخەکان ناگرێت. پێدەچوو حەبیب محەمەد کەریم زۆری بۆ هێنابێت و هەڕەشەی دەستگیرکردنی لێکردبێت ئەگەر لەگەڵما بڕوات بۆ کوردستان، بەڵام ئەو قوتابییە هیچ شتێکی لەبارەی وتووێژەکانی لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم بۆ باس نەکردم، دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەو کەسە ناپاک بووە، چونکە ئەگەر راستیی قسەکانی نێوان خۆیی و حەبیبی بۆ باس بکردمایە ئەوە پەشیمان دەبووومەوە لە رۆیشتن بۆ کوردستان و هەر لەوێوە، لە بەغداوە دەگەڕامەوە بۆ بەیروت. لێرەوە بۆم ئاشکرا بوو کە حسێن ئەحمەد خیانەتی لێکردم. نەهاتنی ئەو لەگەڵمدا بۆ کوردستان لە چوارچێوەی هەمان ئەو پیلانگێڕییەدا بوو کە حەبیب محەمەد کەریم و تاقمەکەی لە مەکتەبی سیاسی بۆیان داڕشتبووم. سەبارەت بە خۆشم ئامانجی سەفەرەکەم بۆ

کوردستتان ئەوە بوو کە دانوستانێکی ئەرێنی بکەم، دیدو بۆچوونی خۆم بە بارزانی بگەیەنم سەبارەت بە بارودۆخی کورد و حزبەکەمان لە لوبنان.

بڕیارمدا بڕۆم بۆ ناوپردان، لەوێشەوە بۆ مەکتەبی سیاسی. لەوێ کەمێک لەسەر پردەکە وەستام. ئۆتۆمبیلێکی سەربازی بەبەردەممدا تێپەڕی کە ئیدریس و مەسعود بارزانی تێدا بوو. کە منیان بینی ئۆتۆمبیلەکەیان لەبەردەممدا راگرت. سڵاوم لێکردن، ئیدریس وەڵامی دامەوە بەڵام مەسعود فزەی نەکرد، هەروەک ئەوەی نەمناسێت. ئیدریس داوای لێکردم دەستبەجێ بڕۆم بۆ دەربەندی، دوایی خۆی لەوێوە دەمبات بۆ ناوپردان. داواکەی ئیدریسم بەجێهێنا و بڕیارمدا بچم بۆ دەربەندی، کە گوندێکی جوانی کوردستان بوو، دیمەنێکی دڵڕفێنی جوانی هەبوو. گەیشتمە دەربەندی و خەیاڵم هەر لای حسێن ئەحمەد بوو، کە سەرەتا زۆر گەرم و گوڕ و پەرۆش بوو، کەچی لەپڕ بەشێوەیەک گۆڕا کە جێگای سەرسوڕمان بوو، بەتایبەت دوای ئەوەی کە حەبیب بانگی کرد. نازانم رۆڵی ئەحمەد حسێن لەو پیلانەدا چییەو داوای چییان لێکردووە. هەموو ئەو خەیاڵانە سەرەتا وەکو شریتێکی سینەمایی دەهاتە بەرچاوم کە هیچ پەیوەست نەبوون بەیەکەوە، بەڵکو هەمووی دیمەن و راستی بوون کە بیرکردنەوەی قوڵیان دەویست تاوەکو مرۆڤ کۆدەکانیان بکاتەوە و بتوانێت ئەو ئامانج و مەبەستانە بزانێت کە مەکتەبی سیاسی دەخوازێت بەدەستیان بێنێت.

له دڵی خۆمدا گوتم "چی دەبێت با ببێت"، خۆم کرد به قاوەخانەیەکدا بۆ ئەوەی کوپێک قاوە بخۆمەوە. لەوێ چاوم کەوت به ژمارەیەکی زۆر له کوردەکانی سوریا، له ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کورد له سوریا، بەهەردوو باڵی راست و چەپەوە، لەگەڵ کوتلەی ناوەڕاست و چەندین کەسی تریش که خۆیان به سەرکردەو بەرپرس دەزانی. هۆکاری هاتنیان ئەوە بوو که ناکۆکییەکانی نێوانیان چارەسەر بکەن (بێگومان له ئەنجامی پیلانگێڕی مەکتەبی سیاسی)، که نەیانتوانیبوو له نێوان خۆیاندا به شێوەیەکی دیموکراسی و تەندروست چارەسەری بکەن، بۆیه پەنایان هێنابوو بۆ بارزانی بۆ ئەوەی چارەسەرێک بۆ ئەو ناکۆکیانەی نێوانیان بدۆزێتەوە، که مەکتەبی سیاسی سەرکەوتووانه بۆی دروست کردبوون. رەنگه مەکتەبی سیاسی شایەنی سوپاس بێت له پای تێکدانی برایەتی نێوان کوردان و خیانەتکردنی له مەسەلەی کورد که لەهەوڵ و تێکۆشاندا بوو لەپێناو مافه رەواکانیدا. هەرچی ئەندامانی چەپی کوردەکانی سوریاش بوون لەژێر چاودێری توندا بوون، یاخود دەستبەسەر کرابوون. پیلانه تێکدەرانەکەی مەکتەبی سیاسی بەوجۆرە بوو.

رۆژی ١٩-٥-١٩٧١ لەگەڵ ئیدریس له بارەگای مەکتەبی سیاسی مەوعیدم هەبوو له ناوپردان، به لایەنی پەیوەندارم راگەیاند کەمن هاتووم و لەنزیک بارەگای دکتۆر مەحمود عوسمانم.

دوای ماوەیەکی کورت، یەکێک لە پاسەوانەکان هات و بانگی کردمە ژوورەوە و سلاوم کرد. هەریەکە لە ئیدریس و حەبیب و دکتۆر مەحمود عوسمان و مەسعود لەوێ بوون، کە هەموویان ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوون. دانیشتم و دەستمان بە قسان کرد و چەندین پرسی حزبیمان باس کرد. مەسعود پرسیاری لێکردم و گوتی: کاک جەمیل بەرای تۆ هۆکاری ئەوە چییە کە تا ئێستا ئێمە نەمان توانیوە لەگەڵ تۆ بگەینە ئەنجامێک بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە لە نێوانماندا سەریهەڵداوە؟ دەتوانی ئەوەم بۆ شیکەیتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک میانگیریمان بکات، بەڵکو لەم دانیشتنەدا بتوانین کێشەکان چارەسەر بکەین و کۆتایی بە کارەکە بێنین. پێکەنیم و بە مەسعودم گوت: پرسیاری هۆکارەکانم لێدەکەیت وانیە؟ ئێستا من بەوپەڕی راشکاوی قسە دەکەم، ناکۆکییەکانی نێوانمان ئەو هەموو پێچ و پەنایەی ناوێت. ئەگەر نییەتی دڵسۆزانەمان هەبێت لەپێناو خزمەتکردنی مەسەلە گەورەکاندا، ئەو کاتە بابەتەکە تەنها یەک دانیشتنی راستگۆیانەی دەوێت، ئیتر دڵمان پاک دەبێتەوە و هەموو پێکەوە دەست لەناو دەست لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانماندا بەوپەڕی دڵ گەرمی و دڵسۆزی و تێگەشتنەوە کار دەکەین.

کاک مەسعود باش گوێم لێبگرە؛ نوێنەرەکانی ئێوە کە دێن بۆ لوبنان، نە ئەدەبی دانوستان دەزانن نە رێساو شێواز و سیاسەتەکانیشی، لێرەدا من نمونەیەکی ژیرانەتان بۆ دەهێنمەوە

بۆ ئەوەی دیدو بۆچوونی من بزانن. نامەوێت دەستدرێژی بکەمە سەر کەس، بۆ سەلماندنی ئەوەش دەڵێم گەورەترین پارێزەر ئەوە نییە کە بەرگری لە پرسێکی گەورە بکات، بەڵکو ئەو کەسەیە کە بەڵگەو دۆکیومێنتی وا پێشکەش دەکات ئەقڵ نەتوانێت پەسەندی نەکات، ئەمەش هەر بۆخۆی دەبێتە راستییەکی رەها، بۆیە ئێستا بەدەنگی خۆی ئەوەتان دەخەمە بەردەم کە نوێنەرەکەتان دارا تۆفیق لە کاتی گفتوگۆو دانوستاندا بەناوی ئێوەوە چی دەڵێت، دوایی خۆتان حوکم بدەن. لێرەدا ئامێری تۆمارکردنەکەم بۆ کردنەوە بەدەنگی دارا تۆفیق، دەستیان کرد بە گوێ گرتنی، هەر هەموویان بە جۆرێک بێدەنگ بوون وەک ئەوەی خۆڵی مردوو بەسەریاندا کرابێت، کشومات، گوێیان شلکردبوو بۆ قسەکان. دەموچاویانم دەبینی رەنگی دەهێناو رەنگی دەبرد. هەموویان گوێبیستی ئەوە بوون کە بە ناویانەوە دەگوترێت، بە تایبەت کە هاواری دەکرد و هەڕەشەی لە حزبی کوردیی لوبنان دەکرد، دەیگوت و دەیگوتەوە، وا دەکەم و ئەوە دەکەم ... تاد.

لە سەروبەندی ئەم سوپرایزەدا کە هیچ کەس پێشبینی نەدەکرد، حەبیب خۆی لار کردەوەو چرپاندی بە گوێی مەسعوددا، کە بەتەواوی گوێ قولاغی کاسێتەکە بوو، زۆر بە بایەخەوە گوێبیستی هەموو وشەیەک دەبوو کە دارا تۆفیق عەتار دەیگوتن لە هەڕەشە و هاش و هوش، مەسعود ئاوڕی بۆ دامەوەو گوتی: کاک جەمیل چۆن بە نهێنی دەنگی نوێنەری

شۆڕش تۆمار دەکەیت؟ بە تورە بوونێکی ڕێزدارەوە گوتم؛ منیش نوێنەری بارزانیم و دەبێت هەموومان دڵسۆزو ملکەچ بین لە پێناو مەسەلەی کوردا. شۆڕش موڵکێک نییە هەر کەسێک بێت و بتوانێت لە پێناو بەرژەوەندی و ئارەزووەکانی خۆیدا بەکاری بێنێت. بەم تۆمارکردنە ویستم تەنها جارێک بەشێوەیەکی ئەقڵمەندانەو لۆژیکی ئەوە تێبگەن هۆکاری ئەوەی کە ناگەینە هیچ ئەنجامێک لە بەرژەوەندی شۆڕشماندا ئەوەیە کە خەڵکانی نمونەی دارا عەتار دەنێرن بۆ گفتوگۆ کە هیچ لە ئەدەبی گفتوگۆ و زمان پاراوی و سیاسەت نازانن.

ئەو کەسانەی بە نوێنەر ڕەوانەی لوبنان دەکرێن و بەناوی شۆڕشی پیرۆزمانەوە قسە دەکەن، دێن بۆ تێکدان و گێرەشێوێنی و پیلانگێڕان لە دژی جەمیل مەحۆ و حزبەکەی و لەناو بردنی هەردوکیان پێکەوە، ئینجا کاتێک لە لوبنان دەگەڕێنەوە دەست دەکەن بە نوسینی ڕاپۆرتی پڕوپوچ و بێ بنەما کە هیچ ڕاستییەک لەخۆ ناگرێت، بەڵگەی ئەوەش قسەکانی نوێنەرەکەتان بوو کە گوێتان لێگرت. با ئیتر پیلانگێڕی وەلا بنێین و واز لە خۆخۆری و ئاژاوە بەناوی شۆڕشەوە بێنین. ئێستا کاتی ئەوەیە هەڵەکان ڕاست کەینەوە، ڕاستی بخەینە سەر ڕێچکەی خۆی هەموو دەست لەناو دەست بین لە پێناو خەباتێکی دیموکراتیانەی شەرەفمەندانە بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی گەلی کوردمان، ئیتر با بەس بێت جادوکردن با بەس بێت درۆکردن و ڕیاکاری.

مەسعود دەستی برد بۆ دوگمەی ئامێرەکە و دەنگەکەی وەستاند. دەموچاویان سور هەڵگەڕابوو، ئارەقە لە نێو چاوی ئامادەبووان دەچۆڕایەوە، لەوانەش مەسعود. لەم کاتەدا یەکێک لە پاسەوانەکان هات و بانگی کردین بۆ نان خواردن. قسەکانمان وەستاند و هەموو هەستاین بۆ سەر خوان. دوای تەواو بوونمان، مەسعود داوای لێکردم جارێکی تر لە رۆژی دادێ کۆببوونەوە بکەین.

رۆژی دواتر کە رێکەوتی ٢٠-٥-١٩٧١ بوو، من و ئیدریس و مەسعود، لە بارەگای خۆیان لە قەسرێ کۆببووینەوە. کاک ئیدریس دەستی بە قسان کرد و گوتی: کاک جەمیل چۆن هاتیت بۆ ناو شۆڕش؟ گوتم لە رێگای بەغداوە، گوتی لەگەڵ سەدام حسێن کۆببوونەوەت کرد؟ گوتم نەخێر لەبەر ئەوەی یەکتر ناناسین، بەڵام ئەگەر ئێوە هەر ئەرکێک لە پێناوی شۆڕشدا بەمن بسپێرن کە پەیوەندی بە سەدام حسێنەوە هەبێت، من هەرگیز دووا ناکەوم لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەو ئامادەم و داوای چاوپێکەوتنی دەکەم. من بەهیچ شێوەیەک نەمدەزانی مەبەستی ئیدریس چییە. ئەویش تەماشایەکی مەسعودی برای کرد و دەستی کرد بە پێکەنین. منیش بەسەر سورماوی تەماشای هەردوکیانم دەکرد، چونکە هیچ شتێک لە قسەکانمدا شایەنی ئەوە نەبوو کە ئەوان پێبکەنن، هەروەها بەهیچ شێوەیەک مەبەستی پرسیارەکەیم نەدەزانی. تەماشای من و مەسعودی دەکرد و بێپسانەوە پێدەکەنی بەوەی کە من گوتم ئامادەم لەگەڵ سەدام

حسێن کۆببمەوە لە پێناوی شۆڕشدا ئەگەر ئێوە بەو کارە قایل بن. بۆ زانیاری لە کۆنگرەی هەشتەمی پارتیدا، ئیدریس خۆی بە رەزامەندی بارزانی داوای لێکردم کە ستایشی حزبی بەعس بکەم و هێرش بکەمە سەر هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی، بۆیە هیچ گومانێکی خراپم بەرامبەر بە نییەتەکانی ئیدریس و مەسعود نەبوو، لە راستیدا ئەمە تەواو پێچەوانە بوو، چونکە نیازەکانی ئیدریس و مەسعود بەرامبەر بە من زۆر خراپ بوو، بەڵام ئەوەم بە خەیاڵدا نەدەهات.

کاتێ لە کۆبوونەوەی دووەمیش تەواو بووین، بەبێ هیچ ئەنجامێک گەڕامەوە بۆ دەربەندی و نەگەیشتینە هیچ چارەسەرێکی گونجاو کە بتوانێت رێڕەوی رووداوەکان راست بکاتەوە، سەرباری ئەوەی چەندین بەڵگە و سەلماندنی لۆژیکیم خستە بەردەستیان. پاداشتەکەم ئەوە بوو لەگەڵ کوردەکانی سوریا هەتا رۆژی ٢٤-٥-١٩٧١ دەست بەسەر کرام. دواتر لە هەندێ کەسم بیست کە مەلا مستەفا دێت بۆ کۆشکی ئاشتی و لەگەڵ هەمووماندا بە کۆمەڵ کۆدەبێتەوە بۆ ئەوەی ناکۆکییەکانی هەمووومان چارەسەر بکات.

ئیدریس هات بۆ لام و داوای لێکردم لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار بم. پێکەوە رۆیشتین بۆ کۆشکی ئاشتی، کاتژمێر یازدەی پێش نیوەڕۆ بوو. کەژاوەی ئۆتۆمبیلەکانی بارزانی گەیشت، هەموو کوردەکانی سوریا لەگەڵیدا چوونە ژوورەوە بۆ هۆڵی کۆبوونەوە. ئیدریس منی لەگەڵ خۆیدا هێشتەوە و داوای لێکردم

کە بەتەنهــا لە گەڵیـدا لە ژووریێکـــی ئەوبەرەوە کــۆببمەوە، بە گــوێیمکرد و چــوینە ژوورەوە، ســەیرم کــرد مەســعودیش لەو ژوورە دانیشتووە، بووین بە سێ کەس، دەستمان بە قسان کرد. ئیدریس گوتی: بۆچی عەبدی ئیبراهیمت لەگەڵ خۆتـا هێنـاوە بـۆ ئێرە؟ پێمگوت: ئەوە چی تێدایە؟ بۆچی ئەو نەیەت هیچی لەسەرە؟ گــوتی زانیاریمـــان هەیە کە ئەوە بەکرێگیراوێکـــی هەواڵگریـــی سوریایە و مستەفا بەگ زۆر باشی دەیناسێت و زانیـاری تەواوی هەیە لەسـەری کە ئەو کەسـێکی گومـان لێکراوە، هەروەهـا چەنـد کەسێکی پـارتی دیمـوکراتی کـورد لە سـوریا راپۆرتیـان لەسـەری داوە. لێـرەدا داوام لە ئیـدریس کــرد بــانگی عەبـدی بـکەن بـۆ کۆبـوونەوەکە بـۆ ئەوەی بەرگـری لە خـۆی بکـات و وەڵامـی ئەو تۆمەتـانە بـداتەوە کە بـۆی دروسـت کـراوە و لەبەردەمـی ئەوانـدا بەرگری لە خۆی بکات. ئیدریس بەوە قایل بوو، عەبدی ئیبـراهیم هاتە ژوورەوەو گفتوگۆ دەستپێکرد.

که لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا تەواو بوو، ئیـدریس ئـاوڕی دایەوە بـۆ مەســـعود و بە ئیبراهیمـــی گـــوت: تـــۆ بـــڕۆ دەرەوە مـــن کۆبوونەوەیەکی تایبەتم لەگەڵ کاک جەمیل هەیە.

دووای چوونە دەرەوەی لە کۆبوونەوەکە ئیدریس گوتی: کـاک جەمیـل تـۆ پیـاوێکی شـەرەفمەند و دڵسـۆزیت، دەزانـین کە تـۆ مرۆڤێکی راستگۆیت لەگەڵماندا، بەڵام هەندێ پرسیارت لێدەکەین دەماونەوێـت زۆر راشــکاوانە و بەوپەڕی دڵســۆزی و راســتی وەڵاممـان بـدەیتەوە. پێمگـوت: فەرمـوو مـن ئامـادەم پرسـیارەکە

چییه؟ مانگێک لەمەوبەر پیاوێک هات بۆلات بۆ بەیروت. منیش گوتم چەندین کەس هاتوون بۆ لام. گوتی: ئەم هەفتەیە لە بەیروت لە گەڵ کێدا کۆبوونەوەت کردووە؟ گوتم لە گەڵ سەدەها کەسی کورد و غەیرە کورد. گوتی زیاتر بۆت روون دەکەمەوە: نامەیەک کەوتۆتە دەستمان ئاراستە کراوە بۆ عوبێدوڵای برامان و ناوی تۆی لەسەر بووە. گوتم: دەکرێت بزانم نامەکە بە دەستی کێوە بووە؟ گوتی کەسەکە دەناسین ئەو پیاوی دەزگای هەواڵگری عێراقە. گوتم بەڵی کەسێک لە لایەن عوبێدوڵای براتانەوە هاتووە بۆلای من و نامەیەکی ئەوی بۆ هێناوم، بەڵام من ئەو کەسەی کە نامەکەی هێناوە نەمدەناسی، پرسیاریشم لێ نەکرد داخۆ کوردە یان عەرەبە، ئەوەندە نەبێت هات بۆ لام بۆ شوێنی کارەکەم لە بەیروت و پێی گوتم تۆیت جەمیل مەحۆ؟ پێمگوت جەمیل مەحۆ ئەناسیت؟ گوتی نەخێر، پێمگوت چیت لەو دەوێت؟ گوتی نامەیەکی عوبێدوڵام هێناوە. ئەو کاتە ئینجا من پێمگوت ئەوەی بەردەمت منم جەمیل مەحۆ. نامەکەم لێوەرگرت و کەمێک دانیشت و هەندێ باسی بارودۆخی عێراق و ئەو شتانەمان کرد. لە کاتی قسەکانماندا پێمگوت رەنگە من چەند رۆژێکی تر بڕۆم بۆ کوردستانی عێراق، ئەوە هەموو ئەو قسانە بوو کە لەنێوان من و ئەو کەسەدا کران. سەبارەت بەو نامەیەی کە تۆ باسی دەکەیت، با لە عوبێدوڵاشەوە هاتبێت بۆم چی تێدایە؟ عوبێدوڵا برای ئێوەیە و من هیچ پەیوەندییەکی سیاسیم لەگەڵیدا نیە، تەنها رێزو خۆشەویستی نەبێت، من ئەوپەڕی رێزم هەیە

بۆی چونکه دوواجار ئەو کوڕی سەرۆک بارزانییە. گوتی: ڕاستە ئەو بـرای گەورەمـانە بەڵام ئەو لە دژی بەرژەوەنـدی ئـێمە کـار دەکـات، ئەو ئێسـتا دەستبەسـەرە و لە لایەن بـارزانییەوە خـراوە ژێـر چـاودێری توونـدەوە. کاتێـک نـامەکە کەوتە دەسـتمان و نوسـرابوو کە عوبێدوڵا داوای هـاتنی تـۆ دەکـات بـۆ کوردسـتان بەبـێ ئەوەی ئـێمە ئاگاداربین لەوە، گومانمـان لە تـۆ کـرد و لەو باوەڕەدا بووین کە تۆ پەیوەندی سیاسیت هەبێت لەگەڵیدا، تەنها ئەوەنـدەیە. پێمگـوت ئەوە ڕاسـت نـیە، پەیوەنـدی مـن لەگەڵیـدا سیاسـی نییە تەنهـا ئەوەنـدەیە کە ئەو کـوڕی بـارزانییە و منـیش بـارزانیم زۆر خـۆش دەوێت و زۆریـش ڕێـزی دەگـرم. مەسـعود وەڵامی دامەوە و گوتی: هاوکاریکردنی تۆ بۆ عوبێدوڵا خیانەتێکی گەورەیە و لێخۆش بوونی نیە!!.

سروشـتی پەیوەنـدیم بە عوبێـدوڵاوە بـۆ باسـکردن، بەرگـریم لەخۆم دەکرد بۆ ئەوەی ڕاستییەکان ڕوون بکەمەوە، پێمگوتن مـن هاوکـاری عوبێـدوڵا نـیم و پەیوەندییەکەشـم لە گەڵیـدا تەنهـا دۆسـتانە و شەخسـیە. ئەگەر ئێـوە لەو بـاوەڕەدان کە ئەو پەیوەنـدییە لەگەڵ بـرا گەورەکەتانـدا خیـانەتە ئەوە ڕاسـت نیـیە، چـونکە مـن ڕێنمـایی حزبـی و سیاسـی لە بارەگـای بـارزانییەوە وەردەگرم، ئەوەش بە سیفەتی ئەوەی کە من سکرتێری حزبم و نوێنەری ئێوەم لە لوبنان لە چوار چێوەی پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنـان، کە خۆم دامەزرێنەری ئەو پـارتەم و لەو ڕێگایەدا پتر لە بیست ساڵی ڕەبەق تێکۆشاوم، دووچاری چەندین جۆری ئازار

و ئەشکەنجە و زیندان بوومەتەوە، لە پێناو شۆڕشە مەزنەکەمان و مەسەلە نەتەوایەتییە رەواکەماندا. چەندین جار من هاتوومەتە ئێرە بۆ بارەگای شۆڕش، ئێوە منتان دەبینی زۆر بە سادەیی و بەڕوونی لەگەڵ عوبێدوڵای براتان قسەم کردووە، بەبێ ترس و بەبێ ئەملاو ئەولا، چەندین جار دیومە یاوەری باوکتان بووە لەمسەر و ئەوسەری کوردستان. ئەگەر دەتانزانی ئەو لە دژی شۆڕش کار دەکات بۆچی ئاگادارتان نەکردمەوە؟ بۆیە رێگەم پێبدەن کە پێتان بڵێم ئێوەش هەڵەن. لە کاتێکدا کە گفتوگۆکان لەوپەڕی گەرمیدا بوو، یەکێک لە پاسەوانەکان هاتە ژوورەوەو بانگی کردین بۆ نانخواردن.

لەسەر مێزی خوانەکە، هەموو کوردەکانی سوریام بینی کە مەلا مستەفا لە ناوەڕاستیاندا دانیشتبوو، زۆربەی سەرکردەکانی شۆڕش لەوێ بوون. شوێنەکەی من لەسەر خوانی نانەکە بەرامبەر بە ئیدریس بوو. لەو بارودۆخە ناهەموارەدا دڵم گیرابوو، نیشانەکانی بێزاری و جاڕس بوون بە دەموچاومەوە دیار بوو، دوای ئەوەی ئەو قسانەم لە ئیدریس و مەسعود گوێلێبوو، هیچ ئارەزووم بۆ نان خواردن نەبوو، بە درێژایی ژیانی سیاسیم ئەوە یەکەمجار بوو شتی وا ببیستم. ئیدریس هەستی بەوە کرد کە بێزارم دەستیکرد بە دواندن و قسەی خۆش، بە زیادەوە رێزی لێدەگرتم، لەبەر چاوی هەموانەوە پارچە گۆشتی دەخستە بەردەمم و رێزێکی زۆر تایبەتی نیشان دەدا.

که له نـانخوارن بـووینەوە، چـوومه دەرەوە بـۆ حەوشـەی کۆشـکەکە، مسـتەفا بەگ دوام کەوت و بە سەرسـوڕماوی و وەک جۆرێـک لە سەرزەنشـتکردن، پرسـیاری ئەوەی کـرد کە بـۆچی لەگەڵ ئیدریس و مەسـعود ئەوەندەمان لە کۆبوونەوەکە پێچوو؟ پێمگوت هەمووی خەتـای تۆیە، بەسەر سوڕمانەوە گوتی بۆچی مـن؟ لەترسـاندا دەلەرزی و گـوتی باسـی منت نەکـردووە؟ نـاوت بـردم؟ گـوتم نەخێـر، گـوتی کـاک جەمیـل تکـات لێدەکەم بەهـیچ جۆرێک ناوی مـن مەبە، خـۆم بە شـێوازی تـایبەتی خـۆم بـارزانی قایـل دەکەم بە زووتـرین کـات ئـازادت بکـات، بەڵێنـت پێـدەدەم چـونکە ئەو متمـانەی بە مـن هەیە، مـن خـۆم دەزانـم چـۆن لەو بـارەوە قسـەی لەگەڵدا دەکەم. کە ئەوانەی پێگوتم بـاوەڕم پێکرد، بێدەنگ مامەوە هەرگیز ناوی ئەوم نەهێنا، لە کاتێکدا ئەو هۆکاری سـەرەکی بـوو لەو هەمـوو کێشـانەی کە بـۆم دروسـت بـوو. چیرۆکی مستەفا بەگ و خیانەتەکەی بەشێکی تایبەتی دەوێت، من لە شوێنێکی تر لەم کتێبەدا بە وردو درشتی باسی دەکەم.

گەڕامەوە بۆ دەربەندی، لەوێ لەگەڵ کوردەکانی سوریا بووم. لە میـانەی گفتوگۆکانمانـدا تـوانیم هۆکـاری نـاکۆکی و ناتەبـایی لەنێوان سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا، لە ڕووە جیاوازەکانی سیاسی و حزبییەوە بدۆزمەوە.

ململانێی زۆر تونـد لە نێوانیانـدا هەبـوو، کاتێک لەگەڵ بـارزانی کۆدەبنەوە، بـارزانی هەڕەشـەی کوشـتن لە ئەنـدامانی بـاڵی چەپ دەکـات، ئەگەر بێتـوو پابەنـدی بڕیارەکـانی شـۆڕش نەبـن و

جێبەجێی نەکەن. هەروەهـا هەڕەشـەی لە ئەنـدامانی بـاڵی دیمـوکراتی کـوردی سـوریای کردبـوو کە هەموویـان دەسـتگیر دەکات و لە زیندانەکانی شۆڕش توندیان دەکات، ئەگەر سور بن لەسـەر بـاوەڕی خۆیـان. ناکۆکییەکانیـان زۆر تونـد و تیـژ بـوو، بارزانی کەوتبووە ناویانەوە و بڕیاری سـەپاندنی "دەهام میرۆ"ی دابوو وەک سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا. ئەم کەسـە لە سـوریا بە کەسـێکی نەخوێنـدەوار ناسـرابوو، خوێنـدنەوەو نوسـینی نەدەزانـی، جـگە لەوەش هـیچ بـاوەڕی بە دیموکراسـیەت نەبـوو. هەروەهـا بـارزانی داوای لە هەنـدێ سـەرکردەی بـاڵی مارکسـیی چەپ کردبـوو کە لە کوردسـتان بمێننەوە، تا ئەو کاتەی بڕیارەکە جێبەجێ دەکرێت و دەهام میرۆ سەرکردایەتی حزب وەردەگرێت.

بڕیـارەکە زۆر تونـد بـوو بـۆیە هەموویـان بەبێ هـیچ ئەمـلاو ئەولایەک ملـکەچ بـوون. لە کوردسـتان ڕۆیشـتن و گەڕانەوە بـۆ سوریا، لەوێ هەناسەیەکی کامەرانییان هەڵمژی و ئازادی خۆیـان بەدەسـت هێنـایەوە، هەر هەموویـان پەشـیمان بـوونەوەو لە نێوان خۆیانـدا پێکهـاتن لەسـەر ئەوەی کە پابەنـدی ڕێکەوتـنەکە نەبـن، پاساویشـیان ئەوە بـوو کە ئەوان لەگەڵ بارزانیـدا بە ناچـاری ڕێکەوتنیـان مـۆر کـردووە چـونکە لەژێـر هەڕەشـەو گوڕەشـەو چاوسـورکردنەوەدا بـوون لە ترسـی ئەوەی دەسـتگیر نەکـرێن بە ناچاری ملیان داوە. لە دەربەندی بۆ یادگاری و بۆ مێژوو هەندی وێنەمان چرکاند.

بەر لەوەی بێم بۆ کوردستان، دووربینێکی گەورەم لە لوبنان بۆ بارزانی کڕیبوو، چونکە لە کاتی هاتنم بۆ بەشداری لە کۆنگرەی هەشت خۆی داوای لێکردم. کە گەیشتمە دەربەندی مستەفا بەگ هات بۆ سەردانم، دووربینەکەم دایە دەستی بۆ ئەوەی بیبات بۆ بارزانی، کەچی ئەو لە جیاتی ئەوەی بیدات بە بارزانی دابووی بەدەست ئیدریسەوە و پێی گوتبوو: جەمیل ئەو دووربینەی بە دیاری بۆ عوبێدوڵا هێناوە.

لە ٢٨ی ئایاری ١٩٧١ هەواڵم پێدرا کە ئیدریس دێت بۆ کۆشکی ئاشتی بۆ ئەوەی جارێکی تر لەگەڵ کوردەکانی سوریا کۆبوونەوە بکات، منیش بەبێ ئەوەی پێشتر مەوعیدم هەبێت لە گەڵ ئیدریس بڕیارمدا بڕۆم بۆ کۆشکی ئاشتی. لە دەرەوەی کۆشک لەسەر بەردێک دانیشتبووم. ئۆتۆمبیلێکی جێبی سەربازیم بینی ئیدریسی تێدا بوو، هەروەها چەند ئۆتۆمبیلێکی تری پاسەوان بە دوواوەی بوون. کە نزیک بوونەوە بە ڕێزەوە سڵاوم لە ئیدریس کرد، وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە گوتی: کاک جەمیل باوکم دەیەوێت ئەمشەو لە حاجی ئۆمەران لەگەڵتا کۆبێتەوە، دەبێت ئیستا سەرکەویت بۆ ئەوەی ئێوارە کۆبیتەوە لەگەڵیدا. کاتێ گوێم لەو داوایە بوو بە شێوازی فەرمانکردن، دوودڵی و گومانم لا دروست بوو، لە مێشکی خۆمدا دەمگوت دەبێت بارزانی چی لەمن بوێت؟ دەبێت لەو کۆبوونەوەیەدا چیم لەگەڵدا باس بکات؟ بە تایبەت کە بوختان و تۆمەتێکی زۆریان بۆ دروست کردبووم، گوایا من دەستێکم لە ناو ئەو کارانەدا هەیە کە عوبێدوڵا دژی باوکی ئەنجامی داون. لێرەدا ڕاشکاوانە دەڵێم،

لەبەردەمی خوداو مێژوودا سوێند دەخۆم کە من هیچ پەیوەندیم بەو کـارانەوە نەبــووە کە عوبێــدولا لە دژی بــارزانی بــاوکی ئەنجـامی داون. پەیوەنـدییەکەم لەگەڵیـدا شەخسـی و هاوڕێیـانە بــووە، هەروەک چــۆن لەگەڵ ئیــدریس و مەســعود پەیوەنــدیم هەبـووە، ئەوەی لە نێـوان مـن و عوبێـدولا هەبـووە هەر ئەوەنـدە بووە.

گەڕامەوە بـۆ شـوێنی خـۆم، لە بـارێکی هەڵچـوونی دەرونیـدا بووم. بە چاودێرەکەم گوت کە لەسەر داوای ئیدریس دەبێت بچم بۆ حاجی ئۆمەران. من لەو کاتەدا لەژێر چاودێری توندا بووم لە لایەن دەزگـای هەواڵگـری و پیاوەکـانی ئیدریسـەوە. زۆر بیــرم دەکردەوە، لە نـاخی خۆمـدا دەمگـوت ئەمجارەیـان پرسـەکە زۆر ئاڵۆزو مەترسیدارە. بیرم لەوە دەکردەوە کە نەخشەیەک دابنێم بۆ یاوەرەکەم، ئەو کوردەی سوریا کە لەگەڵمدا هـاتبوو بەنـاوی عەبـدول کەریـم ئیبـراهیم. پێمگـوت مـن ئێـوارە دەڕۆم بـۆ حـاجی ئۆمەران بۆ دیداری بارزانی، پێمنەگوت کە من تۆمەتبارکراوم بە پەیوەنـدیم لەگەڵ عوبێـدولا، بەڵکـو پێمگـوت بـارزانی فەرمـانی دەستگیرکردنی داوم، بۆیە دەبێت تۆ هەڵبێیت بەر لەوەی بتگرن، هەروەها گوتم کاتێ دەگەینە حاجی ئۆمەران، تۆ یەکسەر بڕۆ بـۆ یەکێـک لە هۆتێلەکـان، منـیش راسـتەوخۆ دەڕۆم بـۆ دیوەخـانی بـارزانی، ئەگەر سـبەی نەگەڕامەوە، ئەوا دەبێـت تـۆ یەکســەر لە هـۆتێلەکە نەمێنیـت و بگەڕێیـتەوە بـۆ دەربەنـدی، لەوێ هەنـدێ کەلوپەلی ناو جانتاکەم بەرەو رابکە بۆ گەلاڵە و هەمان رۆژ خۆت بگەیەنە هەولێر.

## دەستبەسەرکردن و ناسۆرییەکانم

عەبدول کەریم ئیبراهیمم لە هۆتێلەکە بەجێهێشت و رۆیشتم بۆ بارەگای بارزانی، تەماشام کرد هەندێ لە هەڵپەرستەکان لەوێن. دانیشتم و چاوڕێمکرد هەتا نۆرەم دێت. هەتا کاتژمێر یەک و نیوی شەو چاوەڕێمکرد، لەو کاتەدا ئیدریس هات و گوتی باوکم دەیەوێت قسەت لەگەڵدا بکات. هەستام و شوێن ئیدریس کەوتم، لەو کاتەدا دڵم بە تەواوی توند بوو، باری دەروونیم نا جێگیر بوو، زۆر شتم بە خەیاڵدا دەهات، پرسیاری زۆر شتم لە خۆم دەکرد، ئیتر دواجار گوتم چی دەبێت با ببێت. چوومە ژوورەوە بۆ دیوەخانەکەی بارزانی، سلاوم کرد، بارزانی هەستاو وەڵامی سلاوەکەی دامەوە، ئینجا ئەو دانیشت و منیش لە نزیکەوە دانیشتم. لە دیوەخانەکە دکتۆر مەحمود عوسمان و ئیدریس و مەسعودیش دانیشتبوون، کەشێکی زۆر نالەبار بوو.

بارزانی رووی قسەکانی کردە من، دەموچاوی گرژ بوو و نیشانەکانی تورەبوون بەئاشکرا بە سیمایەوە دیار بوو، ئاوڕی بۆم دایەوەو گوتی: ئەوەی کوڕی ئەوە، تۆ خائینیت، جاسوسیت، لە دژی شۆڕش کار دەکەیت، زیاتر لە جارێک ئەو قسە ناشرینانەی دووبارە کردەوە و پاشان گوتی (بەم دەمانچەیەی دەستم دەتکوژم، هەروەک چۆن پێش تۆ حەمید عوسمان و چل کەسی ترم کوشتووە، تۆ دەبیتە چل و یەکەم). پێمگوت: بۆ ئەو هەموو هێرشە دەکەیتە سەرم، هیچ تۆمەتێک باس ناکەیت جگە

لەوەی کە پێم دەڵێت من خائن و جاسوسم. ئەگەر من خائن و جاسوس بم وەک خۆتان دەڵێن ئەوە فەرمانەکانی تۆ و سەرکردایەتیم جێبەجێ کردووە. ئەگەر ئێوە لەبەر ئەو شتانە من تۆمەتبار دەکەن بە جاسوسی ئەوە من ناچارم زۆر راشکاوانە بڵێم ئێوە هەمووتان هاوبەشی منن لە جاسوسی و خیانەتدا. بارزانی بە توڕەییەوە وەڵامی دایەوە: (فلانی کوڕی فلان، تۆ کێیت تا بتوانیت داخوازییەکانی مەکتەبی سیاسی رەتکەیتەوە لەلایەک و تەنانەت داخوازییەکانی منیش رەتکەیتەوە لە لایەکی ترەوە؟ بڕیارەکانی شۆڕش رەتدەکەیتەوە، چەند مانگێکە تۆ پابەند نابیت بە فەرمانەکانمانەوە، بەڵکو رەتیان دەکەیتەوە و تەنها بە رای خۆت کار دەکەیت، بەخوا دەبێت بەم دەمانچەیە بتکوژم). دەستی خستە سەر دەمانچەکەی و لە هەڵچوون و داچووندا بوو، ئاگر لە چاوانی دەباری، دەستی بە توڕەییەوە رائەوەشاند و لە توڕەبوونا دەلەرزی. لەو کاتەدا پێمگوت: ئەگەر بەڕاستی بەڵگەی حاشا هەڵنەگرت هەیە کە من خائن و دژە شۆڕش یان دژی تۆم ئەوە پێمخۆشە بەو دەمانچەیە، بەدەستی خۆت بمکوژیت. من ئێستا تاریفی خۆمت بۆ ئەکەم: من جەمیل مەحۆم کوردی لوبنانم، لە دڵسۆزترین لایەنگرانی ئێوە بووم لە ساڵی ۱۹٦۱ بەدواوە هەتا ئەمڕۆ. لە پێناوی شکۆمەندی شۆڕشدا، خۆم دووچاری زیندان و ئەشکەنجە و ئازار کردۆتەوە، خۆم بۆ تەرخان کردووە، بە نرخترین شتی ژیانی خۆمم پێشکەش

کردووه، قوربانیم بۆ داوه. تۆمەتبارکردنم لە لایەن جەنابتەوە کە داخوازییەکانی ئێوەم جێبەجێ نەکردووە، بەوەی کە کوردی سوریا بخەمە نێو سەرکردایەتی حزبەوە لە لوبنان، ئەوە ڕێگەم پێبدە کە پێت ڕاگەیەنم سەرکردایەتی حزبەکەتان لە کوردستان هەڵەیەکی کوشندە دەکات و من لەسەر هەقم.

بارزانی دیسان بە توڕەبوونەوە وەڵامی دامەوە: تۆ سەگی کوڕی سەگیت، جاسوسیت، کار بۆ عوبێدوڵای کوڕم ئەکەیت، نامەیەکی تۆم لایە بۆ ئەوت ناردووە ناوی خۆتی لەسەرە و بۆت نوسیوە کە سەردانی کوردستان دەکەیت. ئەگەر ئەو نامەیە نەبوایە ئێمە نەماندەزانی کە تۆ هاتویت بۆ ئێرە. پێمگوت: گەورەم سوێندت بۆ دەخۆم هیچ پەیوەندی سیاسیم لەگەڵ عوبێدوڵا نیە. پەیوەندییەکەم لەگەڵیدا تەنها دۆستانە و شەخسیە، لەبەر ئەوەی کوڕە گەورەی تۆیە. زۆر بە ڕاستی من پێتان دەڵێم هەرگیز نەمزانیوە ئەو لە دژی ئێوە کار دەکات، من هەمیشە لەگەڵ تۆدا دەمبینی، ئەی بۆچی خۆت ئەوەت پێنەگوتم بۆ ئەوەی هەموو پەیوەندییەک لە گەڵیدا بپچڕم؟ چەندین جار من هاتووم بۆ ئێرە تۆ هیچت لەسەر ئەو بەمن نەگوتووە، منیش نوێنەری تۆ بووم لە لوبنان. وەڵامی دامەوەو گوتی: نەماندەزانی کە خائنە. ئینجا من گوتم: باشە ئەگەر ئێوە خۆتان نەزانن کوڕەکەتان لە دژی ئێوە کار دەکات و هەمیشە لەگەڵ خۆتاندا بووە، منێک کە دوورم لێتان و لە لوبنان دەژیم چۆن بزانم؟ هۆکاری هاتنەکەشم بۆ ئێرە

ئەوەیە کە ناکۆکییەکـــان چارەســـەر بکەیـــن، ئەوەش لەســـەر جێبەجێکردنـــی خواســـت و داوای تـــۆ بـــۆ چارەســـەر کردنـــی ناکۆکییەکـان. ئەمەوێـت ئەوەشـت بـۆ ئاشـکرا بـکەم کە مەکتەبـی سیاسـی ناتوانێت و نازانێت چـۆن چـۆنی گیروگرفتە ئاڵۆزەکانی ئەو کـوردانەی دەرەوەی ناوچەکـانی شـۆڕش چارەسـەر بکـات، بەڵکـو بە پـێچەوانەوە ئـاڵۆزتری دەکـات و زیـاتر ئەیشـێوێنێت. ئەوەیە کە دەمەوێت بۆت روون کەمەوە کە خۆت بتوانیت لەسەر دەستی خۆت لەناو شۆڕش نەک لە لوبنان گرفتەکان چارەسەر بکەیت، چونکە سەرکردەکانی مەکتەب سیاسییەکەت خۆیان لە راستی و واقعەکان دەدزنەوە، بۆیە من هـاتووم بـۆ ئێرە. خۆشـت نامەیەکـت بـۆ نـاردبووم داوات لێکردبـووم بـێم بـۆ ئێـرە بـۆیە هاتووم.

بـارزانی بـاوەڕی بە قسـەکانم نەدەکـرد، بەڵکـو تورەبـوون و هەڵچـوونی هەر زیـادی دەکـرد و گـوتی: ئەوەی کـوڕی ئەوە تـۆ جاسوسـیت، کـار لەگەڵ عوبێـدوڵا دەکەیـت لە دژی شـۆڕش، لە بەغـدا پـێش ئەوەی بێیـت بـۆ لای ئـێمە لەگەڵ سـەدام حسـێن کۆبوونەوەت کردووە، وایە یان نا؟ گوتم: سوێند بە خـودا دەخـۆم من نە سـەدام حسـێن دەناسـم و نە کۆبـوونەوەم لەگەڵ کـردووە هەتا ئەم ساتە، هەرگیز، ئەو تۆمەتە هیچ بنەمـایەکی نیە و دوورە لە راستی. بەڵام ئەگەر تۆمەتبارم دەکەن بەوەی کە شاندی حزبی بەعس بەشدار بوون لە ئاهەنگەکانی کردنەوەی بارەگای حزبمان،

ئەمە کارێکی سروشتیە، بە گوێرەی بەیانی یازدەی ئازار و دوای سەقامگیربوونی باری ئاسایش ئەوە هیچ رێگرییەک نیە لەگەڵ هەر لایەنێکی عێراقی کۆببینەوە. ئێمە لە لوبنان حزبێکی کوردی بێلایەنین، من سکرتێری ئەو حزبەم، هیچ کەسێک ناتوانێت رێگریم لێبکات بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ هەر کەسایەتییەکی لوبنانی و دەرەوەی لوبنان. سەبارەت بە هۆکاری ئەوەی کە لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی حزبتان نەگەیشتووینەتە هیچ ئەنجامێک هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەوانە لە یاساو دەستوری لوبنان تێناگەن کە بۆ هەموو حزب و رێکخراوەکان وەک یەکەو رێگا نادات خەڵکانی غەیرە لوبنانی لەناو سەرکردایەتی هیچ حزبێک یاخود رێکخراوێکی لوبنانیدا بن کە پابەند کراون لە چوارچێوەی یاساکاندا کار بکەن، بەڵام ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بە زۆر و بە فشار دەیانەوێت چوار کەس لە کوردەکانی سوریا بە تەسکیە بخەنە ناو سەرکردایەتی، ئەمەش لەناو یاساکانی لوبنادا هەرگیز رێگای نادرێت، لەبەر ئەم هۆکارە لۆژیکی و یاساییە من سور بووم لەسەر رەتکردنەوەی ئەو داوایەو قایل نەدەبووم. ئینجا پێی گوتم: تۆ دەبێت لە کوردستان بمێنیتەوە دەتخەمە ناو زیندان و دەستبەسەرت دەکەم با پاسپۆرتی لوبنانیشت هەبێت. پێمگوت هەرچەندە من پاسپۆرتی لوبنانیم هەیە، بەڵام لە کۆتایدا من لە بنەڕەتا کوردم و وەک کورد

لە دایک بووم، پێشوازی لە هەر شتێک دەکەم کە تۆ ئەمر بفەرموویت بەوپەڕی ئاسودەیی ویژدانم.

گفتوگۆکانمان سەعات و نیوێکی خایاند، بەردەوام و بەهەمان شێوە لە کەشێکی توند و تیژ و تووڕە بووندا بوو. هیچ کام لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بوێری ئەوەیان تێدا نەبوو تاقە یەک وشە لە زاریان بێتە دەرەوە، وەک ئەوەی خۆڵی مردوو کرابێت بە سەریاندا. گفتوگۆکان تەنها لە نێوان من و بارزانیدا بوو. هەستم کرد پیلانەکە زۆر توند و تۆڵە لەسەرم، پێشبینی ئەوەم نەدەکرد بارزانی بەو شێوەیە گفتوگۆم لە گەڵدا بکات و ئەو هەڵوێستە دوژمنکارانەیەم لە بەرامبەردا بنوێنێت و تۆمەتبارم بکات بە خیانەت و جاسوسی. گفتوگۆکان هیچ شتێکی تری لەخۆ نەدەگرت جگە لە جاسوسیکردن لە دژی ئەو مەسەلەیەی کە بارزانی سەرکردایەتی دەکات. لە کۆتاییدا بارزانی داوای لە ئیدریس کرد رەوانەی زیندانی خەلان بکرێم، پێشتر نەمدەزانی زیندانێک بەو ناوە بوونی هەیە.

لە کۆبوونەکەوە بردیانم بۆ ژوورێکی بەرامبەر، کە ژووری نانخواردن بوو. لە ناوەڕاستیدا مێزێکی گەورە دانرابوو کە مێش ومەگەزو مۆرانەیەکی زۆری بەسەرەوە بوو. نزیکەی سەعاتێک لەو ژوورە مامەوە. ئینجا ئیدریس هاتە ژوورەوەو لە نزیکمەوە دانیشت و زۆر بە خوێن ساردی دەستی بە قسان کرد، وەک ئەوەی هیچ شتێک رووی نەدابێت. گوتی: کاک جەمیل گوێ مەدە

ئەو قسـە ناخۆشـانەی کە بـاوکم پێـی گوتیـت. کە بەتـۆی دەگـوت ئەوەی کـوڕی ئەوە لەو پەڕی توڕەبـوون و هەڵچـوونی دەرونیـدا بـوو، ئەوەی زیـاتر ئەوی دەهـری کـردووە ئەوەیە کە عوبێـدوڵای برامـان لە دژی ئـێمە هەموومـان کـار دەکـات. ئـێمە هەموومـان کـوڕی بـارزانین. هەموومـان دەزانـین بـارزانی کێیـە، هەروەهـا دەشـزانین کە کـوڕە گەورەکەی پـیلان لە دژی دەگێڕێـت. بـۆیە دەبێت کەمێک ئارام بگریـت و ددان بە خـۆدا بگریـت. ئینجـا ئیتـر ئیـدریس دەسـتی کـرد بە قسـەی خـۆش و دووانـدم بـۆ ئەوەی کەمێک دڵم بێنێتەوە.

لەو شەوە پڕ ئاشـوبەدا، مەسـتەفا بەگ لە ترسـی ئەوەی نـاوی بەرم و کردەوەکـانی ئاشـکرا بـکەم رایکـرد بـۆ هەولێـر و دوای مانگێک ئینجـا گەڕایەوە، دوای ئەوەی دڵنیـا ببـۆوە لەوەی کە مـن ناویم نەهێناوەو ئەوم نەخستۆتە ناو بابەتەکانەوە.

دوای ئەوەی ئیــدریس لە ژوورەکە چــووە دەرەوە، لە نیــوە شـەودا پاسـەوانێکی دیوەخـانەکە هـات بەتـانی و سـەرینێکی بـۆ هێنام و گوتی: ئەمشەو دەبێت لێرەدا بخەویت، نابێت بچیتە هیـچ ژوورێکی تر. پێمگوت: چۆن دەتوانم لەم ژوورەدا بـخەوم پڕیەتـی لە مێش و مەگەز؟ وتی سەرت بخە ژێر بەتانیەکە و ئیتر رۆیشت.

دەمەو بەیانی رۆژی دواتر، زوو لەخەو هەستام و رۆیشتم بـۆ گۆڕەپـانەکە بـۆ ئەوەی چـاوم بە عەبـدی ئیبـراهیم بکەوێـت و ئاگاداری بکەمەوە کە چیم بەسـەردا هـاتووە. کە گەیشـتمە ئەوێ

بینیم لەسەر جادەکە دەسوڕایەوە و چاوەڕوانی دەکردم. پێمگوت : بە زووترین کات لە ناوچەی حاجی ئۆمەران نەمێنیت، بگەڕێوە بۆ دەربەندی، شتەکانی ناو جانتاکەم لەگەڵ خۆتا بەرەوە بۆ ئەوەی لە بەیروت بیدەیتەوە دەستی کەسوکارم، نەکەیت ئامێری تۆمارکردنی دەنگەکەت لە بیر بچێت ئەوەی دەنگی دارا تۆفیق عەتاری تێدایە نەوەکو بیبەن و لەناوی بەرن، چونکە بارزانی فەرمانی دەستگیرکردنی منی بەئامادە بوونی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی حزبەکەی دەرکردووە. کاتێ لەگەڵ عەبدی قسەم دەکرد، پاسەوانەکە هات بۆ لام و گوتی: کاک جەمیل تۆ بۆچی هاتویت بۆ ئێرە، تۆ راگیراویت، بۆت نییە هەرگیز لە دیوەخانەکە بێیتە دەرەوە، تەنها بە فەرمانی ئیدریس بارزانی نەبێت. من بەو جۆرە فەرمانیان پێکردووم. گەڕامەوە بۆ دیوەخانەکە و عەبدی ئیبراهیمیش راستەوڕاست رۆیشتبوو بۆ دەربەندی و هەموو ئەو شتانەی هەڵگرتبوو کە پێمگوتبوو، لەهەمان رۆژدا لە کوردستان نەمابوو. بۆ ئێوارە پاسەوانەکەی ئیدریس هات بۆ لام و گوتی عەبدول کەریم ئیبراهیم لە کوێیە؟ گوتم نازانم، گوتی ئیدریس پرسیاری ئەو خائنە دەکات، ئەوە رایکردووەو خۆی دەرباز کردووە، پێمگوت من هیچ نازانم چونکە کە هاتم بۆ ئێرە بۆ دیوەخانەکە ئەو لە هۆتێلەکە مابوو. ئینجا رۆیشتبوون بۆ هۆتێلەکە و پرسیاری ئەویان کردبوو، خاوەن هۆتێلەکەش پێی گوتبوون لە گەلاڵەوە رۆشتووە بۆ هەولێر.

لەناو دیوەخانەکەدا، لەو شوێنەی کە تیایدا دەستبەسەر بووم، پیاسەم دەکرد، سەیرم کرد لە ژوورێکی بەرامبەر بە ژوورەکەی من دوو کەسی تێدایە، پرسیاری ئەوانم کرد گوتیان ئەوانە محەمەد ئاغای مێرگە سۆری و فاخری کورپەتی بەفەرمانی بارزانی دەستگیر کراون. چووم بۆ لایان و خۆمم پێناساندن، یەکترمان ناسی، کات زۆر بە هێواشی تێپەڕ دەبوو، بۆیە پێکەوە دادەنیشتین و دەمەتەقێمان دەکرد، خواردنمان پێکەوە دەخوارد، هەندێ جار پێکەوە دەماینەوە هەتا نیوەی شەو قسەو باسمان دەکرد. فەرمانی زۆر توندیان بەسەرماندا سەپاندبوو. بۆمان نەبوو ژوورەکان جێبێڵین و بچینە دەرەوەی دیوەخانەکە.

رۆژی ٦-٦-١٩٧١ لە دیوەخانەکە دانیشتبووم فاخر هات بۆ لام و گوتی وەرە با بچینە دەرەوەی دیوەخانەکە. رۆیشتینە دەرەوە، بینیمان دەیان پاسەوانی بارزانی کە پڕچەک بوون، بەسەر شاخ و لوتکەکانەوە بڵاوەیان کردبوو، دەیانویست عوبێدوڵا بگرن. تەقەو تۆقیان بوو، هەرایەکی زۆریان نابۆوە.

بارزانی داوای کردبوو عوبێدوڵا لە زیندانەکەی خۆیەوە کە لەسەر لوتکەی یەکێک لە شاخەکان بوو، لە ژێر چاودێرییەکی توندا، بهێنن بۆ دیوەخانەکەی خۆی بۆ ئەوەی رۆژی ٧-٦-١٩٧١ بە ئامادەبوون و سەرپەرشتی خودی بارزانی خۆی عوبێدوڵا و جەمیل مەحو بەرەوڕوو بکرێنەوە، بزانرێت داخۆ پەیوەندی لە نێوانیاندا هەبووە؟ ئینجا لە دوای لێکۆڵینەوە ئەگەر ساغ کرایەوە

که ئەو دوانە پەیوەندییان هەبووە، ئەوە بارزانی بە دەمانچەکەی دەستی خۆی هەردووکیان لە هەمان کات و شوێندا دەکوژێت، ئەمە بە قسەی پاسەوانێک، کاتێک عوبێدوڵا هێنرا بۆ ئێرە، بۆ دیوەخانەکەی باوکی، رۆژی ٦-٦-١٩٧١ بوو، پاسەوانێکی تر دەهات و دەیگوت ئەو زانیاری تەواوی لایە کە چارەنوسی هەردوکتان سبەی گولە باران کردن دەبێت لە لایەن بارزانییەوە.

لەو رۆژەدا بارزانی بە یاوەری ئیدریس و مەسعود لە حاجی ئۆمەرانەوە رۆیشتبوون بۆ کۆشکی ئاشتی لە چۆمان، بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنی رۆژنامەوانی لەگەڵ هەندێ رۆژنامەوانی بێگانە بکەن. هەتا دوا نیوەڕۆ لەوێ مابوونەوە. لەو ماوەیەدا عوبێدوڵا نەخشەی راکردن دادەنێت. کاتژمێر نزیکەی چوار بوو، عوبێدوڵا بە یەکێک لە پاسەوانەکانی گوتبوو کە دەیەوێت بڕوات بۆ تەوالێت، بۆیە رێگایان پێدابوو بەبێ ئەوەی دوای کەون، لەبەر ئەوەی کوڕە گەورەی مەلا مستەفایە. بەڵام لە جیاتی ئەوەی بچێت بۆ تەوالێت، رۆیشتبووە سەر جادەکە، لەوێ ئۆتۆمبیلێکی جێبی سەربازی بینیبوو، داوای لێکردبوون کە بیگەیەنن بۆ سەر شاخەکە، لەوێ کە یەکەم شوێنی دەستگیرکردنی خۆی بووە، هەندێ لایەنگرو دۆستی هەبووە و چۆتە لایان و پێیگوتوون: کێ لە ئێوە ئامادەیە لە دۆزەخی باوکم رابکات با لەگەڵمدا بێت.

دوای ئەوەی عوبێدوڵا ناگەڕێتەوە بۆ ژوورەکەی و کاتێکی زۆری بەسەردا تێپەڕیووە، ئیتر پاسەوانەکان لە نێو خۆیاندا

دەست بە مقۆ مقۆ دەکەن. کاتێک دەچنە توالێتەکە سەیر دەکەن هیچ کەس لەوێ نییە. یەکێک لە پاسەوانەکان بە تەلەفۆن هەواڵەکە دەگەیەنێت بە بارزانی. دەستبەجێ مەسعود بەخۆی و ژمارەیەکی زۆر لە پاسەوانەکانی خۆی و باوکی دەگەنە ئەوێ، فەرمانەکانی بارزانی توند و بێ رەحمانە بوون: بە زووترین کات عوبێدوڵا بە زیندوویی یان مردوویی بهێنن بۆ بەردەمی. دەنگدانەوەی راکردنی کوڕە گەورەی بارزانی وەکو ئاگر کەوتنەوەی ناو پوش وابوو. بەخێرایی بروسکە دەیان پێشمەرگە هاتنە شوێنی رووداوەکە، هەموو رێگا ناوشاخەکانی سەر سنوری نێوان عێراق و ئێرانیان ئابلوقەدا، سەر هەموو بەرزاییەکانیان گرت. فەرمانی زۆر توند بۆ هەموو هێزەکانی شۆڕش لە هەموو کوردستاندا دەرکرا: عوبێدوڵا بە زیندوویی یاخود مردوویی، بەهەر شێوەیەک بووە دەستگیر بکرێت.

راستییەک هەیە کە لێرەدا دەمەوێت باسی بکەم، سەرکێشییەکەی عوبێدوڵا بۆ راکردن، بوێرانەترین و گەورەترین سەرکێشی پاڵەوانانە بوو کە مەسەلەی کورد لە مێژووی خۆیدا دیبێتی، کە تیایدا تێکۆشەرێکی بوێری وەک عوبێدوڵا بارزانی ئەنجامیدا. لە کاتی راکردن و پەنابردنی بۆ لوتکەی شاخەکان، شەڕی چەکدارانەی قورس بە تفەنگ و گولەبڕێنی ئۆتۆماتیکی لە نێوان شێخ عوبێدوڵاو لایەنگرانی لەلایەک و پاسەوانەکانی مەسعودی برای لە لایەکی ترەوەتا خۆر ئاوابوون بەردەوام بووە،

بە داهاتنی شەو ئیتر شەڕەکە وەستاوە. لە کاتی نیوە شەودا عوبێدوڵا و لایەنگرانی لە حەشارگەی نێو شاخەکان دێنە دەرێ و ڕێگای شاخاوی سەخت دەگرنە بەرو چەندین ڕۆژ و شەو دەبڕن تا بە سەلامەتی دەگەنەوە گوندەکەی خۆیان لە بارزان بەبێ ئەوەی کەس هەست بە هاتنی بکات و بیناسێتەوە[٢٧].

---

[٢٧] ململانێ لە نێوان باوک و کوڕەکانی لە پێناوی دەسەلات و پارەو جێنیشیندا بوو. مەلا مستەفا بە هاوبەشی تەواو لەگەڵ مەسعود و ئیدریس، نەخشەی لەناوبردنی هەرسێ کوڕەکەی تری خۆی(عوبێدوڵا، سابیر، لوقمان)ی دانابوو. عوبێدوڵا لە هەموویان بەهێزترو ژیر تر بوو، دژی تەوریسکردن و بە بنەماڵەیی کردنی پارتی بوو،هەروەها دژی رەفتاری هەردوو براکەی مەسعود و ئیدریس بوو. لە ڕێگای شەهید فاخر میرگەسۆری ئاشنایەتی بە فکری چەپ پەیداکردبوو، بۆیە سەرەتا لەگەڵ ئەو دەستپێکرد، مەلا مستەفا عوبێدوڵا بانگ دەکات ئەو گوناهەی دەخاتە ئەستۆ کە بە نیازی کودەتایە لە دژی باوکی و دەستی لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا تێکەڵ کردووە. عوبێدوڵا زۆر بەو تۆمەتە نیگەران دەبێت و لە گەڵ باوکیدا دەمیان لەیەکتر گیر دەبێت. کاتێک عوبێدوڵا دەست بۆ بن پشتوێنەکەی دەبات چەرخ دەربێنێت و جگەرەیەک داگیرسێنێت، مەلا مستەفا زەندەقی دەچێت وادەزانێ عوبێدوڵا دەمانچەی لێدەردەکێشێ و دەیکوژێ. مەلا مستەفا هاوار دەکات بۆ پاسەوانەکان فریای کەون. لەم کاتەدا عوبێدوڵا بە باوکی دەڵێت (پەیوەندییەک لە نێوان کوڕ و باوک دابەزێتە ئەو ئاستەی بێمتمانەیی چاوەڕوانی چی لێدەکرێت، من دەمانچەم پێ نیە، دەمویست چەرخەکەم دەربێنم جگەرەیەک داگیرسێنم) پاسەوانەکان عوبێدوڵا دەستگیر دەکەن. دواتر عوبێدوڵا وەکو لێرەدا باسی کراوە، ڕادەکات بۆ ناوچەی بارزان بۆ لای عوسمان بارزانی، بەلام بارزانی هێز کۆدەکاتەوە بچێتە سەریان بۆ ئەوێ، بۆیە عوبێدوڵا بە ناچاری پەنا دەبات بۆ حکومەتی عێراق. دواتر لە شار موسڵ چەتەکانی بارزانی هەڵدەکوتنە سەر ژنەکەی عوبێدوڵاو دەیکوژن. عوسمان بارزانیش هەر بەهۆکاری دوژمنایەتی مەلا مستەفا لە حوزەیرانی ١٩٧٤ لەگەڵ دوو کوڕیدا پەنا بۆ حوکومەتی عێراق دەبەن ، دواتر ساڵی ١٩٨٣ حکومەتی بەعس هەرسێکیانی کوشت. بڕوانە ئەیوب بارزانی، پوکانەوەی سەرکەوتن، چیرۆکی بەفیڕۆدانی دەستکەوتەکانی بەیاننامەی ١١ی ئازار، لاپەڕە ٤٠-٤٥ – وەرگێڕی کوردی –

زانیاری لەسەر عوبێدوڵا و لایەنگرانی بە بەردەوامی بە بارەگای بارزانی دەگەیشت و دەیانزانی کە ئەو گەڕاوەتەوە بارزان. من خۆم لە ژوورەکەی خۆمەوە چاودێریم دەکرد و گوێم لێیان بوو کە قسەیان دەکرد و دەیانچرپاند. لە دڵی خۆمدا دەمگوت هەستانی شێخ عوبێدوڵاو بەم سەرکێشییە مەترسیدارە، ژیانی منی لە مردنێکی مسۆگەر رزگار کرد. هەرچەندە من لە دوورو نزیکەوە هیچ پەیوەندیم بەم کێشانەی ناو خێزانی بارزانییەوە نەبوو، هەروەک چۆن هیچ پەیوەندیشم بە شێخ عوبێدوڵاوە نەبوو، بەڵام رەنگ بوو من لەو نێوەدا بکرێم بە قوربانیی ئەو کێشانەی کە هیچ پەیوەندییان بە منەوە نەبوو،

---

چارەنوسی لوقمان و سابیریش لەوە باشتر نەبوو، چەند رۆژێک پاش ئاشبەتاڵەکەی مەلا مستەفا لوقمانی کوڕی مەلا مستەفا نەیدەویست خۆی رادەستی عێراق بکات، بۆیە ماڵ و موڵک و سامانی خۆی بەجێهێشت و بڕیاریدا بچێت بە هانای باوکیەوە لە ئێران، بەڵام مەلا مستەفا کاتێک چاوی بەو دەکەوێت، لەمیوانخانەی ساواک لەبەردەم ئەفسەرە ئێرانیەکان و هەموو دانیشتوانەوە سابیر دەشکێنێ و قسەی زۆر ناشرینی پێ دەڵێت، ئەویش یەکسەر لەوێ دەچێتە دەرەوە و بە تەکسی دەڕوات بۆ باڵیۆزخانەی عێراق لە تاران و داوای پاسپۆرتێک دەکات تا بڕوات بۆ یەکێک لە وڵاتە ئەوروپیەکان، بەڵام ئەوان رەوانەی بەغدای دەکەنەوە. ساڵی ١٩٨٠ چەند رۆژێک دوای کوشتنی عوبێدوڵا سەدام حسین لوقمانیش دەکوژێت. ساڵی ١٩٨٣ سابیرو چوار لە نەوەکانی مەلا مستەفای کوشت. هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٥٠-٥٢ .
ساڵی ١٩٨٧ ئیدریس لە تەمەنی ٤٣ ساڵیدا مرد، بەڵام لە راستیدا نەمرد بەڵکو کوژرا، دوای مردنی ئیدریس هیچ کوڕێکی مەلا مستەفا لەژنە بارزانییەکانی لە ژیاندا نەمان. ئەو ململانێیە هەتا ئەمڕۆ لە نێوان بنەماڵەی مەلا مستەفا درێژەی هەیە، ململانێ لە نێوان نێچیرڤان ئیدریس و مەسرور مەسعود و کوڕو کچەکانیان هەمووی درێژکراوەی هەمان پەردەی شانۆن... وەرگێڕی کوردی

ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە بەهۆی دەستوەردانی مەکتەبی سیاسی لە کاروباری ناوخۆی پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان.

وەک پێشتر باسمکرد، لە بارەگای بارزانی لە ژووری نان خواردنەکە، کە پڕبوو لە مێش و مەگەز و مۆرانە دەستبەسەر کرابووم. بە رۆژ و شەو لە ژێر چاودێری توندا بووم، نەمدەتوانی تامی خەوێکی ئاسودە بکەم، بە چاودێری کردن جاڕسیان کردبووم، بە دزییەوە دەهاتنە ناو ژوورەکەم، بۆ توالێت کردنیش پاسەوان بە دوامەوە بوو، ئەگەر بمویستایە سەردانی ئاخر بکەم لە ژوورەکەی خۆی، پاسەوانەکان لە گەڵما دەهاتنە ژوورەوە بۆ ئەوەی بزانن باسی چی دەکەین. شەوان و رۆژان تێدەپەڕین، ئێمە هەر بەوجۆرە ماینەوە دەستبەسەرو لەژێر چاودێری توند و بەردەوامدا.

رۆژێکیان زیا شەرەف خان هاتبوو بۆ دیداری بارزانی لە بارەگای خۆی، زۆر بە گەرمی پێشوازی کرا. بارزانی هیچی دەربارەی ئەم کەسە نەدەزانی، هەموو کوردێک لە لوبنان و لە دەرەوەی لوبنان زۆر بە باشی ئەم زیا شەرەف خانەی دەناسی. چەندین جار دەهات بۆ سەردانی من بۆ بەیروت دەرم دەکرد، لەبەر ئەوەی دەمزانی رابووردووی چییە و چی لەسەرە. کاتێک هات بۆ بارەگای شۆڕش و منی بینی کە لەلایەن بارزانییەوە دەستگیر کراوم، کەچی خۆی بەختی یارە لای بارزانی. بۆ ئێوارە شوێنی نوستنی ئەویان هێنایە ژوورەکەی من، کاتی خۆمان بە

قسەکردن بەسەر دەبرد. رۆژێکیان لێی پرسیم: هێشتا هەر بێزاریت لێم؟ پێمگوت: ئێستا کاتی گلەیی نییە، با بگەڕێمەوە بۆ بەیروت ئەوسا ئیتر قسەی خۆم دەکەم. گوتی من ئامادەم هاوکاریت بکەم لە حزبەکەدا، گوتم بەهەرحاڵ با بگەڕێمەوە ئەوسا قسە دەکەین، بە گوێرەی پرۆگرام و پەیڕەوی حزب هاوکاری یەکتر دەکەین. ئینجا گوتم: دەتوانم داوای یارمەتیت لێبکەم بۆ ئەوەی هیچ نەبێ کەسوکارم بزانن کەمن باشم و نامەیەکت پێدا رەوانە بکەم؟ گوتی بۆ نا بەسەرچاو من لە خزمەتدام.

رۆژێک بەر لەوەی کوردستان بەجێبێڵێت، نامەیەکم نوسی، بەڵام زۆر دڵنیا نەبووم لە راستگۆیی قسەکانی، لە دڵی خۆمدا متمانەم بەو پیاوە نەبوو، بۆیە لەناو نامەکەدا هەندێ شتی وەک وەسف و ستایشی مەلا مستەفا و ئیدریسی کوڕیم نوسی و گوتبووم (من زۆر باش و بەختەوەرم لێرە، تەندروستیم باشە و لە میوانداری باوکی گەورە و تاد......) و نامەکەم دا بە دەستی. دوای ئەوەی نامەکەم دایە دەستی زۆری نەبرد یەکێک لە پاسەوانەکان هات و چرپانی بە گوێمداو گوتی: شەرەف نامەکەی تۆی داوەتە دەستی ئیدریس و گوتویەتی ئەوە نامەیەکە جەمیل مەحۆ پێیداوم بۆ خیزانەکەی لە بەیروت، ئامانجیشی لەوە ئەوە بووە کە دڵسۆزی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ ئیدریس پیشان بدات و خۆی وەک پیاوێکی بەرزو دڵسۆز دەربخات بەڵکو لەبەرامبەر

ئەوەدا چەند دینارێک پاداشت وەربگرێت. لە راستیشدا ئامانجی سەردانەکەی بۆ لای بارزانی ئەوە بوو کە هەندێ پارەی دەستکەوێت و کورسییەکی خوێندن لە ئەوروپا بۆ کورەکەی داوا بکات.

زۆری نەبرد دوای رۆیشتنی زیا شەرەف خان، کەسێکی تریان هێنا بۆلام و لە ژوورەکەدا بوو بە میوان، لە میانەی گفتوگۆکانماندا زانیم کە کوردی تورکیایە و پیشەی دکتۆرە و ناویشی دکتۆر شڤان بوو، خەریکی ئامادەکردنی توێژینەوەیەک بوو لەسەر شۆرشی کورد و زانیاری لەو بارەوە کۆدەکردەوە، بە نیاز بوو کتێبێک بەناوی خۆیەوە لەو بارەوە بنوسێت، هەندێ پرسیاری ئاراستە دەکردم و دواتر ناونیشانی لە بەیروت لێوەرگرتم و بەڵێنی پێدام کە سەردانم بکات و لە پێناو شۆرشی کوردا هاوکاریم بکات، ئینجا زیاتر گوتی: من زۆرم لەبارەی تۆوە بیستووە، بەتایبەت لەسەر خەباتی سیاسیت. دوای چەند رۆژێکی کەم بیستم کە دکتۆر شڤان بە تاوانی کوشتن لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانی دەستگیر کراوەو هەموویان رەوانەی زیندانی ترسناکی رایات دەکرێن.

ناو بەناو لە ژوورەکەی خۆم دەردەچووم و سەردانی تێکۆشەر فاخیر مێرگەسوری و باوکیم دەکرد، بەهۆی رەوشتی بەرزیانەوە ئەوانم زۆر خۆش ویست. زۆر جار قسەمان دەکرد و قسەکان رایاندەکێشاین بۆ سیاسەت و بارودۆخی شۆرش

بەشێوەیەکی گشتی. لە یەکێک لە دانیشتنەکانماندا جارێکیان گوتی: کاک جەمیل تۆ بۆچی هاتیت بۆ ئێرە؟ نەتدەزانی لێرە یاسا نییە، لەژێر سێبەری ئەم شۆڕشە خێڵەکییەدا ئازادی وشە بوونی نیە؟

ڕۆژێکیان عزەت ئاغا کە یەکێک بوو لە هاوڕێکانی فاخر، نامەیەکی ئازاد بوونی بە مۆری بارزانی بۆ هێنابوو، بەر لەوەی بڕوات بۆ خواحافیزی هاتە لام و گوتی: کێشەکەی منیان چارەسەرکرد، هیوادارم نۆرەی تۆش بێت کاک جەمیل بە ئیزنی خوا بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆت. هەروەها گوتی لەگەڵ ئیدریس سەبارەت بەمن قسەی کردووە و پێی گوتووە، هێشتنەوەی کاک جەمیل بەو جۆرە باش نییە و لە بەرژەوەندی شۆڕش نییە. بەر لەوەی بڕوات دەستی کرد بە گیرفانیداو پێنج دیناری بۆ خەرجی پێدام، زۆر سوپاسم بۆ هەستی جوانی کرد، بەڵام ڕەتمکردەوە وەری بگرم، هەرچەندە زۆر سووربوو لەسەر ئەوەو زۆری لێکردم. بەڵام کۆتا جار بەر لەوەی بەجێم بێڵێت پێی وتم: ئەم رادیۆیەت بە دیاری دەدەمێ وەک یادگاری لە فاخرەوە بۆ جەمیلی برای. رادیۆکەم لێوەرگرت و سوپاسم کرد، فرمێسک بە چاوی هەردوکماندا هاتە خوارەوە.

### مانگرتن لە خواردن

دوای چەند ڕۆژێک فەرمانیان دەرکرد کە لەو ژوورە بمگوێزنەوە بۆ دیوەخانە کۆنەکەی مەلا مستەفا، لەو ماوەیە بە

رێکەوت جارێکیان دارا عەتار و عەزیز رەزا هاتن بۆ دیوەخانی بارزانی بۆ ئەوەی بۆ کاروباری خۆیان دیداری لەگەڵدا بکەن. بە تەنها خۆم لەبەردەرگای دیوەخانەکە دانیشتبووم، خەیالم رۆیشتبوو، تەماشام کرد دارا عەتارو عەزیز رەزا بەرەو لای من دێن، سلاویانکرد و داوام لێکردن دانیشن، دانیشتن و دەستمان کرد بە قسەکردن. دارا رووی کردە من و گوتی: باڵیۆزی عێراق لە لوبنان پێی گوتم کە دەسەلاتدارانی عێراق، هاوکاری دارایی پێشکەش دەکەن بە پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان بۆ دەرکردنی رۆژنامەی " دەنگی کورد". پێمگوت ئەوە راست نییە و جگە لە بوختان هیچی تر نییە. دارا گوتی: کەواتە باڵیۆزی عێراق درۆ دەکات، گوتم بەڵێ درۆ دەکات. ئینجا وتی گوایە ئیدریس رایسپاردووە بە کارێک بچێت بۆ بەغدا، هەروەها راپۆرتێکی تەواو لەسەر بارودۆخی کوردەکانی لوبنان دەنوسێت بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای ئەو راپۆرتە لەگەڵ جەمیل مەحو دانوستان بکەین. ئینجا وتی کاک جەمیل ئەگەر تۆ مارکسی بویتایە دەبویتە بەناوبانگترین خەباتگێری کورد لە لوبنان، بە شایەتی سەرکردایەتی شۆرش، بەتایبەت کە لەناو شۆرشدا زۆر کەم کەس ماون وەکو تۆ پەیرەوی بارزانییەت بن. منیش پێمگوت: من لەگەڵ بیروباوەری هاوردەکراودا نیم، باوەرم تەنها بە کوردستان هەیە بە سەرکردایەتی بارزانی، دەستیان کرد بە پێکەنین و پێکەوە رۆیشتین بۆ چایخانە. لە گۆرەپانەکەی حاجی ئۆمەران بە

رێکەوت چاومـان کەوت بە شـاعیری ناسـراوی کـورد "هەژار"، ئەویش پێی گوتم: کاک جەمیل مەحۆ ئەو دەفرەی کە تۆ ئاوی ناو بیرەکەت دەڕژاندە ناوی سودی نەماوە بەسەر چووە. منیش یەکسـەر وەڵامـم دایەوە و گـوتم: بە پـێچەوانەوە دەسـەڵاتی نـا دیمـوکراس و زەوت کردنـی ئـازادی خەڵـک بەسـەرچوون، ئیتـر قسەی نەکرد و لەگەڵ دارا بە تەنها ڕۆیشتن بۆ چایخانە و منیان بەجێهێشت.

کاتێک لە دیوەخانی بارزانی بووم، چاودێرییەکی زۆر توندم لەسـەر بوو لە لایەن هەواڵگرییەکانی سـەر بە مەسعود بـارزانی. هەرکەسـێک لەگەڵمـا دانیشـتایە یـان قسـەی بکـردایە توشـی لێپێـچینەوە دەبـوو: بـۆ لەگەڵ کـاک جەمیـل دانیشـتیت؟ چـی پێگوتیـت؟ لەگەڵ چەنـدین پرسـیاری تـر، بـۆیە بڕیارمـدا بەتەنهـا دانیشـم، لە راسـتیدا هـیچ کەس نەیـدەوێرا لێمنزیـک بێتەوە. لەو مـاوەیەدا کەشـی ئـاو و هەوا خـۆش بـوو، بە شـێوەیەکی نهێنـی بیرەوەریەکانی خۆمم دەنوسییەوە، بە تایبەت کە بۆم هەڵدەکەوت ئەڕۆیشـتم بـۆ نـاو درەختەکـان و بەدوور دەبـووم لە چـاوی چـاودێران، کەچـی دوای ئەوە هەسـتم کـرد مەسـعود تـا بێـت چـاودێری لەسـەرم تونـدتر دەکـات، کەسـێکی بـارزانیی تەرخـان کردبوو بۆ ژماردنی هەناسەکانم وەک چاودێر و وەک جاسوس، نـاوی جیهـاد بـوو، بە ڕۆژ و شـەو بەدوامەوە بـوو، بـۆ کـوێ بڕۆیشـتبام و چـۆن بجوڵامـایە شـوێنم دەکەوت. حەزی دەکـرد

قسەم لەگەڵدا بکات، ئەهات هەندێ بابەتی سیاسی لا باس دەکردم بۆ ئەوەی بمخاتە قسە، منیش بە زیرەکانە خۆم لێ دەرباز دەکرد و هەمیشە خۆم دوور ئەگرت لێوەی و پێمدەگوت من هیچ لە سیاسەت نازانم، هەموو ئەو شتانەی کە دەینوسم مێژووی ژیانی خۆمە، لە کۆتاییدا راشکاوانە تێمگەیاند کە من مەکتەبی سیاسی بە هیچ نازانم و لەناو شۆڕشدا متمانەم بەهیچ کەسێک نییە جگە لە بارزانی.

کاتێ لە بارەگا دەبووم، بە رێکەوت زۆر کەسایەتی کوردی دیارم دەبینی کە پێشتر دەمناسین و پەیوەندیم دۆستانە بوو لەگەڵیاندا، کاتێک رووم بە روویان دەکەوت خۆیان هەڵە دەکرد و وا خۆیان دەرئەخست کە نامناسن، بەڵام هەندێکیشیان سڵاویان دەکرد و لەگەڵما دادەنیشتن. مستەفا بەگ پێی دەگوتن توخنی جەمیل مەحوێ نەکەون، پیاوێکی مەترسیدارە. لەبەردەم پاسەوانەکاندا ئەمانەی دەگوت، بۆئەوەی خۆی وەک دڵسۆزی بارزانی پیشان بدات، زۆر جار گوتبووی کە حەز ئەکات جەمیل مەحوێ لە سێدارە بدرێت، چونکە شایەنی ئەوەیە، کەچی بە دزییەوە کە دەهات بۆ لام پێی دەگوتم چی لە تواناتدا بێت دەیکات بۆ ئەوەی بارزانی قایل بکات ئازادم بکات، لە بیریشی نەدەچوو هەموو جارێ لە کۆتایی قسەکانیدا دەیگوت: خۆ ئاوی منت نەبردووە؟ زۆر دەترسا شتێک لەسەر ئەو بدرکێنم، یان بۆی

دروست کەم، لە کاتێکدا مستەفا بەگ هۆکاری هەرە سەرەکی بوو لەو داوەی کە تێوەی گلابووم.

کاتێ پێخەفەکەیان گواستمەوە لە ژووری نانخواردنەوە بۆ دیوەخانی کۆنی بارزانی، دەیان پێشمەرگە لەوێ دەخەوتن، شەوان تا درەنگان خەریکی یاری شەترەنج بوون، دواتر زانیم کە مەلا مستەفا حەزی لەو یارییەیە، هەندێ جار نیوەشەوان ئەو یارییەی لەگەڵ ئەوانەی ئەوێ کردووە. شەوێکیان بڕیارمدا هەتا درەنگانی شەو دانیشم، ئەو شەوە بارزانی هات، لە نزیک منەوە دانیشت، بەبێ ئەوەی قسەم لەگەڵدا بکات یاخود سڵاوێکم لێبکات، لەگەڵ یەکێک لە پێشمەرگەکان نزیکەی سەعاتێک یاری کرد و دواتر ڕۆیشت. کە ڕۆژ بۆوە داوام لە بەرپرسی دیوەخانەکە کرد پێخەفەکەم بگوازێتەوە بۆ جێگایەکی تر، بۆ ئەوەی بتوانم کەمێک بە ئاسودەیی بخەوم، چونکە بە ڕۆژ ڕێگایان بە هیچ کەس نەدەدا بخەوێت، بە شەوانیش نەمدەتوانی بخەوم لەبەر هاوارو هاتوچۆی پێشمەرگە و پاسەوانەکان. داواکەیان جێبەجێ کردم. پێخەفەکەمیان گواستەوە بۆ دالانەکەی دەرەوە، نزیک نانخانەکە لە سەرەڕێگای گشتیدا. دەمەو بەیان کارگوزار و پاسەوانەکان لەخەو هەڵدەستان، دەستیان بە پاککردنەوەی زەوی و گسک لێدان دەکرد، هەموو پێخەفەکەم و دەموچاوم تەپوتۆزاوی دەبوو. خۆڵ و تەپوتۆز دەچووە ناو لوتمەوە، کاتێکیش شوێنەکەم چۆڵ دەکرد، پاسەوانەکان ژێر سەرین و ناو جێگاو کەلوپەلەکانم دەگەڕان، بەڵکو ڕاپۆرتێک، نامەیەک شتێک بدۆزنەوە.

ڕۆژی١٦ی تەموزی ١٩٧١ لەسەر جێگاکەم دانیشتبووم، گوێم لە یەکێک لە پاسەوانەکان بوو لەسەر تەلەفۆن هەواڵی بە ئیدریس بارزانی دەدا و دەیگوت: کوڕەکەی جەمیل مەحۆ هاتووە بۆ سەردانی باوکی، بۆ ئەوەی ڕێنمایی لێوەربگرێت. فەرمانەکانی ئیدریس بەو شێوەیە بوو کە ڕێگای نەدەن چاوی بە باوکی بکەوێت هەتا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا نەکەن. دوو ڕۆژی ڕەبەق چاوەڕوانی محەمەدی کوڕم بووم وەک ئەوەی لەسەر پشکۆی ئاگر بم، کات زۆر بە هێواشی دەڕۆیشت، وەکو زانیم پتر لە دوو جار لەگەڵ ئیدریس و مەسعود لە بارەگای خۆیان،دانیشتووە و هەندێ زانیارییان لەسەر بارودۆخی کوردەکانی لوبنان لێوەرگرتووە. دواجار ڕێگایان پێدا کە بێتە سەردانم. هاتە ژوورەوە و کەسێکی لە دەزگای هەواڵگری لەگەڵدا بوو بەناوی زاهیر. پشتم دابوو بە سەرینەکەمەوە، بە محەمەدی کوڕم گوت، خواردن دەخوات بۆی داواکەم؟ گوتی بەڵێ. ڕۆیشتنی زاهیرم قۆستەوەو بە خێرایی قسەم لەگەڵدا کرد و زانیم لە کاتی لێکۆڵینەوەدا پرسیاری چییان لێکردووە، هەر بەخێرایی هەندێ ڕێنوێنیم پێدا بۆ ئەوەی ئەگەر جارێکی تر پرسیاریان لێکرد بەو جۆرە وەڵامیان بداتەوە کە من پێی دەڵێم. خواردنەکەیان هێنا، دوای تێپەڕبوونی هەندێ کات محەمەدی کوڕم ژوورەکەی بەجێهێشت و چەند ڕۆژێک لە هۆتێلێکی حاجی ئۆمەران مایەوە. تکام لە ئیدریس کرد کە ڕێگا بە کوڕەکەم بدات دیدارێکی بارزانی

بکات و سلاوێکی لێبکات، ئەویش قایل بوو، کورەکەم چاوی بە بارزانی کەوتبوو، بارزانی ویستبووی پارەی ڕێگاکەی بداتەوە، بەڵام ئەو بە سوپاسەوە ڕەتی کردبۆوە. کە لە دیوەخانەکە هاتبووە دەرەوە چاوی بە ئیدریس کەوتبوو، پێی گوتبوو: بەشەرەفم سوێند ئەخۆم باوکت دوای دە ڕۆژی تر لە بەیروت دەبێت.

دە ڕۆژم بەسەر برد، دوای ئەوەش دەیان و دەیان دە ڕۆژی تری بەسەردا تێپەڕی و هێشتا من لە ژوورەکەی خۆم، لە دیوەخانەکەی بارزانی، لە ژێر چاودێرییەکی توندا دەست بەسەر بووم. هەر کاتێکیش کۆبوونەوەیەکی مەکتەبی سیاسی یاخود ئەنجومەنی سەرکردایەتی دەکرا، خۆم دڵخۆش دەکرد بەوەی کە لەم کۆبوونەوەیەدا بڕیاری ئازاد کردنم دەدەن. هەموو ئەو هیوایانەم بەدەم باوە دەڕۆیشتن، خەیاڵ پڵاوی بوون، بێ پەروا چاوەڕوان بووم. سەبرم دەگرت و خۆم بە تروسکەیەکی هیواوە دەهێشتەوە. ڕۆژێکیان مەکتەبی سیاسی کۆبوونەوەی بوو لە بارەگای بارزانی، لە ژوورەکەم چوومە دەرەوە، لەبەردەم دەرگای نان دێنەکەدا وەستام، چونکە ڕێگایان نەدەدا بچمە ناو گۆڕەپانەکە و چاوەڕوانی ئەندامانی سەرکردایەتی بم، ئەو سەرکردە گەندەڵ و بەدکارانە. لە کۆبوونەوە هاتنە دەرەوە. بینیم یەکەم کەس حەبیب محەمەد کەریم هاتە دەرەوە و دوای ئەو مەحمود عوسمان، بەرەو لای ئۆتۆمبیلە سەربازییەکانیان

دەچوون، چواردەوریان بە دەیان پاسەوان تەنرابوو، رۆیشتمە بەردەمیان و پێشم بە حەبیب محەمەد گرت و پێمگوت: کاک حەبیب چی بوو، گەیشتنە کوێ؟ پێی وتم دوای دە رۆژ دەگەڕێیتەوە ناو ماڵی خۆت، لەو کاتەدا دکتۆر مەحمود بە قووڵی پێدەکەنی و تەماشای حەبیبی دەکرد، ئینجا هەر دوو دەستەکانی بەرز کردەوە و بە دە پەنجەی دەستی ئاماژەی دەکرد و دەیگوت، دە رۆژی تر و پێدەکەنی. پێمگوت: بەخوا ئەوە درۆیە. لێرەدا مەلا برایم بەرپرسی پاسەوانەکانی بارزانی بە پێکەنینەوە پێی گوتم: کاک جەمیل بۆچی بەو پیاوە گەورەیە کە سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستانە دەڵێیت درۆزن؟ پێمگوت کاک مەلا برایم ئەم پیاوە پسپۆڕە لە درۆکردن و دووبەرەکی نانەوە. هەموو ئەو پاسەوانانەی کە گوێبیستی قسەکەم بوون دەستیان کرد بە پێکەنین.

لە ئێوارەی هەمان ئەو رۆژەدا کە مەکتەبی سیاسی کۆبوونەوەی کرد، یەکێک لە پاسەوانەکان هات و پێی گوتم: گەورەم دەیەوێت بتبینێت. نەریتی بارزانی و ئەندامانی خێزانەکەی وابوو، کاتێک داوای دیداری یەکێک لە زیندانییەکانیان دەکرد، واتا ئەوەی دەگەیاند کە ئەو ئیتر لێبووراوەو هەموو شتێک کۆتایی هاتووەو ئازادی دەکەن. لەو کاتەدا داوا لەو کەسە زیندانییە دەکەن ئەو شوێنە بەجێبێڵێت و نەگەڕێتەوە. کاتێ گوێم لە قسەی ئەو پاسەوانە بوو، هەستم بە خۆشییەکی زۆر کرد، لە دڵی خۆما

وتم کەواتە بۆیە ئیدریس داوای کردووم ئێوارە دیداری بکەم سوپاس بۆ خوا لە کۆتاییدا دوای ئەو هەموو ماوە درێژە تێگەشتن کە من بێتاوانم.

بەمجۆرە بۆ یەکەمجار بوو بە شێوەیەکی رەسمی بچم بۆ دیوەخانەکەو لەگەڵ سەردانکەران و میوانەکاندا بەبێ دوودڵی دانیشم. هەمووشیان لە دەموچاویاندا نیشانەی خۆشی و کامەرانییان پێوە دیار بوو، بەوەی کە کێشەکەم چارەسەر کراوە. لەگەڵ ئیدریس بارزانی دانیشتم و پێی وتم: کاک جەمیل دەبێت سەرکردایەتی حزبەکە لە لوبنان فراوان بکەین، ئینجا داوای بۆچوونی منی کرد لەو بارەوە کە چۆن بتوانین لیژنەی مەرکەزی حزب فراوان بکەین. منیش پێمگوت: من ئامادەم داخوازییەکانی ئێوە جێبەجێ بکەم، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەم کێشانە بەیەکجاری چارەسەر بکرێن، چونکە زیانی یەکجار زۆرە بۆ پارتی. ئیتر بەڵێنیان پێدام لەو بارەوە دەستبەکار بن، بەڵام من هەر بەو جۆرە مامەوە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵێنێکی خۆیان ببەنە سەر.

رۆژی ٢٩- ئەیلول-١٩٧١ کەش و هەوا زۆر خۆش بوو، شاندێکی کوردەکانی سوریا هاتبوون بۆ سەردانی مەلا مستەفا. حەزمکرد لە ژوورەکەم دەرچم و کەمێک پیاسە بەسەر جادەکاندا بکەم. چوومە لای یەکێک لەو فرۆشگایانەی کە نزیک بوو لە دیوەخانەکەی بارزانیەوە، بۆئەوەی کەمێک ساردەمەنی بخۆم. لەو

کاتەدا بە ڕێکەوت سێ کەس لە کوردەکانی سوریا بەو ناوەدا تێدەپەڕین، حەزم کرد خۆمیان پێبناسێنم. سڵاوم لێکردن و پرسیارم کرد کە داخۆ ئەوان کوردی سوریان؟ گوتیان بەڵێ. یەکێکیان پرسیاری لێکردم کە من کێم بۆ ئەوەی ئەوانیش بمناسن. پێمگوتن من جەمیل مەحۆم کوردی لوبنانم. ئیتر زۆر خۆشحاڵ بوون و پێشوازی گەرمیان لێکردم و داوایان لێکردم کەمێک لەگەڵیاندا بمێنمەوە و بچین لە چایخانەکە کەمێک قسە بکەین و چایەک بخۆینەوە. داوای لێبوردنم لێکردن، چونکە من لە ژێر چاودێریدام و ڕێگام نییە لەگەڵ هیچ کەسێکدا دانیشم و قسە بکەم. پێمگوتن ئەگەر حەز ئەکەن هەر بەدەم ڕێگاو پیاسە بەسەر جادەکەوە قسە دەکەین، ڕەنگە ئەوە باشتر بێت. لەو کاتەی کە قسەمان دەکرد، چەند کەسێکمان بینی پیاوانی ئایینی بوون، شۆفێرێکی ئۆتۆمبیلەکەیان لەگەڵدا بوو، ساڵەح بەرزانی و مەجیدی نوسەری ئیدریسیان لەگەڵدا بوو جانتاکانی ئەوانیان هەڵگرتبوو. ئێمە خۆڕسکانە تەماشای ئەوانمان دەکرد، جوڵەی سەر شەقامەکە نائاسایی بوو. یەکێک لە مەلاکان فەرمانی بە شۆفێرەکە کرد، ئۆتۆمبیلەکە بهێنێتە بەردەم دیوەخانەکە. دواتر زانیمان ئەو ئۆتۆمبیلە پڕ بووە لە بۆمب و ڕۆکێت و ئەو پیاوانە مەوعیدیان لەگەڵ بارزانی هەبووە. پیاوە ئایینییەکان ڕۆیشتنە ژوورەوە بۆ کۆبوونەوە. دوای تێپەڕبوونی نزیکەی نیو سەعات لە چوونە ژوورەوەیان بۆ دیوەخانەکەی بارزانی، لە کاتێکدا من لەگەڵ لاوانی کوردی سوریا سەرقاڵی قسەکردن بووم و لە

شەقامەکەدا هاتوچۆمان دەکرد، گوێمان لە تەقینەوەی بۆمبەکان بوو، لەناو دیوەخانەکەشەوە زرمەیەکی گەورە هەستا. هەموومان لەو باوەڕەدا بووین کودەتایەک لە دژی بارزانی لە لایەن جەلال تاڵەبانی و گروپەکەیەوە ئەنجام دراوە. کە تەقینەوە روویدا، شڵەژانێکی زۆر لەشەقام و گۆڕەپانەکەدا دروست بوو. خەڵکمان دەبینی هەموو لەملاو ئەولاوە راکەراکەیان بوو. پاسەوانەکان هەموو کەسێکیان دەستگیر دەکرد کە جلو بەرگی سڤیلیان لەبەردا بوو. ئینجا هاتن بەرەو لای ئەو گەنجە کوردانەی کە جلوبەرگی سڤیلیان لەبەردا بوو، یەکێک لە پاسەوانەکان هات بۆ دەستگیر کردنیان، بەڵام خۆشبەختانە من ئەو پاسەوانەم دەناسی پیاوێکی باش بوو، ئیتر تێمگەیاند کە من ئەوانە دەناسم و هیچ پەیوەندییان بەو رووداوە نیە و لێرە کەس ناناسن و یەکەم جارە هاتوون. ئیتر کەمن تێمگەیاند، ئەویش رۆیشت و بەرۆکی بەردان.

بە خێرایی چووین بۆ هۆتێلەکە، لە کاتێدا لە ناو بارەگای بارزانی و لەسەر جادەکە شەڕو ئاشوب توند بوو. لەدوای رەوینەوەی زریانەکە، ئیتر وردە وردە راستییەکان ئاشکرا بوون. دەرکەوت ئەو کەسانەی کە جلوبەرگی پیاوانی ئایینیان لەبەر کردبوو، تێکدەرو بەکرێگیراو بوون، هاتبوون بۆ ئەوەی پیلانێک بۆ کوشتنی بارزانی جێبەجێ بکەن. هەموویان کوژران تەنها شۆفێرەکە نەبێت کە زۆر بە عەجایەبی لە مردن رزگاری بوو[28].

---

[28] لەم رووداوەدا نۆ کەس کوژران حەوت لە پیاوانی ئاینی ( عبد الجبار الاعظمي، عبد الوهاب الاعظمي، عبدالحسين الدخيلي، باقر المظفر، ابراهيم الخزاعي، غازى الدليمي، احمد عبدالله ياسين الهيتي، نوري الحسيني، احمد محمد قاسم) و هەردوو شۆفێرەکە

پیاوە ئایینییەکان بۆمبیان لە ژێر جلەکانیانەوە شاردبۆوە، کاتێک بارزانی لەگەڵیاندا دادەنیشێت و قسەیان بۆ دەکات، یەکسەر بۆمبی ژێر جلەکانیان دەتەقێنەوە و هەموویان دەکوژرێن. هەروەها ئۆتۆمبیلەکەی دەرەوەش دەتەقێتەوە و دەرگاو پەنجەرەکان هەمووی تێکشکان. هەر دە پیاوە ئایینییەکە و سێ پاسەوانی بارزانی کوژران. هەندێ کەسیش بریندار بوون کە بە پەلە رەوانەی ئێران کران. یەکێک لە بریندارەکان چاوی لە دەست دابوو پاسەوانی بارزانی بوو بە ناوی زەکی، یەکێکی تریشیان ناوی فارس مەسعود بوو کە بە رەچەڵەک سریانی بوو. هەوڵەکەی کوشتنی بارزانی ئەمسەرو ئەوسەری حاجی ئۆمەرانی هەژاند.

دوای ئەو روداوە ناخۆشە، هێزەکانی پێشمەرگە کەوتنە رەوشی ئاوارتەوە، گەڕان و پشکنینیان زیاد کرد، هەستان بە رێکخستنی ئێشکگرتنی توند و بەردەوام. سوپاسی خودام کرد کە لە کاتی روداوەکەدا من لە ژوورەکەمدا نەبووم لە ناو دیوەخانەکە. خودای گەورە و میهرەبان منی لە ژێر رەحمەت و چاودێری خۆیدا دانابوو، ئەگەر نا رەنگە منیش یەکێک بوومایە لە کوژراوە بێتاوانەکان. دیوەخانەکە بە کەڵکی ژیان نەمابوو. دیوار و پەنجەرەی ژوورەکەم هەمووی تێکشکابوون. ئەو پاسەوانەی کە بۆ چاودێری و ئێشکگرتنی من دانرابوو، ئەویش مرد. ئیتر بەبێ

---

بە ناوەکانی سلیمان کوخی و محمد کامل اسماعیل کە هەردوکیان ئەفسەری دەزگای هەواڵگری عێراق بوون.

هیچ چاودێرییەک لە هۆتێلەکەدا دەنوستم. لە ماوەی مانەوەم لە هۆتێلەکەدا هیچ کەس لە منی نەدەپرسی، هەر لە بیری کەسدا نەمابووم. ئەو پیلانە تا رادەیەک بێ سەروبەری و پاشاگەردانی لێکەوتبۆوە. یەک بەدوای یەک شاندەکان لە هەموو لایەکەوە دەهاتن بۆ پیرۆز بایی بارزانی بە سەرسەلامەت بوونی. شاندەکان لە هەولێر و کەرکوک و سلێمانی و لە هەموو قەزا و ناحیەو گوند و شارەکانی کوردستان و دەرەوە دەهاتن هەمووی دەهات بۆ حاجی ئۆمەران بۆ سەردانی بارزانی.

رۆژێکیان لە چایخانەیەک دانیشتبووم، سەیری ئەو شاندانەم دەکرد کە دەهاتن و دەڕۆیشتن، زۆر جار زیاتر لە چەند هاوڕێی دڵسۆز پێیان دەگوتم، کە ئەو هەلە دەگمەنە بقۆزمەوە و سواری یەکێک لە ئۆتۆمبیلەکان یان ئۆتۆمبیلەکەی ئەو بم، بمبات بۆ هەولێرو لەوێشەوە بۆ هەر شوێنێک کە خۆم دەخوازم بڕۆم، بەمەش لە زیندان رزگارم دەبێت و ئازاد دەبم، هەموو جۆرە داوایەکی لەو جۆرەم رەت دەکردەوە و دەمگوت: نامەوێت لە حاجی ئۆمەران و کوردستان بە هەڵهاتوویی بڕۆم، بەڵکو دەمەوێت بە رێکەوتن بڕۆم بۆ ئەوەی پێکەوە بە دڵسۆزی هاوکاری یەکتر بین و هەر جۆرە خراپ تێگەشتنێک لەنێوانماندا نەمێنێت. کاتێ ئەو قسانەم پێدەگوتن دەیانگوت: تۆ لە رووی بیرکردنەوە بێزارو ماندوویت. بارزانی دەیەوێت بەیەکجاری لەناوت بەرێت بۆ ئەوەی لە عینادی و مکوڕبوونی تۆ رزگاری بێت، ئەمە هەلێکی بەنرخە

بۆ تۆ، باشتر وایە بە ئۆتۆمبیل لە گەڵماندا بێیت، لەم بارودۆخ و هەلومەرجەدا کەس بە کەس نیە. هەمیشە وەڵامەکەم نەدەگۆڕی و دەمگوت: نەخێر نەخێر.

شازدە رۆژ لە هۆتێلەکەدا مامەوە، بارودۆخم زۆر لەوە باشتر بوو کە لە ژووری زیندانەکەدا بووم، مێش ومۆرانە تێم ئاڵابوون. زۆر بە ئاسودەیی دەخەوتم. لە هۆتێلەکەدا دوو کەسی ترم ناسی کە کوردی تورکیا بوون، ئەوانیش بەهۆی دکتۆر شڤانەوە تۆمەتبارکرابوون و دەستبەسەر بوون. پێکەوە لە حاجی ئۆمەران پیاسەمان دەکرد، دەڕۆیشتین و بە شاخەکاندا هەڵدەگەڕاین، بەبێ ئەوەی هیچ کەس پێمان بزانن، ئەگەر مەبەستمان راکردن بوایە ئەوا لەو بارودۆخەدا لەوە ئاسانترنەبوو. ئێمە ئەو کارانەمان دەکرد بەبێ هیچ ماندوو بوونێک و زۆر بە ئاسانی، چونکە هیچ پاسەوان و چاودێرێکمان بەسەرەوە نەبوو، بەڵام ویژدانمان هەرگیز رێگای ئەو کارەی پێنەدەداین. زۆر جار دەچووینە مەزارگەی شێخ باڵەک و زیارەتمان دەکرد و خۆمان تەبەروک دەکرد، ئەو شێخێکی ئەولیا بوو لە حاجی ئۆمەران، وەکو نەریتە باوەکان هەندێ بەردمان فڕێدەدایە سەر مەزاری ئەو شێخە گەورەیە. بە گوێرەی نەریتی خەڵکی ئەو ناوچەیە هەر کەس بەردێکی فڕێبدایا بۆ سەر مەزارەکەو پیایدا بنوسایە، ئەوا ئەو کەسە مرازی حاصل دەبوو، هیچ داوایەکی لە لایەن خوداوەندەوە رەت نەدەکرایەوەو بۆی

دەهــاتە دی. بەختـــی مـــن وابـــوو کە هەمیشـــە ئەو بەردانەی فڕێمـدەدان دەنوسـان بە کێلـی مەزارەکەوە کەچـی هەرگیـز ئەو بەردانەی کە هاوڕێکـانم فڕێیـان دەدان پیایـدا نەدەنوسـان، بـۆیە ئەوانـیش بە منیـان دەگـوت: کێشـەکەی تـۆ پـێش ئەوەی ئـێمە چارەسـەر دەبێت، بەڵام لە بەد بەختیدا بە پێچەوانەوە کێشـەکەی ئەوان چارەســـەر کـــراو منـــیش هێشـــتا هەر لەوێ بـــووم و چاوەڕوانی چارەسەر بووم.

زۆر جـار چـاوم لێـدەبوو کە ئەفسـەرە ئێرانییەکـان سـەردانی بارەگـای بارزانییـان دەکـرد، بەڵام بە شـێوەیەکی نهێنـی. دکتـۆر مەحمود عوسـمان و هەندێکی تـر لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دەچـوون بـۆ سـنوری ئێـران بـۆ کۆبـوونەوە لەگەڵیانـدا. کاتێـک دەهـاتن بـۆ بارەگـای بـارزانی و دادەنیشـتن و قسـەیان دەکـرد، پاسـەوانەکان دەیـانگوت ئەوانە ئەفسـەری عێـراقین و بە کـاری تـایبەت هـاتوون، وایانـدەزانی مـن نـاتوانم ئەفســەری ئێرانـی و عێراقی لەیەکتر جودا بکەمەوە. چەندین جار بە چاوەکانی خۆم دەمبینی کە گونیەی پڕکراو لە دۆلاری ئەمەریکی دەهێنران بۆیـان و سەرچاوەکەشی باڵیۆزخانەی ئەمەریکا بوو لە تاران.

بەر لەوەی لە حـاجی ئۆمەران بـڕۆم بـۆ قەسـرێ، دارا تۆفیـق هـات بـۆ لام، بەڵام ئەمجارەیـان بەو جـۆرە نەبـوو کە ناسـیبووم. هەڵوێسـتی تەواو گۆڕابـوو لەگەڵمـا، هەوڵـی دەدا خـۆی نزیـک بکـاتەوە لەگەڵـم. ئەو دارا تـۆفیقە نەبـوو کە دەمناسـی کەسـێکی

پیلانگێڕی زاڵم و بوختانچی و راپۆرتنوسی درۆزن. ئامانجی ئەم نەرم و نیان بوونەشی وەکو دواتر زانیم ئەوە بوو کە بمخاتە قسەو هەندێ زانیاریم لێدەربێنێت بۆ ئەو راپۆرتەی کە بەرزی دەکردەوە بۆ ئیدریس و لە بەرامبەر هەموو وشەیەکیدا چەند دۆلارێکی دەست دەکەوت و دەیبردن بۆ ئەوروپا بۆ ئەوەی بۆ خۆشیی و هەوەسەکانی ژیانی خۆی بەکاریان بێنێت.

لە هۆتێلەکەدا بووم، چەند رۆژێکی ئارامم تێدا بردە سەرو هەستم بە کەمێک ئاسودەیی کرد. خەوتن و پشوودانم باش بوون و باری دەرونیم ئارام بوو. هەمیشە بیرم لەو پیلانە دەکردەوە کە ئەنجامدراو منیش بۆ خۆم یەکێک بووم لە قوربانییەکانی. لە خۆم دەپرسی دەبێت ئەو لایەنە کێ بێت کە ئەو پیلانەی جێبەجێ کرد؟ ئامانجەکەی چی بووە؟ دەبێت کێ لە حاجی ئۆمەران هاوبەش بووبێت تیایدا؟ بیرۆکە و پرسیار مێشکیان وروژاندبووم. نەمدەتوانی لەسەر بۆچوونێک بگیرسێمەوە، بەڵکو بەهۆی ئەو دوودڵی و واسواسییەم چەپ و راستی خۆم لێتێکچووبوو. نەمدەزانی چارەنوسم بە کوێ دەگات، بە تایبەت کە من لە ژینگەیەکی دەرەبەگایەتیدا بووم، بە نەریتی خێڵەکی کارەکان دەکران، هیچ ئازادییەک بۆ بیروباوەڕو وشە نەبوو. بیرم لە شێوازو رێگایەک دەکردەوە کە بتوانم ژیانی خۆمی پێدەرباز بکەم، بەر لەوەی شەمەندەفەرەکە بەجێم بێڵێت. بیرم لە دارشتنی پیلانێک دەکردەوە بۆ ئەوەی لە قەسرێوە هەڵبێم بۆ رەواندوز، بە

تایبەت دوای ئەوەی هەموو گفتوگۆکانم لە گەڵیاندا بێ ئەنجام دەرچوون و هەموو ناوەند گیرییەکانیش چ لە ناوخۆ و چ لە دەرەوە بێ ئاکام مانەوە. هەموو ئەو هەوڵانە بێ بەر بوون، چونکە مەلا مستەفا خۆی بکوژ و ببڕ بوو، بە ئارەزووی خۆی بەبێ دادگا و بوونی چاودێر، هەرچی بویستایە دەیکرد. ئەو بەزۆر منی دەستبەسەر کرد، بە گوێرەی میزاج و ئەقڵیەتە خێڵەکی و سادەکەی خۆی، بۆ ئەوەی بۆ رایگشتی بسەلمێنێت کە بەهێزو بە توانایەو چی بوێت دەیکات و خەڵک لە زیندانە ترسناکەکانیدا دەستبەسەر دەکات. لە قەسری دەیان خەلکی کوردی خاوەن کەسایەتی دیاربەبێ هیچ هۆکارو پاساوێک، دەستبەسەر کرابوون و خرابوونە ژێر چاودێری توندەوە، تەنها لەسەر بناغەی ئەو راپۆرتە دروستکراوانەی کە ئاژان و سیخورەکانیان لەسەر ئەوانە هەڵیاندەبەستن و هیچ بنەمایەکی راستی و دروستییان نەبوو. ئەو کۆمەڵگە خێڵەکی و ساویلکەیە، بەو ئەقڵیەت و رەفتارانەیانەوە کە پەیرەویان دەکرد وەک ئەوە بوون کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بژین. یەک بوختانی درۆ بەس بوو بۆ ئەوەی کەسێک لە سوچێکی قووڵی بەندینخانەدا توند بکرێت.

لەو بارودۆخەدا من لە گێژەنی بیرکردنەوەدا بووم، دڵەڕاوکەی دەرونیم توش ببوو، لەبەر ئەوەی نەمدەزانی چارەنوسم بە کوێ دەگات. لە تێکچوونی بەردەوامی باری دەرونیدا بووم. رۆژێکیان

دارا عەتـار بە سـەردان هـات بـۆ لام بـۆ قەسـری، داوای لێکردم پێکەوە هەتا سەر کانییەکە بچین، بە سوپاسەوە پەسەندم کرد. لە ڕێگـا باسـی کاروبـاری حزبیمـان دەکـرد. پاسـەوانێکی سـەر بە هەواڵگری مەسعود یاوەرمـان بوو، کامیرایەکم بە دەستەوە بوو دام بەو. لە کـاتی سـەرقاڵ بوونمـان بە قسـەو گفتوگـۆ، تـوانیم هەندێ بابەت بکەمەوە کە لە ڕێگایانەوە زانیاریم لەسـەر مەکتەبی سیاسی چنگ بکەوێت.

کە دەگەیشـتینە شـوێنێکی خـۆش بە پاسـەوانەکەم دەگـوت وێنەیەکمان بۆ یادگاری بگرێت. دارا هۆکارو پاڵنەری چرکاندنی ئەو وێنانەی نەدەزانی، بەڵام من خۆم مەبەستم هەبوو لەوەدا. کە گەڕاینـەوەو دارا ڕۆیشـت بە ڕێگـای خـۆیەوە، دەسـتم کـرد بە نوسینی نامەیەکی درێژ لەسـەر هەمـوو ئەو ددان پێدانانەی دارا عەتـار، ڕاپـۆرتەکەم هـاوپێچ کـرد لەگەڵ هەنـدێ لەو وێنـانەی کە پێکەوە چرکاندمان و ناردم بۆ ئیدریس و مەسعود بارزانی بۆ ئەوەی ئەوانیش بیدەنە دەستی باوکیان مەلا مستەفا، بۆ ئەوەی هەمـوو ئەو ڕاسـتییانەی بـۆ ئاشـکرا بێـت و بزانێـت ئەنـدامانی مەکتەب سیاسییەکەی و هەریەکەیـان بە شـێوازی تـایبەتی خـۆی چۆن پیلانگێڕی دەکەن لە دژی شۆڕش و چۆن هەوڵ دەدەن لە ڕێگـای ڕاپـۆرتە هەڵبەسـتراو و درۆینەکانیـانەوە هەمـوو دڵسـۆزەکانی بـارزانی لەنـاو شـۆڕش و دەرەوەی شۆڕشـدا کەنـارگیر بـکەن. ئەمە ئەو پـیلانە جەهەننەمیـانیەی ئەو تـاقمە

خۆفرۆش و بەکرێگیراوە بوو، تەنانەت ئیدرسی کوڕی بارزانیش لەو پیلانانەدا لە دژی باوکی تێوەگلابوو، بە تەماعی ئەوەی لە دوای باوکی سەرکردایەتی بۆ خۆی بێت، بەڵام ئەو نەیدەتوانی ئەوەی بۆ بچێتە سەر، لەبەر ئەوەی بەرامبەرەکەی کە مەسعود بارزانی بوو لە بەردەمیدا دەوەستا و هێزێکی پۆلایین و پشتیوانێکی دڵسۆزی باوکی بوو. بارزانی لەگەڵ سێ ژندا هاوسەرگیری کردبوو. یەکەمیان دایکی عوبێدوڵا بوو، دووەمیان دایکی ئیدریس بوو، سێیەمیان دایکی مەسعود بوو. ئەمەی سێیەمیان لەگەڵیدا مابوو، بۆیە متمانەی زیاتری بە مەسعود هەبوو وەک لەوانی تر. وێڕای ئەوەش لەگەڵ ئیدریس کۆک و تەبا بوو لەسەر هەموو ئەو پرسە ناوخۆییەکان کە تایبەت بوون بە سیاسەتی شۆڕش. بەڵام بارزانی ئاگای لە زۆربەی ئەو نامە و ڕاپۆرتانە نەبوو کە دەگەیشتنە بارەگا و بەدەستی نەدەگەیشتن، بۆیە بەتەواوی ئاگای لە ڕاستییەکان نەبوو.

داوام لە دارا عەتار کرد چاکەیەکم لەگەڵدا بکات و نامەیەکم بگەیەنێت بە کەسوکارم لە لوبنان بۆ ئەوەی دڵنیا بن کە باشم و تەندروستیم باشە. یەکسەر بەبێ دوو دڵی داواکەمی جێبەجێ کرد و چرپاندی بە گوێمدا: لە مەسعود بارزانیم بیست کە بە نیازن بەم زوانە بتخەنە ناو زیندان. دارا عەتار لە قەسرێ بە یەک وشە ئەمەی خستە دەستمەوە. هەروەها گوتی کە پەشیمانە لەوەی لە لوبنان بەرامبەر بە من کردی، بەڵام ئەو تەنها فەرمانەکانی

مەکتەبی سیاسی جێبەجێ کردووە، هەرچەندە کە دەیزانی هەڵەیە. کە ئەمانەی پێگوتم ئیتر بە تەواوەتی بڕوام بەوە کرد کە خۆم ماوەیەکی درێژ بوو بە جدی بیرم لێدەکردەوە. بۆیە بیرم لەوە دەکردەوە کە نەخشەیەکی دروست یاخود ڕێگایەک بدۆزمەوە بۆ راکردن لە کۆشکی ئیدریس بارزانی لە قەسرێ، بە هەر نرخێک بووە، چونکە ئیتر مەترسییەکان وردە وردە لێمنزیک دەبوونەوە.

دوای تێپەڕبوونی هەفتەیەک لە دانانی نەخشەکەم بۆ راکردن، بە شێوازی تایبەتی خۆم چەند نامەیەکم لە زیندانەوە بۆ بەیروت نوسی. لە نێوان هاوڕێ پێشمەرگەکانمدا کەسێک هەبوو زۆر متمانەم پێبوو، ئەو ئەرکەم بەو سپارد. لە نامەکانمدا بۆ یەکەمجار داوام کردبوو کە حزب لە لوبنان هەڵوێستێکی زۆر توند بنوێنێت لەدژی دەستگیر کردنم و بەشێوەیەکی چڕو پڕ ئەو کارە بۆ رایگشتی لوبنان و لایەنە نێودەوڵەتییەکان بێ رەحمانە روون بکەنەوە. ئەوەی هانیدام ئەو هەڵوێستە بنوێنم ئەوە بوو کە هیچ هیوایەکم بەوە نەما ئازاد بکرێم. هەروەها بۆم روونکردبوونەوە کە بەهیچ جۆرێک رێگا نەدەن هیچ کەس بە گەیشتنی نامەکانم بزانێت، چونکە ئەگەر ئەوە روویدات ئەوا راستەوخۆ گولە باران دەکرێم. حزب لە لوبنان دەستی کرد بە هێرشی توند لەسەر بارزانی و مەکتەبی سیاسی و کاریگەری زۆر باشی هەبوو.

رۆژی ٣٠ نیسانی ١٩٧٢ لە ژوورەکەی خۆم بە خەمبارییەوە سەرم داژەنیبوو، عەبدول موهەیمەن بارزانی هاتە ژوورەوە و

پێی گوتم: فەرموو تەماشا کە بیخوێنەوە بزانە هاوڕێکانت لە حزب چی دەنوسن و چۆن هێرش دەکەنە سەر بارزانی و سەرکردایەتی شۆڕش. ئەو بەیانە بخوێنەوەو بۆچوونی خۆتم پێبڵێ. دەستم بە خوێندنەوەی بەیاننامەکە کرد، دڵنیا بوومەوە کە نامەکانم گەیشتوون، کە لە خوێندنەوەی تەواو بووم گوتم: هیچ بۆچوونم نییە لەسەری، بەڵام دەمەوێت راشکاوانە ئەوە بڵێم کە ئێوە خۆتان هۆکاری دروستکردنی ئەو کێشە سیاسییانەن، بۆ زانیاریشتان من خۆم لەگەڵ ئەوەدا نیم کە حزب لە لوبنان ئەو جۆرە بەیاننامانە دەربکات و بەتایبەت کە هێرش دەکەنە سەر شۆڕشەکەی بارزانی کە من خۆم ئەوپەڕی رێزو ستایشم بۆی هەیە. رۆژنامەکەی دەنگی کوردی لێوەرگرتمەوەو رۆیشت. لەو کاتەوە ئیتر چاودێری لەسەرم توند کرا. لەو کاتەدا ئەندامانی لیژنەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا بە هەردوو باڵی راست و چەپەوە، لەگەڵ هەندێ لەو کەسانەی کە ناوی خۆیان نابوو بەرەی ئاشتی، گەیشتنە بارەگای شۆڕش. دەهام میرۆ گاڵتەی بە بەرەی ئاشتی دەکرد و ناوی نابوون 'بەرەی تەشویش'.

هەموو ئەمانە لە قەسری بوون، بۆ ئەوە هاتبوون کە لەگەڵ مەلا مستەفا دانیشن و گرفتە ئاڵۆز و قووڵەکانیان چارەسەر بکەن. ئەو راپۆرتانەی کە لەلایەن مستەفا بەگ و حسێن حاجۆ و ئیبراهیم گاباری کە ناسرابوو بە (سوری) بۆ بارەگای بارزانی

بەرز دەکرانەوە، جەختی لەوە دەکردەوە کە پشتیوانی باڵەکەی دەهام میرۆ بکرێت، بەڵام ئەندامانی باڵی دیموکراتی چەپی کوردی سوریا هیچ پەسەند نەبوون لە لایەن بارزانییەوە. هەموو ئەوانە دەهاتن بۆ سەردانم و هەموویان یەکتریان تاوانبار دەکرد، منیش وتەی هەموویانم لای خۆم تۆمار دەکرد بۆ مێژوو. دەهام میرۆ لەهەموویان بەهێزتر بوو، لەبەر ئەوەی لە لایەن مستەفا بەگ و حسێن حاجۆ پشتیوانی دەکرا. ئەمانە بە ئارەزووی خۆیان لە هەموو ناوچەکاندا بە ئۆتۆمبیلی کادیلاک دەسوڕانەوە، بە تایبەت مستەفا بەگ، بەڵام ئەوانی تر لە ژێر چاودێری توندا بوون. توند ترین بەرهەڵستکاری باڵەکەی دەهام میرۆ، دەروێش صادق بوو، کە هەمیشە هەڕەشەی دەستگیرکردنی لەسەربوو، هەندێ جار گوێبیستی ئەوە دەبووم کە هەندێ لە نەیارەکان دەستگیر دەکرێن و تا کۆتایی تەمەنیان لە زیندانەکانی شۆڕش دەمێننەوە بەهۆی دژایەتیکردنی سیاسەتەکانی دەهام میرۆوە. بارزانی خۆی هاتە سەر هێڵ و ئیرادەی خۆی بەسەر هەموو ئەوانەدا سەپاند کە لە نێوان دوو هەڵبژاردەدا دانەیەک پەسەند بکەن: یان زیندان یان ئەوەتا پەسەندی بکەن کە دەهام میرۆ سکرتێری حزب بێت لە سوریا. وێڕای هەموو ئەو کارانە محەمەد نایۆ لە زیندانەکانی شۆڕش دەست بەسەر بوو، دوای ئەوە بوو بە یەکێک لە ئاژانەکانی مەسعود بەرامبەر بە ٦٠ دیناری موچەی مانگانە!. ئەو بە تەواوی ئازاد بوو لە هاتوچۆکردن لە ناوچەکانی

ژێر دەسەڵاتی شۆڕش بۆ هەر شوێنێک بیەوێت، تەنها چاودێری مستەفا بەگ و حسێن حاجۆ و شوێنکەوتووەکانیان نەبێت. بە چاوی خۆم دەمبینی کە چۆن حسێن نابۆ راپۆرتەکانی خۆی پێشکەش بە مەسعود دەکات و دواتریش عەبدول موهەیمەن دەیان دیناری بۆ دەژمارد و پسوولەی وەرگرتنی پارەکەشی مۆر دەکرد. هەموو ئەو کارانە لە ژوورەکەی خۆمدا دەکرا.

سەرکردایەتی کۆنەپەرستی شۆڕشی کورد لە عێراق، بە تەواوەتی پشتی بە ئاژان و جاسوس و خائنەکان دەبەست. بودجەی شۆڕش هەر هەمووی لە بەکرێگیراوەکانی مەسعود و ئیدریس بەفیڕۆ دەدرا.

دڵەڕاوکەیەکی زۆرم هەبوو، بیرم لە رێگایەکی مسۆگەر دەکردەوە بۆ راکردن، لەبەر ئەوەی لە بارێکی دەروونی زۆر خراپدا بووم، خۆم یەکلاکردەوە و بڕیارمدا رابکەم، جا دەرئەنجامەکەی هەرچییەک بێت. لەمانگی ئاداری ساڵی ١٩٧٢ دا بوو، دەستمکرد بە داڕشتنی نەخشەی راکردن لە قەسری، بۆ ئەوەی لە زیندانە گەورەکەم دەرچم و بەئازادی بڕۆم بۆ شوێنێک، جا هەر شوێنێک بووە. لە گەڵ یەکێک لە پێشمەرگەکاندا رێکەوتم، ئەو کەسێکی دڵ باش و راستگۆ بوو لە گەڵمدا. بڕیارماندا هەردوکمان پێکەوە لە رۆژێکی دیاریکراودا رابکەین. ئەو شەوەی کە دەبوو رابکەین، دانیشتبووم سجوقم ئەخوارد و بیرۆکەی جیاواز بە مێشکمدا دەهات، لەپڕ لە دەرگای ژوورەکەم

درا، هەستتام دەرگاکەم کردەوە، توشی سەرسورمانێکی زۆر بووم کە تەماشام کرد رەیازی کورمە. بڕوام بە چاوەکانی خۆم نەدەکرد. دوای بەخێرهاتن و هەواڵپرسینی یەکە یەکەی خێزان و خزمان، هۆکاری هاتنەکەیم زانی. نامەیەکی تایبەتی لە دایکییەوە هێنابوو بۆ ئیدریس بارزانی و داوای ئازادکردنی جەمیل مەحۆی مێردی دەکات. نامەکەی بە هێرشکردنێکی زۆر توند بۆ سەر مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکرات بە کۆتا هێنابوو. دوای خوێندنەوەی نامەکە ئەوەی کە پێویست بوو بیسڕمەوە، سڕیمەوە بەر لەوەی کوڕەکەم بیدات بە ئیدریس، ئەمەش لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی.

بە کوڕەکەمم گوت: کوڕم رەیاز دەزانی ئەگەر ئەمشەو تۆ نەهاتیتایە، بە تەمابووم دەمەو بەیان رابکەم بۆ دەرەوەی سنورو خۆم لە جەهەننەمی ئەم زیندانە ترسناکە رزگار بکەم، کە ئیتر لەوە زیاتر توانای بەرگەگرتنیم نەماوە. پێمخۆشە بمرم زۆر لەوە شکۆمەندانە ترە کە لەو حاڵەتە زەبوونییەدا بەند بم.

رۆژی دواتر هەواڵی ئەوەم زانی کە داودی برام، لەگەڵ کەسێکی دیکەدا گەشتۆتە بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ناوپردان. پاسپۆرتەکانیان لە هەردووکیان وەرگرتووەو هەردوکیانیان لە بارەگای مەکتەبی سیاسی دەستبەسەر کردووە. من لەو نێوەدا لە ژوورەکەی خۆمدا دانیشتبووم، کاتژمێر ١٠ی بەیانی بوو، لەگەڵ رەیازی کوڕم قسەو باسمان دەکرد. یەکسەر دەرگاکە کرایەوەو

مەجیدی نوسەری لای ئیدریس لەگەڵ ژمارەیەک پاسەواندا هاتنە ژوورەوە. بەبێ هیچ پرسیارێک فەرمانیدا بە کوڕەکەم هەستێتە سەر پێ. زۆر بە وردی هەموو گیانی پشکنی، هەموو پەڕاوەکانی ناو گیرفانی دەرهێناو پاسپۆرتەکەشی برد و بە شێوەی فەرمان گوتی: تۆ دەستگیرکراویت. دوای تەواو بوونی لەو شێوازی تیرۆرە، بە شوێنیدا چوومە دەرەوە و لێمپرسی ئەمە چییە ئەو رەفتارە ناڕەوایە بۆ دەکەن؟ وەلامی دامەوە و گوتی: ئەمە فەرمانی ئیدریسە من جێبەجێی دەکەم، کوڕەکەت لە پاڵ خۆتدا زیندانی دەکرێت. پێمگوت ئاخەر بۆچی لەبەرچی؟ گوتی: زانیاری تەواومان لە عەزیز عەقراوی بەرپرسی لقی پارتی لە هەولێر، بەدەست گەیشتووە کە کوڕەکەی جەمیل مەحۆ بە ئاسانکاری لە لایەن دەزگای هەواڵگری عێراقەوە هاتۆتە کوردستان. پێمگوت: ئەوە بوختانە و راست نییە. گوتی: زانیاری هەواڵگرییەکانمان درۆ ناکەن، بە تایبەت عەزیز عەقراوی زۆر لەوە دڵنیایە. گفتوگۆ لە نێوانماندا توندتر بۆوە، تورەبوونم گەیشتە ئاستێکی زۆر تیژ و تەواو بە دەموچاومەوە دیار بوو، بەلام هێمن بوومەوە و لەدڵی خۆمدا گوتم رۆژێک دێت تۆڵە لەم بەکرێگیراوانە دەکەمەوە، بە تایبەت لە عەزیز عەقراوی. دواتر گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم و داوام لە کوڕەکەم کرد بزانم چۆن هاتووەو گەیشتۆتە ئێرە بۆ ئەوەی ئاگادار بم و راستییەکان بزانم، بەمەش دەکەوەمە هەڵوێستێکی بەهێزەوە لە رووبەڕووبوونەوەی ئەم کۆنەپەرستانە کە هیچ

سۆز و بەزەییەک لە دڵیاندا نەماوەو باوەڕیان بە هیچ شتێک نییە جگە لە تیرۆر و کوشتن، لە راستیدا ئەوانە خوێنمژی گەلی کوردن.

کوڕەکەم دەستیکرد بە گێڕانەوەی چۆنیەتی هاتنی. ئەو لەگەڵ گەیشتنیدا بۆ هەولێر سەردانی بارەگای لقی دووی پارتی دیموکراتی کوردستانی کردووە. بەرپرسی لق لەو کاتەدا عەزیز عەقراوی بووە. کوڕەکەم خۆی دەناسێنێت کە کوڕی جەمیل مەحوییە و دەیەوێت پسوڵەیەکی ڕێگەپێدانی بۆ بکرێت. عەزیز عەقراوی بە زاراوە گەوجانەکەی خۆی گوتبووی: بڕۆ دەرەوە من پسوڵەی ڕێگەپێدانم نییە، بڕۆ بۆ لای عەبدول وەهاب ئەتروشی، ئەو پارێزگاری هەولێرە.

ئینجا سەردانی پارێزگاری کردووەو خۆی ناساندووە. پارێزگار زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە پێشوازی کردووە، ئینجا کەسێکی لەگەڵدا ناردووە بۆ فەرمانگەی کاروباری ئاسایش، لەوێ پسوڵەیەکی ڕێگەپێدانیان بۆ کردووە. لە هەولێرەوە کە هاتووە بۆ گەلالە پێشمەرگەیەکی لەگەڵدا بووە و لە ناو ئۆتۆمبیلەکەدا یەکتریان ناسیوە. ئەو پێشمەرگەیە پێی گوتووە باوکت لە قەسری زیندانە. ئەویش راستەوخۆ بەبێ ئەوەی وەک پێویست دەکات هەموو میوانێک بچێت بۆ بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ناوپردان هاتووە بۆ لای من. دەبوو لە ناوپردان خۆی بناسێنێت و بڕوات بۆ مەکتەبی سیاسی، بەڵام ئەو بەبێ هیچ

مەبەستێک و هەروا خۆڕسکانە بۆ لای من هاتبوو. دوای ئەوەی کـوڕەکەم لە گێـڕانەوەی ئەو چیـرۆکە بـۆوە، دەسـتم کـرد بە نوسینی نامەیەکی درێژ بۆ روونکردنەوەی راستی رووداوەکە و ناردم بۆ ئیدریس، ئیتر رێگایان دا بە کوڕەکەم ئەویش لای من بە دەستبەسـەرکراوی لە ژوورەکەدا و لەژێـر چـاودێری تونـدا بمێنیتەوە.

رۆژی دادێ ئیدریسم لەسـەر جادە بینی کە دەیان پاسـەوان دەوریان گرتبوو، ئەو هەلەم قۆستەوەو گوتم کاک ئیدریس تکایە دەمەوێت قسـەت لەگەڵـدا بـکەم سـەبارەت بە کـوڕەکەم، رێگەی نەدام قسەکانم تەواو بکەم بە تووڕەبوونەوە گوتی: ریازی کوڕت بەهاوکاری دەزگای هەواڵگری عێراق هاتۆتە ناوچەکانی شـۆڕش، ئیتـر لەو بـارەوە قسـەم لەگەڵـدا مەکە. سـەری راتەوەشـاند و هەڕەشەی دەکرد، ئینجا بە تووڕەیی رۆیشت بۆ بارەگاکەی خۆی. ئەم رووداوە لەبەردەم خەڵکیدا روویدا، لەبەر دەم هەموو پاسـەوان و پێشـمەرگەکاندا، هەموویـان زۆریـان پێنـاخۆش بـوو، بەڵام کەسیان دەسـەڵاتیان نەبـوو، کەسـیان یەک وشـەی نەوت. خـۆم وکوڕەکەم لەژێر مـانەوە و دەستبەرسـکردنی زۆرەملێدا بـووین. جگە لە سەبرگرتن هیچی ترم لەبەردەمدا نەبوو.

رۆژی ١٠ی ئایاری ١٩٧٢ محەمەد عەزیز هـات بۆ ژوورەکەم، لامەوە دانیشت و دەسـتمان بە قسـان کـرد. پرسـیاری چارەنوسـی داودی برام لێکرد، گوتی باشە. ئینجا گوتی من لە لایەن مەکتەبی

سیاسییەوە راسپێردراوم کە هاوکاریت بکەم لە دارشتنی بەیاننامەیەک بۆ وەڵامدانەوەی ئەو بەیانەی کە حزبەکەمان لە لوبنان بڵاویان کردۆتەوە و دەبێت بە تەواوی ئەو بەیانە بە درۆ بخرێتەوە.

هەروەها گوتی دوای ئەوەی کە ئەو بەیانە دەنوسم، رەوانەی رۆژنامەی (التآخی) دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە، دوای ئەوە ئینجا داودی برام دێنن بۆ لام. داواکەیم پەسەند کرد. ئینجا لێمپرسی دوای دەرکردنی ئەو بەیانە ئازادم دەکەن؟ گوتی بەڵێ سەربەست و ئازاد، دەتوانیت بۆ کوێ ئەتەوێت برۆیت.

ئیتر دەستیکرد بە هاوکاریکردنم بۆ ئامادەکردنی دەقی بەیانەکە و شێوازی دارشتنی، ئینجا قسەکانی بڕیم و گوتی: لە بەیانەکەدا بنوسە کە تۆ هەندێ هەڵەت ئەنجام داوە لە بەغداد. لە وەڵامدا گوتم: واتە بڵێم من لە میوانداری بارزانیدام، بەندکراو نیم و لەژێر چاودێری توندا نیم و دەست بەسەرنیم، وانیە؟ دەتەوێت درۆ لەگەڵ خۆمدا بکەم؟ گوتی جەمیل گوێبگرە و باش لێمتێبگە: ئەگەر ئەو دوو رستەیە نەنوسیت ئەوا هەرگیز ئازاد ناکرێیت نە کورەکەت و نە براکەشت. ئینجا لە جیاتی ئەوەی بە تەنها خۆت دەستگیرکراو بیت، ئەوا کورەکەشت و براکەشت دەخرێنە نێو زیندانەکانی شۆرش. ئیتر تۆ خۆت ئازادیت چی دەکەیت. ئینجا دووبارەی کردەوەو گوتی: بەر لەوەی تۆ بێیت بۆ ئێرە لەگەڵ سەدام حسێن کۆبوونەوەت کردووە؟ پێمگوت نەخێر ئەوە راست نییە.

زیاتر له یەک سەعات مایەوە، پێکەوە گفتوگۆمان بوو، قسەکان هەندێجار توند دەبوونەوە، هەندێ جاریش دەنگمان بەرز دەکردەوە، تا گەیشتینە چارەسەرێکی مام ناوەند، ئەوەش بەوەی کە من نەنوسم هەندێ هەڵەم کردووە لە بەغدا، چونکە هەستم کرد بەمە دەیانەوێت بەزۆر پەیوەندیم بە بەغداوە بەسەردا بسەپێنن، ئەمەش راست نەبوو، بۆیە من رەتمکردەوەو نەچوومە ژێر باری. دوای تەواو بوونمان لە نوسینی شێوازی بەیانەکە، لێیوەرگرتم و بردی بۆ مەسعود و ئیدریس، دوای ئەوە براکەمیان هێنا بۆ ژوورەکەم.

لێرەدا دەمەوێت روداوێک بۆ مێژوو بە یاد بهێنمەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەوان بەزۆر و زۆرداری ناچاریان کردم لە ژێر فشارو هەڕەشەدا نامەیەک مۆر بکەم کە هیچ پەیوەندی بە منەوە نەبوو. داودی برام لە ژوورێکی ئەوبەر خۆمەوە دەست بەسەرکرا، چاودێری توند و دەستبەسەرکردنی زۆرە ملە بەسەر هەمووماندا سەپێنرا.

لە ١٣ی ئایاردا ئیدریس لە ناو ئۆتۆمبیلەکەی خۆیدا بوو، داودی برام رێگای لێگرت و بەرامبەری وەستاو پێی گوت: نازانم بۆچی لێرە بەو شێوەیە منتان دەستگیرکردووە؟ من هاتووم بۆ کوردستان بۆ پرسیارکردن لە بارودۆخی براکەم. ئیدریس وەڵامی دابۆوەو گوتبووی: داود تۆ لێرە دەمێنیتەوە، ئینجا زیاتر گوتبووی: لێرە بمێنەرەوە. ئیتر براکەم زۆر توڕە و نیگەران بووە و بە بێزاری و توڕەبوونەوە پێی گوتبوو: من تاوانم چییە؟

له ١٤ی ئایـــاری ١٩٧٢ ژمـــارەیەک لە کوردەکـــانی ســـوریا کۆبـوونەوەیەک لەگەڵ ئیـدریس و مەلا مسـتەفا دەکەن. لە کـاتی کۆبـــوونەوەکەدا ئیـــدریس لەبەردەم ســـەرکردەکانی پـــارتی دیموکراتی کـورد لە سـوریادا کـوڕەکەی جەمیل مەحۆ تۆمەتبـار دەکـات بەوەی کە بە ئۆتـۆمبیلێکی سـەربازیی داخـراو لە لایەن دەزگای هەواڵگری عێراق هاتۆتە کوردسـتان. دوای کۆبوونەوەکە ئەم تۆمەتەیـان پێڕاگەیانـدم. ئەم تـۆمەتە لە زمـانی کەسـێکەوە هـاتۆتە دەر کە سـوکترین کەسـە مـن لە کوردسـتان ناسـیبێتم ئەویش ئەو شەیتانەیە کە بە ئیدریس بارزانی ناسراوە. لە ڕۆژی دواتر ویستم ڕاستینەی ئەم تۆمەتە بدۆزمەوە کە هیچ بنـاغەیەکی نییە و ئیدریس لە ڕێگای دەزگای پاراستنەوە بڵاوی دەکاتەوە.

دواتر عەبدول وەهاب ئەترووشـی پارێزگاری هەولێر، لەبەردەم لیژنەی ناوەنـدی پارتی دیموکراتی کوردستان گوتبووی: ئەوەی لەسەر کوڕەکەی جەمیل مەحۆ دەگوترێت دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە ئەو خۆی ئاسانکاری کردووە بۆ کوڕەکەی جەمیل مەحۆ کە بێت بۆ کوردستان، ئەو خۆی پسوڵەی ڕێگەدانی بۆ کردووە، چونکە پێشتر عەزیز عەقراوی بۆی نەکردبوو.

لەو سـەروبەندەدا کۆبـوونەوەی ئاسـایی لیـژنەی ناوەنـدی و مەکتەبی سیاسـی بەڕێوە بوو، کاتێک حەبیب محەمەد کەریـم و دکتۆر مەحمود عوسمان بە ڕێگاوە دەبن بۆ هـۆڵی کۆبـوونەوەکە، داودی بـرام لەبەردەمیانـدا دەوەسـتێت و ڕوودەکـاتە حەبیـب

محەمەد کەریم و پێی دەڵێت: من تاوانم چییە؟ من کەسێکم خەڵکی بەیروت، ناتوانم لێرە بمێنمەوە، من جەمیل مەحۆ نیم بەرگەی ئەو هەموو نارەحەتیانە بگرم. حەبیب محەمەد کەریم و مەحمود عوسمان هەردوکیان بەبێ ئەوەی وەڵامی بدەنەوە پێی پێدەکەنن.

له ١٥ی ئایار یەکێک لە پاسەوانەکانی ئیدریس هات و بانگی داودی برامی کرد و پێی راگەیاند کە ئیدریس بانگی دەکات. لە کۆبوونەوەکەدا ئیدریس و حەبیب دوو داخوازی دەخەنە بەردەمی بۆ ئەوەی جەمیل مەحۆ ئازاد بکەن:

یەکەم، ئەو بەیانەی کە بە زۆر پێیان نوسیم، چاپی بکەم و لە رۆژنامەی (دەنگی کورد) بڵاوی بکەمەوە، ئاماژە بەوە بکرێت کە لە رۆژنامەی (التآخي) زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان وەرگیراوە.

دووەم، کۆکردنەوەی ئەندامانی حزبەکە و هەڵپەساردنی ئەندامێتی کورەکانی جەمیل مەحۆ و لایەنگرەکانی لە ناو حزبەکەو هەڵبژاردنی سەرکردایەتییەکی نوێ بە گوێرەی خواستی سەرکردایەتی ئەوان.

دوای جێبەجێکردنی ئەو دوو داوایە، ئینجا جەمیل مەحۆ ئازاد دەکرێت. دوای دەرچوونی براکەم لە کۆبوونەوەکە پێمگوت: کورەکەشم ئازاد ئەکەن؟ لە وەڵامدا گوتی نازانم کەس باسی ئەوی نەکردووە. دوای کەمێک فرانسوا هەریری سەرۆکی

دەزگـای هەواڵگـری شـۆڕش لە کۆبـوونەوەکە هـاتە دەرەوە، پێمگوت: کاک فرانسوا دەتوانیت جارێکی تر بڕۆیتە ژوورەوەو لە ئیدریس بپرسیت ڕەیازی کوڕم دەمێنێتەوە یان دەتوانێت لەگەڵ مامیدا بڕوات، دوای ئەوەی کە بۆتـان دەرکەوت ئەو ڕاپۆرتـانەی لەسـەر ئەو لە لایەن عەزیـز عەقـراوی بەرز کـراونەتەوە درۆ بوون؟ فرانسوا گەڕایەوە بۆ نـاو کۆبوونەوەکە، کەمێک مـایەوە و دواتـر مزگێنـی ئەوەی دامێ کە کوڕەکەم دەتوانێت لەگەڵ مامیدا بڕواتەوەو ئازاد کراوە.

بەهـۆی ئەو هەواڵەوە خۆشـی و کـامەرانی کەوتە نێـو پاسـەوانەکان و ئەو پێشمەرگانەی هاوسـۆزم بـوون و هەمیشـە هیواخوازی ئەوە بوون کە خۆم و کوڕ و براکەم ئازاد بکرێین.

لە کـاتی ڕاکـردن و دەسـتگیرکردنی ڕەیـازی کـوڕم، بڕیارمـدا لەگەڵ خۆمـدا بە پێـی ئەو نەخشـەیەی کە پـێش هـاتنی ئەو دام نـابوو بـۆ ڕاکـردن ئەویـش بەرم، بەڵام دوای گەیشـتنی بـراکەم نەخشەکەم جێبەجێ نەکرد، چونکە لە ژیانی براکەم دەترسام، ئەو توانای بەرگەگرتنی ئەشکەنجەی دەروونـی و بەنـدکردن و زینـدانی نەدەگـرت، بەڵام نەخشـەکە لای ئەو کەسـانەی کە ئامـادەبوون هاوکـاریم بـکەن، هێشـتا مـابوو، ئەوان ئامـادە بـوون هەر کـاتێ بمەوێت جێبەجێی بکەم.

بـراکەم و کـوڕەکەم ڕۆشـتن، هەنـدێ نـامەی نهێنـیم پێوانـدا نـاردەوە، لەگەڵ دەفتەرێکـی تەواو کە بیرەوەریەکـانی زینـدانم

هەموو تێدا تۆمار کردبوون. کوڕەکەمم تێگەیاند کە دەبێت چی بکات و ئەو سیاسەتەی کە دەبێت پەیڕەوی بکات چۆنە، هەروەها داوام لە ئەندامان و لایەنگرانی حزبەکەم کرد کە داخوازییەکانی سەرکردایەتی بارزانی رەت بکەنەوە، چونکە لە ژێر هەڕەشەو گوڕەشەدا پێیان کردووم. داوام لێکردن نەچنە ژێر باری هیچ بەیان و نامەیەک هەتا ئەو کاتەی من لێرە بەند و دەستبەسەرم و ئەو بەیانەی لەگەڵ براکەم ناردوومە تەنها وەکو مەرەکەبی سەر کاغەز سەیری بکەن.

بەڵام لە دوای گەڕانەوەی کوڕەکەم و براکەم، بەیانەکە لەسەر داوای براکەم لە رۆژنامەی دەنگی کورد بڵاو کرایەوە، بۆ ئەوەی ئازادم بکەن و بگەڕێمەوە. هەروەها بەگوێرەی رێکەوتنی براکەم و ئەو بەڵێنەوەی بەوانی دابوو، ئەندامێتی کوڕەکانم و لایەنگرە دڵسۆزەکانمیان لە حزبەکە هەڵپەسارد. براکەم فشاری خستبووە سەر حزب بۆ ئەوەی داخوازییەکانیان جێبەجێ بکەن و ژیانم رزگار بکات لە دەستیان. لە ناخی خۆمدا دەمگوت رۆژێک دێت رووی راستەقینەی ئەو سەرکردایەتیە گەندەڵە ئاشکرا بکەم کە بە ئاگرو ئاسن و چەندین شێوازی جیاوازی تیرۆر دەسەڵاتی خۆی دەسەپێنێت.

بارزانی حەزی لە جێگۆڕکێ بوو. بارەگا زستانەکەی خۆی بەجێدەهێشت و دەچوو بۆ حاجی ئۆمەران کە هاوینەهەواری دڵخوازی خۆی بوو، بۆ ئەوەی لەوێ هەندێ بابەت چارەسەر

بکات و به ئارەزووی خۆشی لێبووردن بۆ هەندێ کەس دەربکات. هەمیشە چاوەڕوان بووم و بە پەرۆشەوە دەمگوت: دڵنیام کە ئازادم دەکات. ئەم جارەیان دڵی خۆم بە هیوا خۆش دەکرد، بەڵام رۆژ و مانگ تێدەپەڕین بەبێ ئەوەی هیچ هیوایەک بۆ چارەسەری کێشەکەم دەرکەوێت. رۆژێکیان بارزانی بارەگای خۆی لە دیلمان و قەسرێ گواستەوە بۆ حاجی ئۆمەران، منیان لەگەڵ چەند پاسەوانێکدا لە قەسرێ هێشتەوە.

جارێکیان بەرپرسێکی بارەگای بارزانی بەناوی حسێن عەقراوی هات بۆ لام و داوای لێکردم لەگەڵیدا بڕۆم. نەمدەزانی بۆ کوێ دەچین، لە تەنیشتیا دانیشتم بەبێ ئەوەی هیچ پاسەوانێکمان لە گەڵدا بێت. لە رێگا بیرۆکەیەکی جەهەننەمی بە خەیاڵمدا هات، شەیتان کەوتە کەڵکەڵەدانم بەوەی کە پیاوەکە بکوژم و بە ئۆتۆمبیلەکەش رابکەم. چەند جارێک ئەوە بە خەیاڵمدا هات و دەشمتوانی ئەوە بکەم. لە قەسرێوە هەتا گەلاڵە هەر بیرم لە ئەنجامدانی ئەو کارە دەکردەوە هەتا گەیشتینە ناوپردان و لەوێشەوە بۆ دەربەندی. چووینە چێشتخانەیەک بۆ نان خواردن. من پێش ئەو نانخواردنەکەم تەواو کرد، بۆیە هەستام و رۆیشتم. کە چوومە ناو بازاڕی شارۆچکەکە کۆمەڵێک برادەر لێمئالان. لە ناو بازاڕەکەدا بیرم لەوە دەکردەوە بە ئۆتۆمبیلی تەکسی کە لەو ناوەدا لە گۆڕەپانەکەدا بوون بەرەو گەلاڵە بڕۆم. شەیتان راکردنی دەخستە مێشکمەوە و هانی دەدام ئۆتۆمبیلێک بگرم،

بەڵام بۆ کۆتا جار بە ئاگا هاتم و بەسەر ئیرادەی خۆما زاڵ بووم و گوتم؛ راکردن لە چارەنوس مەحاڵە، خۆم دایە دەستی خودا.

نزیکەی نیو سەعات لە شەقامەکانی دەربەندی بە تەنها بووم، ئیتر گەڕامەوە بۆ لای حسێن عەقراوی. سواری ئۆتۆمبیلەکە بووین و بەرەو لوتکەی شاخە بەرزەکان ڕێگامان بەرەو حاجی ئۆمەران دەبڕی. لە بارەگای ئیدریس و مەسعود بارزانی دایانبەزاندم، لەوێشەوە بۆ لای یەکێک لە خێوەتەکان کە ژمارەیەکی زۆری لە پاسەوانی بارەگاکە لە دەوروبەری بوون، بە پێچەوانەی ئەوەی کە جاران لە دیوەخانی مەلا مەستەفا لە حاجی ئۆمەران دایاندەنام. هۆکاری ئەو رەفتارەم نەدەزانی. پێشتر لە بارەگای ئیدریسەوە دەچووم بۆ حاجی ئۆمەران بەبێ ئەوەی پرس بە کەسیان بکەم، بە تەنها ڕێگای گۆڕستانەکانم دەگرت بەبێ ئەوەی کەس بمبینێت. لە چایخانەکان بە ئازادی دادەنیشتم و زۆرێک لە هاوڕێکانم دەبینی هەرچەندە نەیاندەوێرا لەگەڵ خۆم و پێشمەرگەکاندا قسان بکەن.

ڕۆژی یەکی حوزەیرانی ١٩٧٢ بوو، بە ڕێکەوت چاوم بەو کەسە کەوت کە لەگەڵیدا ڕێککەوتبووم لە قەسری رابکەم. راشکاوانە قسەمان کرد و پێی وتم کە ئەو ئامادەیە قوربانی بە هەموو شتێک بدات بۆ ئەوەی من رزگار بکات، بەڵام راکردن لە حاجی ئۆمەرانەوە زۆر قورسە ئەگەر نەڵێم مەحاڵە، چونکە حاجی ئۆمەران لەسەر سنوری ئێران بوو، دەسەلاتدارانی

ئێرانیش لەگەڵ سەرکردایەتی شۆرش پێکەوە لەسەر هەموو شتێک کۆکن، ئەگەر بچمە ناو ئێران و دەستگیر بکرێم ئەوە وەکو پارویەکی ئاسان دەبم و رادەستی شۆرشم دەکەنەوە، تەنانەت ئەگەر بە سەلامەتیش بگەمە گەلاڵە ئەوە زەحمەتە خۆم بگەیەنمە ناو خاکی عێراق. هەموو ئەو نەخشانەمان تاوتوێ کرد. بە بۆچوونی هاورێکەم راکردن لە رابووردوودا ئاسان بوو، بەڵام لێرە زۆر زەحمەتە، هەروەها بە توندی گلەیی ئەوەی لێکردم کە پێشتر بۆچی نەخشەکەی قەسرێم جێبەجێ نەکردووە، منیش پێمگوت، چۆن دەتوانم ئەوە بکەم و ژیانی کورەکەم و براکەم دووچاری مەترسی بکەمەوە لە کاتێکدا ئەوان لە هەمان شەودا لەوێ پەیدا بوون. هاورێکەم دەستیکرد بە گیرفانیدا و پێنج دیناری دەرهێنا، لێموەرگرت بەو مەرجەی کە دواتر بیدەمەوە. ئینجا گوتی: ئاگات لە جاسوسەکان بێت.

بەشوێن دانانی نەخشەیەکی نوێوە بووم بۆ هەڵهاتن لە بارەگای بارزانی، پەیوەندیم بە کەسێکەوە هەبوو، بریاربوو کاتژمێر چواری پاش نیوەرۆ لە نزیک کارێزەکەی حاجی ئۆمەران یەکتر ببینین. رێکەوتبووین لەسەر ئەوەی کە هەر لەوێوە بەگوێرەی نەخشەکەمان دەربچین. رێکەوتنەکە کاتژمێر یازدەو نیوی پێش نیوەرۆ دانرابوو. ئیتر بەناو چایخانەکانی حاجی ئۆمەران پیاسەم دەکرد تا لەناکاو ئۆتۆمبیلەکەی ئیدریسم بینی کە بەرەو بارەگای خۆی دەرۆیشت. سڵاوی کرد و بە توورەییەوە

سەری راوەشاند و پرسیاری ئەوەی لێدەکردم کە چۆن ئاوا لە بارەگاکەوە تا ناو شارەکە هاتوچۆمە و هیچ پاسەوانێکم لەگەڵدا نیە؟ بایەخم پێنەداو وەڵامم نەدایەوە.

کاتژمێر دوازدەو چارەکی نیوەڕۆ بوو، گەڕامەوە بۆ بارەگا بۆ ئەوەی پاسەوانەکان پرسیاری هۆکاری دیارنەمانم لێنەکەن. دوای گەڕانەوەم بە چارەکێک بەرپرسێکی بارەگای ئیدریس هات و پێی وتم: بە فەرمانی کاک ئیدریس لەمڕۆ بەدواوە بۆت نیە لە خێوەتەکەی خۆت بچیتە دەرەوە، پێویستیت بە هەر شتێک بوو خۆمان بۆت دابین دەکەین، هەروەها بۆت نییە بڕۆیت بۆ حاجی ئۆمەران، هەموو ئەو شتانەی وەک فەرمان پێگوتم.

دوای ئەوەی ئەو فەرمانانەم پێراگەیەنرا، بیرم کەوتەوە کە من مەوعیدم هەیە و دەبێت لە کاتی دیاریکراودا بڕۆم بۆ دیتنی ئەو کوڕەی کە بەڵێن بوو پێکەوە لە سەعات چوار بڕۆین بۆ ناو ئێران. بەڵام بە سەپاندن و توندکردنەوەی چاودێری نەخشەکەم تێکچوو، نەمتوانی جێبەجێی بکەم. لە دوای ئەو ڕۆژەوە نەمدەتوانی هیچ کەسێک ببینم، جگە لە پاسەوانەکانی ئەو بارەگایە نەبێت، کە لە دەشتێکی نزیک سنوری ئێرانەوە بوو. لەسەر شاخەکەوە چەکی قورسی پێشمەرگەکانم دەبینی. لەناو خێوەتەکەی خۆما لە خوار دەشتەکەوەو لە نزیک ڕووبارەکەوە دەستبەسەرکرابووم. لە نزیک منیشەوە ناندێنەکە هەبوو. دەیان پاسەوان لەو خێوەتەکەوە هەناسەکانی منیان دەژمراد، بە توندی

چاودێرییان دەکردم. بەهۆی توندبوونەوەی چاودێری تەواو بێزار بووم، بە شوێن فێڵێکدا دەگەڕام تا بتوانم لە ڕێگای هەندێ لە پاسەوانە باشەکانی بارەگای ئیدریس و مەسعود کە متمانەم پێیان هەبوو، پەیوەندییەک بە دەرەوە بکەم. نامەی نهێنیم بۆ بەیروت دەنارد، حزبەکەی خۆمم لە لوبنان ئاگادار دەکردەوە، کە ئیتر من بەندکراوم و لەژێر چاودێری و مانەوەی توندی زۆرەملێدام لە بارەگای ئیدریس لە حاجی ئۆمەران، دوای ئەوەی لە قەسری گوازرامەوە. داوام لە حزب کرد شاڵاوێکی ڕاگەیاندن بۆ ڕایگشتی جیهان دەستپێبکەن بۆ ڕسواکردنی ڕەفتارەکانی سەرانی بارزانی. هەموو نامەکانیشم دەگەیشتنە لوبنان.

بە درێژایی ماوەی دەستگیرکردنم، تەنها سێ نامەم لە ڕێگای ئێرانەوە بۆ هات، ئەویش بەهۆی دۆستێکی ئێرانیمەوە کە لە ناو شۆڕشدا بوو. من لەناو جەرگەی بارەگای ئیدریسەوە بەهۆی بارزانییەکانەوە نامەم دەنارد. ئیتر ئابلوقەیان لەسەر توند کردم و بە تەواوی جاڕسیان کردبووم و زۆریان بۆ هێنابووم. خواردنیان لێبڕیم و یارمەتی مانگانەیان بڕیم، ڕێگای چوونە دەرەوەیان لە ناو خێوەتەکەی خۆم لێگرتم، بۆ ئەوەی هیچ کەس نەبینم هیچ کەس نەمبینێ، بۆ ئەوەی سوکایەتیم پێبکەن و ئیرادەم بشکێنن و ورەم بشکێنن و ملکەچی خۆیانم کەن. وێڕای ئازاری دەرونی ئیرادەم بەهێزترو زیاتر دەبوو. جارێکیان محەمەد نابۆ هات بۆ سەردانم بەڵام پاسەوانەکە ڕێگای نەدا، هەرچەندە بۆ وەرگرتنی موچەکانی خۆی هاتبوو.

لە هەمان کاتدا ئیبراهیم مکاباری بە ڕێگەپێدانی مەسعود هات بۆلام، کاتێ دەستمان بە قسە کرد تێگەشتم کە هاتووە بۆ ئەوەی بمدوێنێت و هەندێ زانیاری و نهێنیم لێوەربگرێت، بەڵام پێچەوانەکەی ڕاست دەرچوو، ڕامکێشایە ناو قسە زانیاری زۆری بۆ درکاندم و ددانی بەوەدا نا کە ئەو جاسوسی دوو سەرە بووە لە نێوان هەواڵگری عێراق و دەسەڵاتدارانی شۆڕش، پەیوەندیکردنی بە شۆڕشەوە لە چوارچێوەی هەمان ئەرکی جاسوسیدا بووە. هەروەها ددانی بەوەدا نا کە لە بەغدا خەریکی کڕینی خەڵک بووە. پارەی زۆری سەرف دەکرد و هەزاران دیناری لە بەغدا سەرف کردووە بۆ ئەوەی شانەی جاسوسی دروست بکات لە ناو دامودەزگاکانی حکومەتی عێراقدا[29]، هەروەها گوتی مستەفا بەگ جاسوسێکەو کار بۆ ئیسرائیل دەکات، هەروەها پێی گوتم ئەو لە لایەن عێراقەوە ڕاسپێردراوە کە بارەگای بارزانی بسوتێنێت. بە کورتی ئەو دوو سەرە بۆ هەردولا کاری کردووەو پارەی لە هەردوولا سەندووە. هەروەها پێمگوت ئایا نازانیت هاتنت بۆ خێوەتەکەی من قەدەغەیە بە گوێرەی فەرمانی سەرەرەوە، گوتی ڕێگەپێدانم هەیە لەلایەن

---

[29] هەموو ئەم کردەوانەی سەرانی پارتی ئەو کاتە لەبەرامبەر پارەیەکی یەکجار زۆردا بۆ دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل و ساواک ئەنجام دراون و هیچ شتێک لەو کارانە لە پێناوی کوردا نەکراون. باشترین نمونەی ئەوەش گواستنەوەی خێزانی فڕۆکەوان منیر جمیل ڕۆفا بوو، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٦ فڕۆکەیەکی میگی ٢١ی ڕفاند بۆ ئیسرائیل – وەرگێڕی کوردی –

مەسعودەوە خەمت نەبێت. هەمیشە سەردانی دەکردەم و داوای جگەرەی لێدەکردم، منیش دەمدایێ، بەرامبەر بەوەی بکەوێتە قسەو هەندێ زانیاری لێوەربگرم، کە هەر خۆی خۆپسکانە دەستی بە قسان دەکرد. لە کاتی قسەکانیدا هەندێ شتی زۆر ترسناک و زانیاری زۆر مەترسیداری بۆ ئاشکرا کردم.

وردە وردە ورەم دادەبەزی، زیاتر دەکەوتم بە کینەدا، ئابلوقە و چاودێری تا دەهات توند تر دەکرایەوە لەسەرم، باری دەرونیم تەواو تێکچووبوو. رۆژی ١١ی حوزەیرانی ١٩٧٢ ئەو رۆژە بوو کە ئیتر گەیشتمە ئەو باوەڕەی مردن بەهاترە لەو ژیانەی کە منی تێدام لەو خێوەتەدا. بڕیارمدا مان لە نان خواردن بگرم هەتا مردن، لە دڵی خۆمدا گوتم چی دەبێت با ببێت. ئەو هەنگاوەم لەبەر ناڕەزامەندیم بوو بەرامبەر بەو مامەڵە خراپەی لەگەڵمدا دەکرێت بە شێوازێکی زۆر زاڵمانە.

نامەیەکم بۆ ئیدریس و مەسعود نوسی، باری ژیانی خۆمم لەهەموو لایەنێکەوە روون کردەوە، ناڕەزایی خۆمم بەرامبەر بەو مامەڵە نامرۆڤانەیە دەربڕی کە لەگەڵ کەرامەتی مرۆڤدا ناگونجێت. ناڕەزایی خۆم بەرامبەر بە دەستگیرکردنم دەربڕی و داوام لێکردن ئەگەر تاوانبارم ئەوە لە دادگایەکی ئاشکرا و عادیلانەدا لەبەردەم رایگشتی گەلەکەمدا تۆمەتبارم کەن. شەش رۆژ و شەو لە ناو خێوەتەکەی خۆم لە بارەگای بارزانی مانگرتنی تەواوم لەخۆراک ئەنجامدا، لاوازێکی بەهێز بووم، وەکو

لاشـەیەکی بێگیـان بە ئاسـتەم هەناسـەم دەدا، هەسـتم بەوە دەکرد کە بەهێواشی ئەتوێمەوە.

لە ڕۆژی حەوتەمدا، ژاوەژاوێک لەنـاو پاسـەوانەکاندا دروست بـوو، بە ئیدریسـیان ڕاگەیانـد، جەمیـل مەحـۆ شـەڕ لەگەڵ مـردن دەکـات و بەهێواشـی خەریکە دەمرێـت. نوسـەرەکەی ئیـدریس بە نـاوی مەجید گوتی: وازی لێبێنن بـا بمرێـت و لە کۆڵمـان بێتەوە، بەڵام ئیـدریس نێردراوێکـی لە بارەگـای خـۆیەوە بەنـاوی حسـێن عەقراوی نـارد و پێیڕاگەیاندم کە لەسـەر داوای ئیدریس بـارزانی هاتووە بۆ ئەوەی دانوستانم لەگەڵدا بکـات، زیـاتر پێیڕاگەیانـدم کە دەبێت واز لە مـانگرتن بێنم، هەروەهـا ویستی بیست دینـارم بـداتێ بـۆ ئەوەی کاروبـارم ڕایـی بـکەم، بەڵام ڕەتمکـردەوەو پێمگـوت پێویسـتیم بە پـارە نـیە، تەنهـا داوام ئەوەیە کە دەمەوێـت لەگەڵ ئیـدریس دانیشـم و کێشـەکەم چارەسـەر بکـات. ئیتـر ڕۆیشـت و داخــوازییەکەمی دابــوو بە ئیــدریس، گەڕایەوەو قایــل بــوونی ئیدریســی بەو داوایە پێڕاگەیانــدم دوای ئەوەی کە تەندروســتیم باشــتر دەبێـت و کەمێـک هێـز وەبەر خۆمـدا دەهێـنمەوە. ئیتــر مـانگرتنەکەم ڕاگـرت و ئیـدریس فەرمـانی کردبـوو کە هەتـا چەنـد ڕۆژێـک تەنهـا شـۆربام بـدەنێ. دوای ئەوەی کە هێـزم بەبەردا هاتەوە، لەبەردەم خێوەتەکەم دانیشتبووم بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت لە کاتی کۆبوونەوەم لەگەڵ ئیدریس باسی بکەم.

لەو کاتانەدا ئیدریس لەبەردەمدا قوت بۆوە و فرانسوا هەریری لە پشتیەوە بوو. ئیدریس دەستی بە قسان کرد: لەم دوو رۆژەدا لەگەڵت دادەنیشم، بەڵام وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی درۆی کرد، یەک هەفتەی تەواو تێپەڕی بەبێ ئەوەی داوام بکات، بۆیە ناچار نامەیەکم بۆ نوسی و داوام لێکرد بەڵێنەکەی خۆی بەرێتە سەر.

دوای سێ رۆژ داوای کردم. ٢٤ی تەموزی ١٩٧٢ بوو. لەگەڵ ئیدریس لە یەکێک لە خێوەتەکانی نزیک بارەگاکەی کۆبووینەوە. کە چووینە ناو خێوەتەکە، هاواری کرد بە سەرما و گوتی: جەمیل مەحو داوای چی دەکەیت؟ پێمگوت من بەند کراوی لای ئێوەم نازانیت داوای چی دەکەم؟ داوا کارم کێشەکەم چارەسەر بکرێت و ئازادم کەن، ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی خۆم. بەڵام کاک ئیدریس رێگام پێبدە بیخەمەوە بیرت، ئەو جەمیل مەحۆیەتان لە بیر چۆوە کە بەهەموو شەرەف و دڵسۆزییەک بەبێ هیچ مەرج و بەرامبەرێک چەندین ساڵ خۆی توانەوە بۆتان؟ دەستم کرد بە یادهێنانەوەی رابووردوو، بەڵام قسەکانی پێبڕیم و گوتی: ئەمەوێت داوای ژن و منداڵەکەت بکەیت بێن بۆ ئێرە، من ئامادەم نرخی تکتی فڕۆکەیان بۆ دابین بکەم، لێرە پارچەیەک زەویت دەدەمێ، خانوت دەدەمێ بەرامبەر بەوەی کە لێرە لە کوردستان بمێنیتەوەو نەڕۆیت، هەروەها گوتی ئەتکەم بە فەرماندەی هێزێکی پێشمەرگە. کە گوێم لەو قسانە بوو، چاوەکانم

پڕبـووون لە ئـاو پیمگـوت: ئەگەر هەمـوو نـاوپردان و بارەگـای مەکتەبی سیاسی و حاجی ئۆمەران و بارەگای بارزانیم بدەیتێ، دەسـت لە بسـتێک خـاکی لوبنـان هەڵنـاگرم، ئەو نیشـتیمانەی کە تیایدا لە دایک بووم و لەگەڵ ژن و منداڵەکانم تیایدا ژیام. ئینجا زیـاتر پێمگـوت: بـۆچی لەبەردەم رایگشـتی کـوردا هۆکـاری دەستگیرکردنی جەمیل مەحۆ ئاشکرا ناکەن؟ ئەو تۆمەتانە چین کە رووبەڕووی دەکەنەوە؟ بۆچی دادگایی ناکەن ئەگەر تۆمەتێک هەیە لە دژی و بەڵگەتـان لەسـەری هەیە. مـن ئامـادەم لەبەردەم دادگای شۆڕشدا بوەستم بۆ دادگایی.

وەڵامی دامەوەو گوتی: تۆ پیاوێکی مەترسیداریت، لەدەسەڵاتی عێراقی زیاترت لێدەترسین، زۆر بە توندی هێرشـی کردە سـەر عوبێدوڵا، گوتی کە ئەو ناوبانگی بنەماڵەی بارزانی زڕاندووە بەو خیانەتە، هەروەها پێی گوتم جەمیل مەحۆ تـۆ بوویتە قوربانی ململانـێ ناوخۆکانمـان. پێمگـوت: ئەی باشـە کە دەزانیـت مـن بوومەتە قوربـانی کەواتە گونـاهم چییە؟ گـوتی: ئەترسـین ئەگەر ئێمە ئازادت بکەین ئەوە تۆ ببیتە هاوپەیمانی عوبێدوڵای برامان و لە دژی ئێمە پێکەوە کار بکەن.

کاتێ کە سـەرقاڵی قسـە کردن بووین، فرانسوا هەریری هـاتە ژوورەوە و رۆژنـامەی دەنگـی کوردی بەدەسـتەوە بـوو، گـوتی: بەیـانەکەی جەمیل مەحۆی بڵاوکردۆتەوە بەڵام ئەمجـارە بە دوو لاپەڕە. ئیدریس تەماشای کردم و گوتی: لەگەڵ باوکم قسە دەکەم

سەبارەتت. ئیتر منیش لەگەل پاسەوانەکان گەڕامەوە بۆ خێوەتەکەی خۆم شوێنی دەستبەسەربوونم.

لە هەمان ڕۆژدا ئیدریس لە ڕێگای ئێرانەوە کتوپڕ سەفەری کرد بۆ دەرەوەی وڵات، فەرمانی بۆ مەسعودی برای دەرکرد کە پیلانێکی نوێ ئامادە بکەن لەدژم، بۆ ئەوەی لە بارەگاکانی خۆیانەوە بمگوێزنەوە بۆ ناو یەکێک لە زیندانەکان.

لە ٢٧ی تەموزی ١٩٧٢ کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ بوو، بە تەمابووم هەندێ گۆڤار و ڕۆژنامە بخوێنمەوە. لە هەمان ئەو ساتەدا ئەوە بە خەیاڵمدا هات کە هەرچی نوسین و نامەو راپۆرتێکم هەیە هەمووی بسوتێنم بە تایبەت دەفتەری بچوکی بیرەوەرییەکانم، کە ڕۆژانەی ژیانی خۆمم تێدا تۆمار کردبوو. هەموویم لە ناو کیسەیەکدا کۆکردەوە و پێچام بە خاولییەکەوە وخستمە ژێر هەنگڵمەوە و بە پاسەوانەکەم گوت، دەچم بۆ کەناری ئاوەکە خۆم دەشۆم. گەیشتمە ناو دارەکان و راستەوخۆ دەستم بە سوتانیان کرد و هەموویم فڕە دایە ناو روبارەکە و یەکسەر بەبێ ئەوەی خۆم بشۆم گەڕامەوە، لەبەردەم خێوەتەکەمدا لەسەر کورسییەک دانیشتم و دەستم بە بیرکردنەوە کرد. جگەرە لە دوای جگەرە دەمکێشا. هەستم دەکرد باری دەرونیم کەمێک ئاڵۆزە.

## بەندیخانەیەکی ترسناک لە زیندانی خەلان

کاتژمێر شەشی ئێوارە، پاسەوانەکانی ئیدریس و مەسعود بە ئۆتۆمبیلێکی سەربازییەوە پەیدابوون. دانەیەکیان بە زمانی فەرمانکردن پێی گوتم: کاک جەمیل کەلوپەل و جانتاکانت لە کوێن؟ پێمگوت بۆچی و بوکوێ؟ یەکێکیان لەوەڵامدا گوتی: لەگەڵ کەلوپەلەکانتا لەگەڵماندا وەرە. لەدڵی خۆمدا گوتم: دەبێ بەم شەوە بەتەمای چی بن، ترس دایگرتم، دەمگوت دیارە ئیتر ئەجەلم نزیک بۆتەوە، لە تاریکی ئەم شەوە ئەنگوستەچاوەدا دەمکوژن.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت: خودای گەورە تۆ خۆت توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، چۆن ئەوەت خستە دڵمەوە کە نامەکانم و بەڵگەکان و یاداشتەکانی رۆژانەم بسوتێنم. ویستم بگەڕێمەوە بۆ دواوەو قایل نەبم بەو شەوە لەگەڵیاندا بڕۆم، بەڵام ئۆتۆمبیلەکە گەڕایەوە بۆ دواوەو یەکێک لە پاسەوانەکان دەستی گرتم و بەپاڵ خستمیە ناو ئۆتۆمبیلەکە. لێرەدا نکوڵی لەوە ناکەم کە توشی داڕمانی مێشک بووم و لە دڵی خۆمدا گوتم؛ ئەمشەو مەحاڵە ئەمکوژن.

بە گەیشتنی ئۆتۆمبیلەکە بۆ سەر شەقامەکە، ئۆتۆمبیلەکەی عەبدول موهەیمەنم بینی وەستا بوو چاوەڕوانی دەکردین، ئاماژەی بۆ ئۆتۆمبیلەکە کرد کە بەدوایدا بڕۆین، گەیشتینە زیندانی خەلان، کاتژمێر حەوت و نیوی ئێوارە بوو. لە

ئۆتـۆمبیلەکە دابەزیـن. عەبـدول مـوهەیمەن لەگەڵ پاسـەوانەکاندا دەسـتیان بە پشـکنینم کـرد. هەرچـی شـتێکم پێبـوو بردیـان: پاسـپۆرتەکەم، ناسـنامەکەم، لەگەڵ نـامەیەکی دوورو درێـژ کە بەتەمابووم بۆ مەکتەبی سیاسی بنێرم، بەڵام پیلانگێرییەکە پێش من کەوت و نامەکە لای خۆم مایەوە. دوای ئەوەی زۆر بە وردی پشـکێنرام بردیـانم بـۆ ژوورێکـی بچـووک، درێـژییەکەی چەنـد مەترێک و شتێک دەبوو، لە هەر چوار لاوە نیوە داخراو بوو، پڕ بوو لە پیسی و خاشاک و مشک و مێرو.

کە گەیشـتمە دەرگـای ژوورەکە، بەڕێـوبەری زینـدان هـاواری کـرد بـڕۆ، زنجیـری ئاسـنیان هێنـا و قاچەکانیـان بەسـتمەوە، دەرگایان لەسـەر داخستم و بەتەنها لەو زیندانە چەپەڵە بەجێیان هـێلام کە لە قەبـر دەچـوو، هەمـوو ئەو شـەوەم بەوجـۆرە بەسـەربرد، بە پێـوە وەسـتابووم، قـاچم بە زنجیـری ئاسـن بەسـترابوو، نەمـدەتوانی دانیشـم لەبەر پیسـیی و زۆریـی جرووجانەوەر.

شەوێکی زۆر ترسناک و درێژ بوو، هەر بەپێوە مامەوە، نازانم چۆن رۆژ بۆوە، دەستم بە هاوار کرد و پاسەوانەکانم بانگ کرد، داوام کـرد پـێخەف و بەتـانی و چـرایەکم بـۆ بێـنن. لەو ژوورە تـاریکەدا مـامەوە، بـانگم دەکـرد و هـاوارم ئەکـرد، پاسـەوانەکان گوێیان لێم بوو، قاقای پێکەنینیان لێدەدا بەبێ ئەوەی بە هانـامەوە بێن.

سێ مانگی ڕەبەقم بە ڕۆژ و شەوەکانییەوە بەسەر برد و هەردوو قاچم بە زنجیری ئاسن بەسترابوونەوە. لەسەر زەوی دەخەوتم بەبێ بەتانی و پێخەف، لە نێو حەشەرات و مێرو. سەرماو کرێوە برستیان لەبەر بڕیبووم، ریشم درێژ هاتبووە خوار، پیسی لەسەر جەستەم چین بە چین کۆببۆوە، لە حاڵەتێکدا بووم زۆر خراپ، لە ئاژەڵێک یاخود مرۆڤێک دەچووم کە تازە لە ئەشکەوتەوە هاتبێتە دەرەوە.

پاسەوانەکان و هەموو کەسێک چاودێر بوون بە سەرمەوە، گوێم لەدەنگیان دەبوو. یەکێکیان بە هاوڕێکەی دەگوت: ئەرێ ئەم عەرەبە بۆ هێشتا زیندووە نامرێت؟ ئەویش وەڵامی دەدایەوە و دەیگوت: ئەمە عەرەب نیە کوردە، نازانیت لەکوێوە ئەمەیان هێناوە؟ بە نەخێر وەڵامی دەدایەوە.

بەیانیان یەک نانیان بە خێر پێدەدام، ئێوارانیش یەک کوپ چا. کاتێک داوام لە پاسەوانەکان دەکرد شتێکم بۆ بکڕن پێیان دەگوتم: فەرمانمان پێنەکراوە بتوانین هیچت بۆ بکڕین؛ خۆت بدە دەست خودا.

هەر کاتێ داوای چوونە تەوالێتم بکردایە بە پاڵ ئەیانبردم، زنجیرە ئاسنەکان لە قاچمدا بوون و پێیان دەگوتم: دەی بڕۆ بڕۆ. وردە وردە نەخۆشی بەناو لەشما بڵاو بۆوە. کاتێ پاسەوانەکان زانیان من کوردم و سکرتێری حزبم، پرسیاری هۆکاری هاتنمیان بۆ ئێرە دەکرد، منیش لەوەڵامدا دەمگوت: منیش خۆم نازانم بۆ

گیراوم، له بارەگای بارزانی بپرسن. بەڕێوبەری زیندان پێی گوتم: ڕۆژێک پێش ئەوەی تۆ بێیتە ئێرە، گەورەم مەسعود تەلەفۆنی بۆ کردم و فەرمانی کرد ئەو ژوورە بەتایبەت بۆ تۆ چۆڵ کەم. پێش تۆ کەسێکی تێدا بوو بەناوی سمکۆ حاجی خورشید، گواستمانەوە بۆ ژووری بەندییەکان، لەبەر ئەوەی لایەنگری فاخر محەمەد مێرگەسۆری بوو.

پارەکانم تەواو دەبوون، تەنها بیست و پێنج دینارم پێ بوو، داوام له بەڕێوبەری زیندان کرد کە پێویستیم بە پارەیە بۆ ئەوەی کەمێک پێداویستی خۆم دابینکەم، زۆری پێنەچوو، تەلەفۆنێک لە فرانسوا هەریری لە بارەگای بارزانییەوە هات و بڕیار درابوو مانگی ١٥ دینارم بۆ سەرف کەن.

پارەم دەدا بە پاسەوانەکان بۆ ئەوەی سۆز و هاوڕێیەتییان ڕاکێشم. ئەگەر نەمزانییا کە ئەو پاسەوانانە کوردن ئەوە لەو باوەڕەدام ئەوانە بە دڕندەی مرۆیی و خەڵکی ئەشکەوتم دەزانین، لەبەر ئەوەی سروشتیان زۆر دڕندانەبوو، لاشەیان زۆر گەورە بوو، هیچ سۆز و بەزەییان لە دڵدا نەبوو. ڕۆژان تێپەڕ دەبوون و من بەردەوام خەریکی ڕاکێشانی سۆزی پاسەوانەکان بووم، پارەم دەدانێ، ئیتر هاوڕێیەتی لە نێوانماندا پەیدا بوو. هەندێکیان شتی وایان بۆ باس دەکردم کە پێشتر نەمدەزانی. بۆ نموونە لە زمانی یەکێکیانەوە دەگێڕمەوە کە دەیگوت: بەر لەوەی من بێنن بۆ ئێرە، فاخر مێرگەسۆری لەهەمان زینداندا بووە لە ژووری

ژمـاره چـوار. بـارزانی دەوری زینـدانەکەی بە تۆپهـاویژ و گـولە پرژێن و سـەدان پێشـمەرگەی بەهێزی لایەنگری خۆی تەنیبوو. سـەربازگایەکی جەنگیـی لە گونـدی خەلان جێگیـر کردبـوو، لە ترسـی ئەوەی نەبـادا لایەنگرانـی فـاخر بـێن و هەڵبکـوتنە سـەر زیندانەکە و ئازادی کەن، لەبەر ئەوەی فاخر کەسێکی مەترسیدار و بەهێز بوو، لە ریزەکانی پێشمەرگەدا لایەنگری زۆر بـوون. بەر لە هـاتنی مـن بە رۆژێـک ئەویـان بەرەو شـوێنێکی نەزانـراو گواستۆتەوە کە هیچ کەس نازانێ لە کوێیە، بەڵام هەندێ کەس دەڵـێن بـراوەتە زینـدانی رایـات، هەنـدێ کەسـی تـریش دەڵـێن گوازراوەتەوە بۆ نـاو ئێران، لەوێ زینـدانێکی ترسـناک و تـایبەت هەیە بـۆ دوژمنەکـانی بـارزانی. بەڵام راسـتییەکە هـیچ کەس نەیدەزانی چییە.

هەروەهـا زانـیم کە جەوهەری بـرای فـاخر لەگەڵ هەنـدێ لە شـوێنکەوتووە تێکۆشـەرەکانیدا لە ژووری ژمـارە چـواری بەنـدینخانەکەدان، شـتگەلێکی زۆرم دەبیسـت لە پێشـمەرگەکانەوە. نەوەد رۆژم لەناو زیندانەکەدا بە کۆت و بەنـدکراوی بـردە سـەر، بەبـێ بەتـانی و پـێخەف و بەبـێ رونـاکی. دەرونـم زوخـاوی دەنۆشت، نەمدەتوانی وەکو پێویست بخەوم لەبەر زۆری مشـک و مێروو. نامەیەکم بۆ ئیدریس نوسـی داوام لێکرد کە بمکوژێت بۆ ئەوەی لەم ئازارو ئەشـکەنجانە رزگـارم بێت، لە توانامـدا نەمـابوو بەرگە بگرم. بارودۆخی خۆمم بۆ بـاس کرد، ئایـا مـن پیـاوکوژم،

دزم، خوێن ڕێژم؟ من چیم کردووە تا بەو جۆرە سزام بدەن و ئەو ڕەفتارانەم لەگەڵدا بکەن کە ناگونجێت لەگەڵ کەرامەتی مرۆڤدا و هیچ شەرع و یاسایەکی دنیا پەسەندی ناکات.

دوای هەفتەیەک پێخەفیک و دوو بەتانییان بۆ هێنام، بۆ یەکەم شەو لەناو جێگادا خەوتم. هەستم کرد چوومەتە جیهانێکی ترەوە، بۆ دنیایەکی جیاواز لەوەی کە تیایدام. لەسەر زەوی بەرزبوومەوە و لە دەستی مشک و مۆرانە رزگارم بوو، لەبەر ئەوەی وەکو باسم کرد بە درێژایی ڕۆژ و بەشیک لە شەوەکە هەر بە پێوە دەوەستام. کە ماندوو بوون تاوی بۆم دەهێناو هێزم لەبەردا دەبڕا لە ناوەڕاستی ژوورە پیسەکەدا بە مەجبووری دادەنیشتم، مشک و قالونچەو مێرو بە ئازای گیانما هەڵدەگەڕان و جەستەم و دەموچاویان دەگەزیم. کە خەوم پێدا دەکەوت، لە ناکاو وەکو شێت ڕاتەچڵەکیم و مشک و قالونچە لەناو جلەکانمەوە دەردەپەڕین و خوێن لە قاچ و دەموچاوم و پەنجەکانی دەستم دەچۆڕان، ئیتر شێت و شور دەبووم و هاوارم ئەکرد.. بۆ خاتری خوا خەڵکینە لە کوێن، ویژدانتان بێت، ئایا جەمیلتان کردووە بە خۆراکی مشک و قالونچەو مێرۆ؟ لاشەم ئیتر لاواز دەبوو، داوام کرد دکتۆرم بۆ بێنن، وەڵامەکەیان ئەوە بوو کە دکتۆریان نیە.

ڕۆژێکیان لە ژوورەکەمدا بووم، سەرم داژەنیبوو، غەمبار بووم، نەمدەزانی بیر لە چی دەکەمەوە، کتوپڕ دەرگای ژوورەکەم

کرایەوە بەڕێوبەری زیندان کە ناوی خالد ئاشگە بوو، فەرمانی کرد کە دەموچاوم بشۆم و جلوبەرگی نوێ لەبەرکەم. داوای لە پاسەوانەکان کرد کلیلەکانی بۆ بێنن بۆ ئەوەی زنجیرەکانی قاچم بکەنەوە. باوەڕم نەدەکرد چۆن ئەمە دەکەن. بە خێرایی بەقسەم کرد و ڕۆیشتمە دەرەوەی زیندان بینیم محەمەد عەزیز سەرۆکی بەشی هەواڵگری چاوەڕێی دەکردم. لەگەڵیدا سواری ئۆتۆمبیلێکی جیپ بووم، دوو ئۆتۆمبیلی پڕ لە پاسەوان بەدوامانەوە بوون.

گەیشتینە گوندێکی نزیک لە خەلان ناوی زینۆ بوو، سەیرم کرد دووان لە هاوڕێ کۆنەکانم لەسەر جادەکە چاوەڕێ دەکەن و سەبری بۆتانیشیان لەگەڵدایە. لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزیم سڵاوم لێکردن، چوینە ناو ماڵێکەوە، چواردەورمان بە پاسەوان گیرابوو، یەکێک لە پاسەوانەکان بە کلاشنکۆفێکەوە لەناو دەرگاکەدا دانیشت. لە ژوورەوە من و محەمەد عەزیز و سەبری بۆتانی و دوو هاوڕێی دێرینی خۆم کە لە لوبنانەوە بە ڕێگای سوریا هاتبوون بە کارێکی تایبەت بە من، دانیشتین.

دانیشتین و دەستمان کرد بە قسە، محەمەد عەزیز گوتی: ئیدریس پێی گوتووم کە تۆ دەبێت نامەیەکی ڕێگەپێدان بنوسیت بۆ داودی برات، سەرپشکی بکەیت بۆ ئەوەی بەرپرسیاریەتی حزبەکە لە ئەستۆ بگرێت و کوڕەکانت وهەموو ئەو کەسانە دەربکات کە هێرش دەکەنە سەر بارزانی، بەرامبەر بەوەی کە ئازاد بکرێیت.

پێمگـوت: پتـر لە نـامەیەکی ڕێگەپێـدان و پتـر لە نـامەیەکی سەرپشـککردنم نوسی، هیچیان سودیان نەبوو، سەرەنجام ئێوە منتان فڕە دایە ناو زیندانەکانتان و بەئاسن کۆت و بەندتان کردم. بـۆیە مـن لەمـڕۆ بەدواوە ئامـادە نـیم هـیچ ڕێگەپێـدان و هـیچ سەرپشـککردنێک بنوسـم و دەسـتبەرداری هـیچ شـتێک نـابم. زۆر باشترو شەریفانەترە لەناو زیندانە ترسناکەکانی ئێوەدا ئەشکەنجە بدرێم، پێمباشە بمکوژن و ڕزگارم کەن لەو هەموو عەزابە.

نزیکەی سـەعات و نیوێک گفتوگۆمـان کرد، بەبێ ئەوەی قایل بم بە داواکەی ئیدریس. یەکێک لە هاوڕێکانم گوتی: ئێمە یـازدە ڕۆژە لە حاجی ئۆمەرانین و ئیدریس ئامادە نەبوو چاوی پێمـان بکەوێـت، تـا خـودا سەریخسـتین و ئەمـڕۆ توانیمـان لەگەڵیـدا کۆببینەوە. ئێمە بۆ بەرژەوەندی تۆ هاتووین بۆ ئێرە، ئەم جارەش قایـل بە بەنوسـینی ڕێگەپێـدانەکە، کوڕەکانـت و هەنـدێ لە هاوڕێکانت لە حزب دەربکە بۆ ئەوەی ئازادت بکەن، دەنـا هەر بە زیندانکراوی دەمێنیتەوە لە لایان، ئەمە قسـەی ئیدریسـە بە ئێمەی گوت. پێمگـوت لەمڕۆ بەدواوە هـیچ داوایەکـی ئیـدریس جێبەجـێ نـاکەم، چـونکە زیـاتر لە جارێـک بەڵێنـی دا ئـازادم کـات بەڵام بەڵێنەکەی خۆی نەبردە سەر. سەبری بۆتانی بە محەمەد عەزیزی گوت: با بڕۆین چونکە ناگەینە هیچ ئەنجامێک. یەکسـەر چوومەوە بۆ ناو ئۆتۆمبیلەکە، یەکێک لە هاوڕێکانم حاجی ساڵەح لەبەردەمی محەمەد عەزیز دەستی گرتم و گوتی: تکات لێدەکەین وا مەکە بە

دەستی بەتاڵ بڕۆینەوە بۆ لوبنان، ئەبێ ڕێگەپێدانەکە بنوسیت. بە درێژی سەیری ڕوخساریم کرد، بەزەییم بە باروودۆخیدا هاتەوە، ئەو زۆر پیر بوو، پێمگوت داواکەتان پەسەند دەکەم، بەڵام پێتان دەڵێم ئێوە خەڵەتێنراون، ئەوانە هیچ بەڵێنێکی خۆیان نابەنە سەر. داواکەیم پەسەند کرد، ئاوڕم بۆ محەمەد عەزیز دایەوە، پێمگوت ئەو زنجیرانە چییە لە قاچما؟ ئەوە شەرمەزارییە بۆ ئێوە. گوتی هیچ زانیاریم نیە لەو بارەوە. کە گەیشتینەوە دەرگای زیندانەکە، محەمەد عەزیز بەڕێوبەری زیندانەکەی بانگ کرد و پێی گوت: کێ بە ئێوەی گوتووە زنجیر بکەنە قاچی؟ بەڕێوبەری زیندان بە سەرسوڕماوی وەستا و چرپاندی بە گوێیداو وتی: ئێوە خۆتان تۆ و مەسعود ئەوەتان لێداوا کردم، ئیتر ئەو سوک و سەلیمە هیچی نەگوت.

زنجیرەکانیان لە قاچم کردەوە، ئیتر لەناو زیندانەکەمدا ئازاد بووم، هەستم بە کەمێک ئاسودەیی کرد و دەستم کرد بە نوسینی نامەکە بۆ حزب لە لوبنان لەسەر داوای محەمەد عەزیزو دامە دەستی. دوای ئەوە دەستبەجێ بە ڕێگای نهێنی خۆم لە ئێرانەوە کۆمەڵێک نامەم نارد بۆ بەیروت، بەهۆی هەندێ لە پاسەوانەکانی ناو زیندان. لە نامەکاندا درێژەی ئەوەم بۆ باسکردن کە لەنێوان من و هاوڕێکانمدا ڕویانداوە و لە ژێر هەڕەشەو بەزۆردا لەسەر داوای ئیدریس ئەو ڕێگەپێدانەم ئیمزا کردووە و تەنها وەکو مەرەکەبی سەر کاغەز کاری لەگەڵدا بکەن، بۆیە پێویستە

لەسەرتان شالاوێکی توندی راگەیاندن لە رێگای دەرکردنی بەیانی زۆر توندەوە ئەو سەرکردایەتییە خائینە رسوا بکەن.

ئەو نامانەی لە زیندانەوە بەدزییەوە دەمناردنە دەرەوە لە رێگای تاران و بەغدادەوە، بەهۆی پاسەوانە هاوکارەکانمەوە، بەردەوام دەگەیشتنە شوێنی خۆیان. من هەر لە زیندانەوە شالاوی راگەیاندنی توندم ئاراستە دەکردن بەبێ ئەوەی کەسێک بەوە بزانێت. ململانێ لە نێوان من و ئەواندا لەوپەڕیدا بوو. نامەو راپۆرت بە زۆری زۆرداری بەمن دەنوسراو رەوانەی بەکرێگراوەکانی خۆیان دەکرد لە لوبنان، بۆ لەناو بردنی ئەو حزبەی کە لە پێناویدا هەموو قوربانییەکم دابوو، بۆیە بە بەردەوامی نامەم بۆ دەناردن داوام لە هاوڕێکانم دەکرد بەهیچ جۆرێک لەگەڵ ئەو تاقمە خائنە رێکەتن نەکەن هەتا بەبێ هیچ مەرجێک ئازادم دەکەن.

دوای ئەوەی شکستیان هێنا لە کارەکانیاندا، وێڕای سەرفکردنی پارەو دەم چەورکردنی خەڵک، دەستیان کرد بە ناردنی سەرکردەکانیان بۆ لوبنان، یەک لە دوای یەک. عەلی شەنگالی رۆیشت بۆ ئەوێ و ماوەیەکی درێژ مایەوە، بەبێ ئەوەی بگاتە هیچ ئەنجامێک، دوای ئەوە حەبیب محەمەد کەریمی سکرتێری حزبیان نارد، ئەو کاتە من لە قەسرێ بووم، نامەیەکی بە پەلەم بەدەست گەیشت لە لوبنانەوە داوایان کردبوو هەندێ لە لایەنگرەکانم هەستن بە رفاندنی حەبیب محەمەد کەریم ئەگەر

هات بۆ لوبنان، وەڵامەکەم نەخێر بوو، چونکە بەو کارە واتای ئەوەتان دەبەخشی کە ئێوەش گەشتوونەتە ئاستی چەتەکانی ئەوان، دیسپلینی حزب هەرگیز ڕێگای ئەوە نادات. ڕەزامەند نەبووم بە ڕفاندنی هەر بەکرێگیراوێک کە دەهاتە لوبنان بۆ ئەوەی پارە لە گازینۆکان و مەیخانەکان و رابواردن لە شوێنە تایبەتەکانی بەیروت سەرف بکات، لەسەر حسابی گەلی کوردی تێکۆشەرو چەوساوەمان لە هەموو پارچەکانی کوردستان. دواتر بەکرێگیراوێکی تریان چوو بۆ ئەوێ کە عەزیز ڕەزا بوو، پاسپۆرتی ئێرانی هەبوو، بڕێکی زۆری دۆلاری بردبوو لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەوەی دژی حزبەکەی من لە لوبنان سەرفی بکات.

ئەو کاتەی لە زیندان بووم، ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆرم چەشت، بە ئانقەست و بە شێوازی زۆر نا مرۆڤانە زۆریان بۆ دەهێنام. بۆ نمونە کاتێک دەچووم بۆ تەوالێت بەردیان دەکێشا بە دەرگاکەدا، هەندێ جار پاسەوانێک لە گەڵمدا دەهاتە ژوورەوە، منیش ڕێگەم نەدەداو لێی تووڕە دەبووم و لە دژی ئەو کارە نا مەردانەیە بەرهەڵستیم دەکرد، دوای ئەوە ملیانداو پاسەوانێکیان لە بەر دەرگا و پاسەوانێکیشیان لەبەر پەنجەرەکەدا دادەنا. ڕۆژێکیان دنیا زۆر سارد بوو، کلو کلو بەفر دەباری، زەوی هەمووی بەفر دایپۆشی و ڕۆیشتن بە سەریدا زۆر زەحمەت بوو، چونکە بەفر لەگەڵ سەرمای زۆردا دەبوو بە سەهۆڵێکی وەکو شوشە. دەڕۆیشتم بۆ تەوالێت و زنجیر لە قاچەکانمدا بوون،

هەڵخـزام و بە پشـتا کەوتـمە سـەر زەوی و بەفەر بە سـەرمدا دەباری. نزیکەی چارەکە سەعاتێک بەو جۆرە مامەوە، هیچ کەس بە هانامەوە نەهات، زۆر بە زەحمەت توانیم خۆم هەڵگەڕێنمەوەو راسـت بـبمەوە. بەهێواشـی دەچـووم بە ڕێگـادا بـۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ژووری بەندینخانەکە، ئەترسام دیسان بخزێمەوە. پاسەوانەکان کە منیان بەو جۆرە بینی لە دەرەوەی زیندان بەیەک ریز راوەستابوون و کەسێکیان بە دەنگی بەرز دەیگوت: وەحدە، حوڕیە، ئیشتراکییە، ئەمەی چەند جارێک دووبارە دەکردەوە بۆ ئەوەی گـاڵتە بەمـن بکـات لەبەر ئەوەی وایـدەزانی مـن بەعسـی بووم، پاسەوانەکانی تریش پێمپێدەکەنین.

هەندێ لە پاسـەوانەکان دەهـاتنە ژوورەکەم، لە ڕۆژێکدا چەند جارێـک ژوورەکەمیـان دەپشـکنی بـۆ کەلـوپەلی قەدەغەکـراو دەگەڕان وەکو پێنوس و مەرەکەب و کاغەز، من حسابی خۆم بۆ ئەو شتانە دەکـرد، لە شـوێنی ئەمینـدا دەمشـاردنەوە کە جێگـای سەرنج نەبوو. لە ناو پاسەوانەکاندا دانەیەکیانم دۆست بوو، زۆر دڵسۆزم بوو، نامەکـانم دەدایە دەستی ئەو، لە شـوێنێکی گونجاو دەیشـاردنەوە، ئینجـا هەر لەسـەر حسـابی خـۆم دەچـوو بۆ ئێران پۆستی دەکـردن و یەکسـەر دەگەڕایەوە بەبێ ئەوەی کەس بزانـێ و گومـانی لێبکـات. نامەکـانم بەردەوام دەگەیشـتنە لوبنـان. لەگەڵ هەنـدێ لە بەنـدییەکان لە بەشـەکانی تـر، پەیوەنـدی و نـامە گـۆڕینەوەم هەبـوو، بە ڕێگـای خـۆم و زۆر بە ئاگـایی نامەکـانم

دەناردن و قسەم لەگەڵدا دەکردن بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک لە پاسەوانەکان هەستی پێبکات، بەڵام یەکێک لە بەندییەکان وەکو پێویست بە ئاگایی کاری نەکردبوو، نامەکانی منی پێگیرابوو. رۆژێکیان بەڕێوبەری زیندان هات بۆلام و پێی وتم: جارێکی تر زۆر ئاگات لەخۆت بێت جەمیل ئەو کارانە دووبارە نەکەیتەوە تێکەشتیت؟ پێمگوت مەبەستت چییە تێناگەم؟ گوتی نامەکان، گوتم ئایا ئەوە قەدەغەیە؟ گوتی بەڵێ بۆ ئێوە هەموو شتێک قەدەغەیە بە فەرمانی بارەگای بارزانی.

لەو کاتە بەدواوە، زیاتر حەزەرم دەکرد و زۆر بە نهێنی و ئاگایی زیاترەوە نامەکانم دەناردن بۆ بەیروت، کە لە ڕێگای هەندێ لە سەردانکەرانی زیندان و پاسەوانەکان و هەندێ لەو دۆستە پێشمەرگانەی کە متمانەم پێیان بوو.

هەرچی نەهامەتی و ناسۆرییەکانی ناو زیندان هەبوو لە تیرۆرو ئەشکەنجە هەموویان پێچەشتم کەچی هێشتا دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە، بۆ ئەوەی ورەم بشکێنن و زەلیلم کەن زیاتر لە جاران زۆریان بۆ دەهینام، خستمیانە ژوورێکی تەسکەوە، رووناکی نە دەهاتە ناوی، دیوارەکانی شێداربوون، مێرو کولانەی تیداکردبوون. نامەی نا رەزایم بۆ ئیدریس بارزانی دەنارد و بارودۆخی خۆمم بۆ روون دەکردەوە، داوام دەکرد کە بمکوژن و نەجاتم بدەن بۆ ئەوەی رزگار بم لەو هەموو ناسۆرییە و داوای دیداری محەمەد عەزیزی سەرۆکی بەشی هەواڵگریی گشتیی

شۆڕشم کرد. دوای چەند رۆژێک محەمەد عەزیز هات بۆلام بزانێت چیم دەوێت. باسی نەهامەتی و نارەحەتییەکانی خۆمم بۆ کرد لەناو زیندان، وەڵامەکەی ئەوە بوو کە حزبەکەتان لە لوبنان زۆر بە توندی هێرش دەکاتە سەرمان. دوای گفتوگۆیەکی درێژ نەگەیشتینە هیچ دەرەنجامێک بۆ باشکردنی دۆخی زیندانم. داوام لێکرد رۆژانە یەک سەعات ماوەم هەبێت بچمە دەرەوەی ژوورەکەم لەناو گۆڕەپانەکەدا کەمێک هەتاوم بەرکەوێت، چونکە ناتوانم لەو کەشە شێدارەدا بژیم، بەڵکو ئەگەر بەو جۆرە بەردەوام بن لەگەڵم دەمرم، ئینجا قایل بوو بەوە و بەڕێوبەری زیندانی بانگ کرد و داوای لێکرد رۆژانە تەنها یەک سەعات رێگام بدرێت بچمە گۆڕەپانی دەرەوەی زیندانەکە.

کاتێ محەمەد عەزیز رۆیشت، ویستم وەک ئەوەی رێککەوتین، بچمە دەرەوە، بەڕێوبەری زیندان رێگای گرتم و بەهیچ شێوەیەک نەیهێشت بچمە دەرەوە. پێمگوت: لەبەردەمی خۆمدا فەرمانی پێدایت کە رێگام بدەیت، بۆچی ئێستا رێگام دەگریت؟ گوتی راستە ئەو لەبەردەمی تۆدا بە منی گوت، بەڵام کاتێک چوینە دەرەوە سەرنجی راکێشام و گوتی رێگەی چوونە دەرەوەی پێنەدەیت تەنانەت ئەگەر لە ژووری زیندانەکەدا گیان بدات. پێمگوت ئەگەر وایە من ناچمەوە ناو ژوورەکەم هەتا محەمەد عەزیز دووبارە نەیەتەوە. هەوڵیدا لەگەڵمدا کە پەشیمان ببمەوە چونکە ئەو پیاوە خوێنڕێژە، تەواوی دەسەڵاتێکی هەیە کە ئەگەر

پێویست بکات دەتوانێت ڕۆژانە زیندانییەکان بکوژێت و ناتوانم لەبەردەمیدا یەک وشەش بڵێم، ئینجا گوتی: باشتر وایە ڕقەبەرایەتی من نەکەیت ئەگینا... کاتێک گوێبیستی هەڕەشەی ئەم دڕندە گێلە بووم لە دڵی خۆمدا گوتم، ئەمە گاڵتە نازانێت، کوشتن بۆ ئەمە وەک ئاوخواردنەوەیە و هیچ کەسێک لێرە بەهای نیە.

ڕۆژێکیان یەکێک لە زیندانییەکان لەبەردەم بۆریی ئاوەکەدا بوو دەموچاوی دەشوشت، فەرمانێک هاتبوو بۆ کوشتنی بەڵام بە فێڵ. تۆمەتباریان کرد بەوەی کە هەوڵیداوە رابکات، بۆیە بەو جۆرە گولەباران کرا. کاتێک ئەوەم بە چاوی خۆم بینی، لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر ڕقەبەرایەتییان لەگەڵدا بکەم، ئەوە چارەنوسم وەکو چارەنوسی ئەو بەندکراوە دەبێت، بۆیە بە بێدەنگی مامەوە و بەرگەی ئازارو ئەشکەنجەم دەگرت و خۆم دابووە دەست خودا.

سێ ساڵم لەو ژوورە ترسناک و شێدارە لە زیندانی گەورەی کوردستان بەسەربرد، دوور لە کەس و کارو نیشتمان، دابڕاو لە خەڵک، مێشکم داڕماو، لە نێو خەڵکانێکی دڕندەدا ژیانم بەسەر دەبرد وەک ئەوەی لە چاخەکانی ناوەڕاستدا بم، هیچ سۆز و بەزەییەک لە دڵیاندا نەبوو. لەزیندان چەندین شتی ترسناک و نامۆم دەبینی. هەرچەندە من لە ژووری تاکەکەسیداو لە ژێر چاودێری توند و مانەوەی زۆرەملێدا بووم، لەناو ژوورێکی تەسکوتاری بچوک، بەڵام ئەو ژوورە پەنجەرەیەکی بچوکی

هەبــوو دەیڕوانــی بەســـەر ڕاڕەوی دەروازەی زینــدانەکەدا. لەو پەنــجەرە بچــوکەوە شــتی وەهــام دەبینــی ســەرتاپا ئــازای گیــان موچوڕکە دەیگرت.

بە شەو پاسەوانەکان بە تەواوی چەک و جبەخانەی خۆیانەوە دەهــاتن و دەرگــای ژووری زینــدانییەکانیان دەکــردەوە یــاخود بە تونــدی لە دەرگاکانیــان دەدا و هاواریــان دەکــرد، کــاتی خەوە بــخەون، بۆ خەوتــن ، بــخەون، لە کاتێکدا مــن لەنــاو ژوورەکەمــدا هەمــوو شــەوەکەم بە بێداری بەســەر دەبــرد، دوودڵــی و ڕاڕایــی دایگرتبــووم، نەمــدەتوانی چاوەکــانم لێکبنــێم، بەردەوام لە گێــژاوی بیرکــردنەوەدا بــووم، نەمــدەزانی چارەنوســم چــی دەبێــت. لەنــاو سەرمدا بیرۆکەی جیاواز و دژ بەیەک دروست دەبوو، سامناکی شــەوانی ئەنگوســتەچاوی ئەو بەشــەی نــاو شــاخەکانی کوردســتان ئەوەنــدە ترســناک بــوو، هەناســە ســواری دەکــردم.. لەو بــوونە ترسناکەدا گوێم لە دەنگی هەنگاوەکانی ئەو بەندکراوانە دەبوو کە زنجیری ئاسن کرابووە قاچیان، گوێم لە ناڵەیان دەبوو، هەندێ جــاریش گــوێم لە دەنگــی گــولە دەبــوو کە خامۆشــیی شــەوی دەڕەواندەوە، بۆ بەیانی لە هەندێ کەسەوە ژمارەی ئەو کەســانەم دەزانی کە ئەو شەوە گولەباران کراون. زۆربەی قوربانییەکانیش بێتاوان بوون.

زوڵم و چەوساندنەوەو ئەشکەنجە ڕەفتارێکی ئاسایی ڕۆژانە بوو لەناو زیندان، بە دەستی جەللاد و تاوانباری گەورە ســەرۆکی

زینـدان خالیـد ئەشـگەیی، بەیانیـان وەک دڕنـدەیەکی خوێنخـۆر، قامچییەکی دەگرت بەدەستییەوە لە وایەرو ریشاڵی مسـی سـور دروست کرابوو، لول و پێچراو بوو بە قایشێکی چەرمی لاستیکی رەشـەوە. لە ناوەڕاسـتی حەوشـەی زینـدانەکەدا دەوەسـتا و بە دەنگێکی بەرز بانگی پاسەوانەکانی دەکرد بۆ ئەوەی یەک بەدوای یەکدا، بەنـدکراوەکان بێنن. دەمبینـی کە چـۆن دەرگـای ژووری بەنـدییە داواکراوەکـان دەکـرانەوە و بە کەلەپـچەی ئاسـنەوە دەهێنرانە دەرەوە لە ترساندا هەڵدەلەرزین. بەبێ هیچ پرسـیار و وەڵامێـک ئەم دڕنـدە مـرۆییە بە قـامچییە ئاسـنینەکەی ئەکەوتە سەروگوێلاکی ئەو بێتاوانانە. گوێت لە هاوارو ناڵە دەبوو، دواتـر کـڕوزانەوەیەک بە دەنگێکـی نـزم، بەهـۆی تونـدیی ئەشـکەنجەوە خوێن لە سەرو پشتیان دەچۆڕا ئیتر لە هۆش خۆیان دەچوون و دەکەوتنە سـەر زەوی. دوای ئەوە بە قاچەکانی دانەیەکی هەڵدەدا لە کەسـی بـوراوە وەک ئامـاژەیەک بـۆ پاسـەوانەکان کە ئیتـر دووری خەنەوەو بیـبەنەوە بـۆ ژوورەکەی. زینـدانییەکانی تـر لە دەوری کۆدەبوونەوە، دەموچاویـان دەشوشـت، چەنـدەیان بتوانیبا تیماریان دەکرد، تا بەهۆشـدا دەهـاتەوە... هەمـوو بەندکراوەکانیان ئاوا لێدەکرد.

رۆژێکیان پاسەوانەکانم بینی کەسێکی نامۆیان پەلکێش دەکرد بۆ زیندان، دواتر زانیم کە ئەو کەسەیان لە رەواندز رفانـدووە. کە هێنایانە ناو ڕاڕەوەکەی زیندان ژوورێکی بچوک هەبوو لە نزیـک

ڕاڕەوەکە. پاسەوانەکە پێیگوت بڕۆ ژوورەوە، کابرا گوتی بۆ کوێ؟ بۆ ئێرە؟ بە دەستی ئاماژەی بۆ ئەو ژوورە بچوکە دەکرد و دەیگوت ئەوە ژوور نییە، بەڵکو قەبرێکی ڕاستەقینەیە. زیندانییەکە هەوڵیدا رابکات، بەڵام پاسەوانەکان گرتیان هەتا بەڕێوبەری زیندان خالید ئەشکەیی هات و قیژاندی بەسەریدا: سەگی کوڕی سەگ، بۆچی ناڕۆیتە ژوورەوەو گوێڕایەڵی فەرمانەکان نابیت؟ ئیتر بە قامچییە مسینەکەی دەستی تێیکەوت و دەستی بە لێدانی کرد هەتا کەوتە سەر زەوی و لە هۆش خۆی چوو، ئینجا پاسەوانەکان هەڵیانگرت و بە زنجیری ئاسن کۆتوبەندیان کرد.

ئەو زیندانییە ناوی فەوزی بوو، من و ئەو پێکەوە نۆرەی تەوالێتمان هەبوو. سەرنجم دەدا کاتێک دەرگاکەیان دەکردەوە، تەنەکەیەکی پڕ لە پیسی بەسەر شانییەوە بوو. شەوان ئەم داماوە کە لە ژوورەکەی دەهاتە دەرەوە پتر لە بیست پاسەوان بۆی دادەنیشتن و سەیریان دەکرد. یەکێک لە پاسەوانەکان دارێکی حەیزەرانی بەدەستەوە دەگرت و دەمێک دەیکێشا بەسەریدا و دەمێک دەیکێشا بە پشتیدا. زۆر جار لەتاو ئازار دەکەوتە سەر زەوی و تەنەکە پڕ لە پیسییەکە دەڕژا بە سەریدا و ئەویش لە تاودا هاواری دەکرد و دادو بێدادی بوو، بەڵام پاسەوانەکان لە جیاتی ئەوەی بەزەییان بەم داماوە بێتاوانەدا بێتەوە بەدەنگی بەرز پێدەکەنین و قاقایان لێدەدا، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەری

من خەو دەبینم یان بە ئاگام؟ تۆ بڵێی ئەوەی دەیبینم ڕاست بێت؟ ئەو دیمەنــانە ڕۆژانە دووبــارە دەبــوونەوە، دڵــم هەڵــدەقرچا لە ئازاری دیتنی ئەو دیمەنانە و هیچیشم دەسەڵات نەبوو!

ئەو دیــمەنە ســامناکانە ڕۆژانە دووبــارە دەبــوونەوە، ڕقێکــی ئەســتور و توڕەبــوونێکی سەرشــێتانە لە کەلەی دابــووم، ویســتم ڕووبەڕووی ئەم جەلادە گــێلە بــبمەوە و داوای لێــبکەم واز لەو کـارە قێزەونـانە بێنن، لە دڵـی خۆمـدا گـوتم چـی ئەبێـت بـا ببێـت. داوای دیداری بەڕێوبەری زیندانم کرد، کە هـات بـۆلام بە تونـدی قســـەم لەگەڵــدا کـــرد و پێمگـــوت: ئــێمە لە زینـــدانین یـــان لە قەسابخانەی مرۆیی؟ پێکەنینی بە قسەکانم دەهات. زیاتر پێمگوت: ئەگەر ویســتت لە یەکێـک لە بەنـدکراوەکان بـدەیت، واز لەو بێـنە وەرە لە جیاتی ئەو لەمن بدە. پێی وتم بۆچی ئەو قسانە دەکەیت؟ پێمگوت: ئەگەر واز لەو کارانە نەهێنیت سکالایەک بەرز دەکەمەوە بـۆ بـارزانی لە ســەرت، بـۆ ئەوەی بزانێت تـۆ لێرە چـۆن ڕەفتـار لەگەڵ زیندانییەکانــدا دەکەیــت. شـــەریفانەتر ئەوەیە کە ئــازاری کوردێـک بـدەیت لە جیـاتی بێگـانەیەک، چـونکە کاتێـک دەڕواتە دەرەوە ئاشـــکراو رســـواتان دەکـــات. قســـەکانم راشـــکاوانەو راســتگۆیانە بــوو، چەنــد ڕۆژێــک وازی لەو کـارانە هێنـا، بەلام سروشـــتی شـــەڕانگێزانەی خـــۆی زاڵ بـــوو بە ســـەریدا و زوو گەڕایەوە سـەر ڕەوشـتەکەی جـارانی و خراپـتریش بـوو، ئینجـا لە ئەشـــکەنجەداندا هـــونەری بەکـــار دەهێنـــا، دوای ئەوەی لە

بەندکراوێکی دەدا و ئەشکەنجەیەکی زۆری دەدا، ئینجا بە زنجیر هەڵی دەواسین بۆ ئەوەی زیاتر ئازار بچێژن.

لە دڵـی خۆمـدا گـوتم دەبێـت سـکاڵای لەسـەر بـکەم لای بەرپرسەکانی و داوای دیدارێکی محەمەد عەزیز بکەم و هەموو شتێکی بۆ باس بکەم. دوای تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێک بەسەر داواکەمدا، محەمەد عەزیز هات بۆ زیندان و لەناو نوسینگەی بەڕێوبەرە گێلەکەی زیندان لەگەڵیدا دانیشتم. یەکەمجار لەسەر چارەنوسی خۆم لێرەدا قسەم لەگەڵدا کرد و لێمپرسی تاکەی بەوجـۆرە دەمێـنمەوە، ئینجـا باسـی ئەو چەوسـاندنەوەو ئەشکەنجەیەم بۆ کرد کە زیندانییەکان لە ناو بەندینخانەکەو دەرەوەی بەندینخانەکە دووچاری دەبنەوە، هەموو ئەمانەش لەبەردەمی بەڕێوبەری زیندان و پاسەوانەکان، پێمگوت داخۆ ئەمە زیندانە یان قەسابخانەی کەوڵکردنی مرۆڤە؟ ئینجا بە وردو درشتی باسی هەموو ئەو شتانەم بۆ کرد کە بەچاوی خۆم دیومن بەرامبەر بەو زیندانییە بێتاوانانە ئەنجام دراون. محەمەد عەزیز قسەکەی پێبڕیم و گوتی: چۆن دەزانیت ئەوانە بێتاوانن؟ گوتم چونکە یەزانم کە خۆم بێتاوانم، بەردەوام بووم لە قسەکانم و سەیری بەڕێوبەری زیندانم کرد و گوتم: خالد ئەشکە دەبوو شوانی مەڕو بزن بێت نەک بەڕێوبەری زیندان، لەبەر ئەوەی هەر کەسێک لە خەلان بڕواتە دەرەوە، بەهۆی کردەوە دڕندەکانیەوە، بەیەکجاری واز لە کورد بوونی خۆی دێنێت و نەفرەتی لێدەکات ئەگەر کوردێکی زۆر ڕەسەنیش بێت. نامەکەم دایە دەستی کە

هەر سەبارەت بەو بابەتە بۆ بارزانیم نوسیبوو، لێیوەرگرتم و دواتر دابووی بە ئیدریس و مەسعود. دوای چەند ڕۆژێکی کەم ڕێنمایی و فەرمانی توند دەرکرا بۆ بەڕێوبەری زیندان کە واز لەو ڕەفتارانە بێنێت و ئەوەندە ئەشکەنجە و سوکایەتی بەرامبەر بە زیندانییەکان نەکات لە زیندانی خەلان.

دوای ئەوەی کە خودا پشتیگرتم، بەڕێوبەری زیندان هەوڵی دەدا، بەشێوازە شەیتانییەکانی خۆی تۆڵەم لێبکاتەوە بە هەر شێوەیەک بووە بۆ ئەوەی تورە بوونی خۆی دامرکێنێتەوە. هەندێ لە پاسەوانەکانی هاندەدا بۆ ئەوەی ڕەفتاری خراپم لەگەڵدا بکەن و قسەم لەگەڵدا نەکەن و هیچ داوایەکم جێبەجێ نەکەن. ئیتر نامەیەکی ڕەسمیم نارد بۆ بارەگای بارزانی و ناڕەزایی خۆم دەربڕیبوو، هەروەها داوای هەندێ جلوبەرگی ژێرەوەم کردبوو، لە کۆتایدا عەلی محەمەد عەزیز ئەرکی کێشاو هەندێکی کەم لە داخوازییەکانمی جێبەجێ کردبوو.

ڕۆژێکیان عومەر دەبابە و شاخەوان ئەحمەد لە بەشی کاروباری گشتی شۆڕش بە مەبەستی پشکنین سەردانی زیندانیان کرد بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بارودۆخی بەندکراوەکان بەسەر بکەنەوە. دەچوونە هەموو ژوورەکانەوە هەتا گەیشتنە ژوورەکەی من، عومەر منی بینی و هاتە ژوورەکەم سەیری کرد زۆر پیس و پۆخڵە چەوری و خۆڵ لەسەر دیوارەکانی بوو چونکە نزیک بوو لە ناندێنەکەوە. بەسەر پێخەفەکەمەوە چینێکی

ڕەش چڵک و پیسی هەبوو، پێمگوت: کاک عومەر کوا برایەتی کوردان؟ تێکۆشەرێکی وەک جەمیل مەحۆ لەو حاڵەتەدایە تۆ پێت ڕەوایە؟ بە دەنگێکی نزم کە بە حاڵ دەبیسترا گوتی: بۆچی کاک جەمیل کەسێک لە ئێمە دەتوانێت پرسیاری تۆ بکات لەبەر ئەوەی ڕۆژی دواتر چارەنوسی ئەویش زیندان دەبێت. شاخەوان ئەحمەد گوتی: هاوڕێکانت لە لوبنان هاوکاری شوێعیەکان دەکەن لە دژی شۆڕش. پێمگوت ئەوە درۆیە، ئەوە ئێوەن دژی شۆڕشی کوردن نەک ئێمە. ئینجا ئاوڕم دایەوە بۆ عومەر و لێمپرسی: هۆکاری ئەم سەردانە کتوپڕەتان چییە؟ گوتی: ئێمە بەشوێن کارێکەوەین دەمانەوێت بزانین بۆمان دەلوێت چەند ژوورێکی تر لە ناو زیندانەکە دروست بکەین. گوتم هەقی خۆتانە چونکە هەزاران خەباتکاری بەشەرەفی کورد لە کونجی بەندینخانەکانی شۆڕشدا توند کراون.

فاروق کە پیشەی (دووانـدن) بوو، لە دواوە لەبەر دەرگاکە لەگەڵ پاسەوانەکاندا وەستابوو، دەستی کرد بە پێکەنین. پێش چوونە دەرەوەی عومەر لە ژووری بەندییەکەم داوای لێکردم هەندێ دار جگەرەی بە دیاری بدەمێ کە بە کوردی پێیان دەگوت (باسک)، بەشی خۆی و هاوڕێکانیمدا، فاروق خۆشی پێشتر هەندێ باسکی لێوەرگرتبووم.

لێرەدا دەتوانم بڵێم کەسێک لە شۆڕشدا نەما، لە سەرکردەکانەوە بیگرە هەتا دەگاتە پێشمەرگەکان، دار جگەرەی

لێنەسەنیبێتم، بەڵام بەڕێوبەری زیندان زۆرترین دار جگەرەی لێدەسەندم. هەموو جارێک لەبەردەم دەرگای ژوورەکەمدا دەوەستا و لە پەنجەرە بچوکەکەوە هاواری دەکرد "باسکم ئەوێ". کاتێک بە گوێیم نەدەکرد و نەمدەدایێ دەرگاکەی بەزۆر دەکردەوە و لەگەڵ کۆمەڵێک پاسەوان بە چەکەکانیانەوە وەکو جەردە دەهاتنە ژوورەوە، ئینجا دەستی دەکرد بە جانتاکەمدا و بەدڵی خۆی باسکی دەبرد. هەندێجار زۆری لێدەکردم و داوای زیاتری دەکرد و نەمدەدایێ، ئەوجا کوڕەکەی بۆ دەناردم کە لە باوکی نارەسەنتر بوو. لەگەڵیدا ڕێککەوتم کە زۆرترین باسکی بدەمێ بەو مەرجەی کە دەنگوباسی دەرەوەم بۆ بێنێت. بەهۆی ئەوەوە زانیم کە سوپای ئێران بە درێژایی سنورەکانی لە ئامادەباشیدایە بۆ یارمەتیدانی کورد، هەروەها بۆی باس دەکردم کە تانکەکانی ئێران بەشەو هەتا سنوری سلێمانی نزیکدەبوونەوە بۆ لێدانی سوپای عێراق. بەهۆی ئەوەی کە ئەو باسکانەم دەدانێ زانیاری سەربازی و غەیرە سەربازی زۆر گرنگم دەست دەکەوت، لەوانەش بۆ نمونە سێ ڕۆژ قەدەغەی هاتوچۆیان لە ناوچەکەدا ڕاگەیاندووە بەهۆی ئەوەی کە دوو لەشکر لە سوپای ئێرانی هاتوونەتە گەلاڵە بۆ هاوکاری پێشمەرگە ئەو کاتەی سوپای عێراق ڕەواندزی گرتۆتەوە و پێشمەرگە پاشەکشەی کردووە بۆ گەلاڵە. هەروەها زانیم کە ژمارەیەک لە بارهەڵگر ڕۆکێتی "هۆک" یان هێناوە لە ئێرانەوە و هاتوونەتە ناو حاجی

ئۆمەران، هەروەها بارزانی چەند جارێک ناوچەکانی شۆڕشی بەجێهێشتووە و ڕۆیشتووە بۆ ئێران و فەرەنسا و ئەمەریکا و هەندێ وڵاتانی تری ئەوروپا. هەروەها لە سەرچاوەی زۆر باوەڕپێکراو زانیم کە بەڕێوبەری زیندان لە دژی بارزانی کاردەکات و لە دەستوپەیوەندە هەرە دڵسۆزەکانی جەلال تاڵەبانییە. هەمیشە باسی جەلالی بۆ ئەکردم و زۆر وەسفی دەکرد، هەروەها زۆر بە ئیبراهیم ئەحمەدا هەڵیدەدا. هەروەها بەڕێوبەری زیندان پێی گوتم؛ کاتێک سوپای ئێرانی دێنە ناوچەکانی شۆڕش بۆ یارمەتیدانی پێشمەرگە، ئەندامەکانی دیار نامێنن، چونکە جل و بەرگی پێشمەرگە دەپۆشن بۆ سەرلێتێکدان و ونبوونیان، تا هیچ کەس گومانیان لێنەکات.

جارێکیان پێمگوت کاک خالد تۆکەسێکی باشیت، ئەتوانیت پێمبڵێیت من کەی ئازاد دەکرێم و لێرە دەردەچم؟ زۆر بە لوتبەرزی و لەخۆبایی بوونەوە وەڵامی دامەوەو گوتی: رەنگە هەر لێرە بمێنیتەوە هەتا لە زیندانی خەلان دەمریت. پێمگوت خودا لە هەموو کەس گەورەترە و توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و کۆتایی زاڵمیش زۆر رەش دەبێت. پێیگوتم ئەوە دەبینم تۆ بە شەو و رۆژ خەریکی دروستکردنی ئەو باسکانەی ئەم کارە سودی چییە بۆ تۆ؟ پێمگوت ئیشالا بەم زوانە لە زیندان دەچمە دەرەوە هەمووی دەکەم بە دیاری بۆ هاوڕێکانم و بۆ هەر کەسێک لە بەیروت بێت بۆ لام و هەواڵم بپرسێت، ئینجا دەستی

کرد به پێکەنین و قاقا لێدان و گوتی: تۆ شێت بوویت، زۆر سەهویت، حسابەکانی تۆ وەک حسابەکانی سەدام حسێن وایە، تۆ لێرە دەمێنیتەوە هەتا لە زینداندا دەمریت، من خۆم زۆرم لا سەیرە بە درێژایی ئەو ماوەیە بەرگەت گرتووە و بە زیندوویی ماویت و نەمردوویت، چونکە ئەم زیندانەی کە تۆی تێدایت لە شەش مانگ زیاتر هیچ کەس بەرگەی ناگرێت.

بەڕێوەبەری زیندان خالد ئەشکە مرۆڤێکی رەفتار نامۆ بوو، توند و زاڵم، بە شێوەیەکی زۆر خراپیش رەگەز پەرست بوو. جیاوازی دەکرد لە نێوان کوردێک و ئەوی تردا. بەمنی دەگوت تۆ بادینیت ئێمە سۆرانین. منیش وەڵامم دەدایەوەو دەمگوت: لای من جیاوازی لە نێوان کوردێک و ئەوی دیکەدا نییە. کوردی راستەقینە ئەوەیە کە خزمەتی گەلەکەی دەکات، کوردی رەسەن ئەوەیە کە خزمەتی کوردستان بکات بەدڵسۆزی و بە دڵ و بە گیان. زۆرجار هەستم دەکرد و لە رەگەز پەرستبوونی دڵنیا دەبوومەوە کاتێک لە زیندانەکانی دەدا، بە تایبەت ئەوانەی کە جامانەی سووریان بەسەرەوە بوو نیشانەی ئەوەی کە بارزانین. بەشی ئەوانە کاری قورس و ئەشکەنجەی توند بوو، تەنانەت هەیانبوو هەوڵی راکردنی دەدا بۆ ئەوەی رزگاری بێت لەو ئەشکەنجە قورسە، ژیانی خۆیان دەخستە بەردەم هەڕەشەی کوشتن، ئەوەیان پێباشتر بوو وەک لەوەی لەو زیندانەدا بمێننەوە.

ئەوانەی کە هەوڵـــی راکردنیـــان دەداو شکســـتیان دەهێنــا و دەگیــرانەوە، دەیانهێنـــان لەبەر چـــاوی هەمـــوو بەنـــدییەکانەوە دەستیان دەکرد بە لێدان و ئەشکەنجە دانیان. بە قامچی پشتیان سور دەکردنەوە و بە قۆناغە تفەنگ بەردەبوونە سەروگیانیان. بە شـــێوەیەکی زۆر وەحشـــییانە ئەشـــکەنجە دەدران هەتـــا لەهـــۆش خۆیان دەچوون، ئینجا ئەیانبەستنەوەو کۆت و زنجیریـان دەکردە قاچیـان و لە ژووری بچوکدا رایانـدەگرتن. زۆرێک لە بەندییەکان لە کاتی هەوڵدانیان بۆ راکـردن دەکـوژران و گـوله بـاران دەکـران. رۆژێکیـان یەکێـک لە زینـدانییەکان هەوڵـی دابـوو رابکـات، بەڵام شکســـتی خـــوارد. لە گۆڕەپـانی زینـدانەکەدا رایـان وەســـتاندبوو. دوای ئەوەی تێروپڕ ئەشـکەنجەیاندا، بەڕێوبەری زیندان داوای لە هەموو بەندکراوەکان کرد لەبەردەمـی ئەم داماوەوە بڕۆن و هەر کەسەی تفێک بکاتە ناوچـاوانی، ئەوەی ئەو کارەی نەکردایە ئەوا پاداشتەکەی سوکایەتی و لێدان بوو بە قۆناغی تفەنگ.

جارێکیـان لە یەکێک لە بەرپرســەکانی زیندانم پرسـی کەنـاوی مــحەمەد ئەمـین بـوو بـۆچی کاتێـک کەسـێک لە بەنـدکراوەکان نەخۆش دەکەون نایبەن بۆ نەخۆشخانە و لە جیاتی ئەوە دەیبەنە ناو حەوشەی زیندانەکە و چەند رۆژێک فڕێی دەدەن بەبێ ئەوەی هـیچ کەسێک بـایەخی پێبـدات؟ زۆر بە سـوک و ئاسـانی وەڵامـی دامەوەو گـوتی: بـۆچی عەزیەتـی خۆمـان بـدەین و بیـبەین بـۆ

خەستەخانە؟ خۆی دوای یەک دوو رۆژ دەمریت و لە کۆڵمان دەبیتەوە!

ئەو شتانەم هەمووی بەچاوی خۆم دەبینی لە زیندان، ئەمە جگە لەو کەسانەی کە چەند ساڵیک لەو زیندانە دەمانەوە و وەکو شیت بە رۆژ و بەشەو هاواریان دەکرد. لەناو زیندانەکاندا وتاریان دەداو هیرشیان دەکردە سەر بارزانی و سەرانی شۆرش. ئەمانە هەموو جلوبەرگی بەریان دڕابوو، بە تایبەت لە زستان کە سەرماو سۆڵەیەکی زۆر توندبوو، کرێوەکەی زۆر بێ رەحم بوو. زۆرم بەزەیی پیایاندا دەهاتەوە. دەچووم بۆ لای پاسەوانەکانی زیندان ئەوانەی هاورێم بوون، پارەم دەدانی بۆ ئەوەی کەمێک پێداویستی بۆ ئەو داماوانە بکڕن چونکە من موچەیەکی مانگانەی ١٥ دینارم هەبوو، بەشی هەرە زۆریم لەبەر خاتری خودا بۆ نەدارەکان سەرف دەکرد، چونکە بەشی هەرە زۆریان سەردانیان قەدەغە کرابوو، بەدرێژایی رۆژ لەژێر قرچەی هەتاودا بێگارییان پێدەکرا و لە زستانیشدا لەژێر کرێوەی سەرما، جادەیان پێڕادەکێشان یاخود لە باخ و باخاتی بەڕێوبەری زیندان دارو درەختیان پێدەناشتن و رۆژانە روبعە دینارێکیان دەدانێ، جا ئیتر بیخە بەرچاوت چ زوڵم و ستەمێک بووە. هەر کەسێکیش گوێڕایەڵ نەبوایە پاداشتەکەی ئەشکەنجەو لێدان بوو.

ئەگەر یەکێک لە زیندانییەکان بە رێکەوت هەندێ شتی لابوایە و بەڕێوبەر حەزی لەو شتە بوایە، بۆ نمونە وەکو رادیۆ یان هەر

شتێکی تر، هەوڵی دەدا بە شێوازە نامەردەکانی خۆی دەستی بەسەردا بگرێت. سروشتی بەڕێوبەری زیندان وابوو بۆ هەر ژوورێک کەسێکی سیخوڕی خۆی دادەنا، بۆ ئەوەی جاسوسییان بەسەرەوە بکات و قسەوباسەکانیان بگوێزێتەوە بۆ گەورەکەی، یەک وشە بەس بوو کە ئەوجاسوسە بیبات بۆ بەڕێوبەری زیندانەکە و بۆ نمونە بڵێت خاوەنی رادیۆکە هەوڵیداوە رابکات و دەرگای زیندانەکە بشکێنێت، ئیتر قوڕبکات بەسەری ئەو کەسەداو دووچاری کوێرەوەری و ئەشکەنجەی بکاتەوە. زۆربەی تۆمەتەکان تەنها بوختان و درۆ بوون، ئیتر ئەو کەسە داماوە دەبرایە دەرەوە بۆ لێپێچینەوە.

خۆم شایەتحاڵی رووداوێک بووم بەسەر بەندکراوێکدا هات ناوی سمکۆ بوو. بەڕێوبەری زیندان بانگی کردو پێی گوت: ئەو رادیۆیەم بدەری رزگارت دەکەم لەو تۆمەتە مەترسیدارە، هەر ئەوەندەی کە رادیۆکەی پێدابوو، ئیتر سیخوڕەکەی بانگ کردو هاواری کرد بەسەریا: تۆ درۆ ئەکەیت سەگی کوڕی سەگ، ئەم پیاوە بەڕێزە (واتە سمکۆ) کاری لەوجۆرەی لێناوەشێتەوە، لەبەر ئەوەی لە خێزانێکی بەڕێزە.

بەر لەوەی دەستگیر بکرێم، لە زۆر کەسم دەبیست کە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لە عێراق تەنها تاقمێک چەتەی بەکرێگیراوی چەکدارن، باوەڕم بەوە نەدەکرد و دەمگوت ئەوە ناشرینکردنی شۆڕش و پیاوەکانیەتی، بەڵام ئێستا هیچ گومانێکم

لەوەدا نەماوە، بەڵکو ئەو کاتەی بە چاوەکانی خۆم دەمبینی کە چۆن دادگایی زیندانییەکانیان دەکرد و حوکمی جۆراوجۆری وەکو ئیعدام یاخود بیست ساڵ زیندانییان بەسەردا دەسەپاندن، تەواو دڵنیا دەبوومەوە لەوە. پرۆسەی دادگایی کردنەکان بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕیانە بەڕێوە دەچوو. هەندێ لە بەرپرسەکان دەهاتن و چەند کەسێکی لێکۆڵیارو دادوەرێکیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا و لەبەردەم دەرگای زیندانەکە دادەنیشتن و سەرو کوپێک چایی و چەندەها جۆری میوەی بەلەزەتیان لەبەردەمدا دادەنرا و دەستیان دەکرد بە پێکەنین و قسەی قۆڕ. یەکێکیان لە دوای یەک دوو پرسیاری گاڵتە ئامێز، بە بەندکراوەکەی بەردەمی دەگوت: ئەی فلان کەس، ئەوە حوکمی ئیعدامەمان بۆ دەرکردیت، بۆ دووەمیش بیست ساڵ حوکم ... تاد

هەزاران کەس لە نێو بەندینخانەکاندا توند کرابوون، هەر هەمووشیان بێتاوان بوون و هیچیان نەکردبوو، حوکمی ناڕەوا لە دژیان دەردەکرا تەنها بۆ تۆڵە کردنەوە یان بۆ ناچارکردنیان بۆ ئەوەی بێنە ناو حزبەوە، ئینجا دوای ئەوە ئازادیان دەکردن. بیرم دێت لەناو بەندکراوەکاندا یەکێکی تیا بوو ناوی "شاتو" بوو. کورتە باڵایەک بوو، پێشمەرگە بوو، ساڵی ١٩٦١ پەیوەندی پێوە کردبوون، پسپۆڕبوو لە تەقاندنی گولەتۆپی ئاسمانی دژە فڕۆکە. هۆکاری دەستگیرکردنەکەشی ئەوەبوو کە ژنەکەی و براژنەکەی خۆی لەسەر بەدڕەوشتی کوشتبوو، سزاکەی تەنها دوو ساڵ

بوو، لەبەر ئەوەی پێشمەرگە بوو، پێنج ڕۆژ بەر لەوەی ماوەی زیندانیکردنی تەواو بێت، پێیان گوت حوکمێکی ترت بەسەردا سەپێنراوە بۆ ماوەی پازدە ساڵ، بەڵام ڕێکەوتنی جەزائیر هاتە گۆڕی و ئەم و هەزاران بێتاوانی تری ڕزگار کرد لە دەستی ئەو گێرەشێوێن و بەد ڕەوشتانەی کە گەمەیان بە چارەنوسیانەوە دەکرد.

لەگەڵ ئەم بەندکراوە بێتاوانانەدا، هەندێ سیاسەتمەداری بەناوبانگیش هەبوون، ئەمانەیان هەموو دەئاخنییە ناو ژوورێکەوە لەژێر چاودێری توندا دەبوون بۆئەوەی هیچ جۆرە پەیوەندییەک لەنێوانیاندا دروست نەبێت.

وێڕای توند و تۆڵیی چاودێری، بەڵام من بەشێوازی خۆم دەمتوانی پەیوەندییان لەگەڵدا بکرم و ئاڵوگۆڕی نامەیان لەگەڵدا بکەم، بەردەوامیش دەمزانی لە دەرەوەی زیندان چی دەگوزەرێت. کەسوکاری ئەو زیندانە سیاسییانە دەهاتن بۆ سەردانیان و دیارییان بۆ دەهێنان. لە بیرمە جارێکیان سێ قەفەز مریشکیان بە دیاری هێنا کە هەر دانەی دە مریشکی تێدا بوو. ئۆتۆمبیلەکە لەبەردەم بەندینخانەکەدا وەستا و قەفەزەکانیان داگرت. دزەکان لەدەوری کۆبوونەوە، هەروەها بەڕێوبەری زیندانیش خالد ئەشکە هات و فەرمانی بە یەکێک لە پاسەوانەکان کرد پێنج دانە لەو مریشکانەی بۆ بەرێتەوە بۆ ماڵەوە، بە پاسەوانەکانیشی گوت سێ مریشک بەرن بۆ خۆیان. هەر پاسەوانێک دوو مریشکی برد.

لە سـێ مریشـک تەنهـا حەوت دانە مـانەوە. دواتـر یەکێـک لە پاسـەوانەکان هـات و بە زیندانییەکانی گوت تەنها یەک مریشک هەیە دەتوانن لە حەوشەی زیندانەکە بیخۆن. بەشـەو دەمبینی کە چۆن پاسەوانەکان مریشکەکانیان سـەردەبڕی و دەیـانخواردن و ڕۆژی دواتـر بە خاوەنەکانیـان دەگـوت نەخۆشـی بـڵاو بـووەو مریشـکەکان مرداربـوونەتەوە. هەمـوو ئەوانەم بە چـاوی خـۆم دەبینی، چونکە ژوورەکەم نزیکی ژووری پاسـەوانەکان بـوو، لە کونی دەرگاکەوە هەموو شتێکم دەبینی.

دەمتـوانی هەر جـۆرە چەکێـک ئـارەزووم بـوایە بیهێنمە نـاو ژووری زیندانییەکانەوە، ئەوەش زۆر ئاسان بوو، چونکە ئەوانەی پاسەوانی زیندان بوون هەموویـان دز بوون و دزەکان کرابوونە پارێزەری زیندان لە پێش هەمووشیانەوە خالد ئەشکەی گێلۆکە. ئەوانە ئامـادەبوون کوردسـتان لەمسـەری بـۆ ئەو سـەری بەیەک دینـار بفرۆشـن. بە دزییەوە ئـازوقەو چەکیـان دەفرۆشـتەوە، ئەمە جگە لەو پارانەی کە خالد ئەشکە مانگانە لە بارەگای بـارزانی و مەکتەبی سیاسی وەریدەگرت بۆ دابینکردنی پێداویستی زیندان، لە راسـتیدا هـیچ شـتێکی بـۆ پێداویسـتییەکانی زینـدان سـەرف نەدەکرد، هەمووی هەڵدەگرت بۆ خۆی.

وام بـۆ دەرکەوتبـوو کە ئامـانج لە هەڵگیرسـاندنی شۆڕشـی کوردسـتان لە عێـراق ئـازاد کردنـی گەلـی کـورد و سـەربەخۆیی کوردسـتان نەبـوو، بەڵکـو لە بەرژەوەنـدی ئەم تـاقمە خـائن و

خۆفرۆشـه بـوو که هـیچ پـایهو شـوێنێکیان لهنـاو ریزهکانی گهلی کوردا نهبوو، ئامانجیشیان تهنها ئهوه بـوو که خۆیـان له پشـتی سـهرکردایهتییهکی گهنـدهڵی بـزووتنهوهی کـورد مهڵاس بدهن. له کـاتی دهستبهسـهرکردنی زۆره ملێمـدا له سـاڵی ١٩٧١ هەنـدێ وێـنهی فۆتـۆگرافیم چرکانـدبوو، له حـاجی ئـۆمهران لهگهڵ پاسـهوانهکانی بارزانیـدا، نـاردبوومن بـۆ لوبنـان بـۆ ئهوهی له رۆژنامهی حزبدا (دهنگی کورد) بڵاوی بکهنهوه، تـا له رێگـایهوه رایگشـتی له بـارودۆخی دهسـتگیرکردنم ئاگـادار بـکهمهوه. بـڵاو کـــردنهوهی ئهو وێنـــانه کـــاریگهری زۆری ههبـــوو، رووی راستهقینهیانی ئاشکرا کرد. ئیدریس و مهسعود زۆر بهوه تـوڕه بوون، چاودێرییان لهسـهر توند کردم و وێنهگرتنیان لێم قهدهغه کرد. ههرچهنده ئهوان رێگایان لێگرتم و چاودێرییان لهسـهر تونـد کـردمهوه، بهڵام به رێگـای تـایبهتی خـۆم ههنـدێ وێنهم لهنـاو زینداندا چرکانـد، ههنـدێ لهوانهی که کامیرایـان پێبـوو لهگهڵیانـدا رێکهوتم که ههندێ وێنهم لهناو زیندان بهدزییهوه بگرن، بهرامبهر بهوه منیش دارجگهرهم دهدانێ.

ئهو مـــاوهیهی که بهســـهر دهســـتگیرکردنمدا تێـــپهڕی و ئهو ههمـوو سـکاندالْ و رسـواگهرییهی مـن بینـیمن، دنیـای لهبهرچـاو خسـتم، بیرکـردنهوهی خـراپ به خهیاڵمـدا دههـات، له دڵـی خۆمـدا دهمگوت: بۆچی من لهو حاڵهتهدا دهژیم. دڵتهنـگ و غهمبـار بـووم، مێشکم لهسهرخۆم نهمابوو. نامهیهکم بۆ بارهگای بارزانی نـارد و

ئاگادارم کردن کە من ئیتر مانگرتن لە خواردن رائەگەیەنم هەتا مـردن، ئەگەر ئـازادم نەکەن، وەک پیشـەی خۆیـان وەلامیـان نەدامەوە، ئیتر دەستم کرد بە رۆژوو گرتن، دڵم گوشرابوو، لە ژوورەوە تەنها بووم، لەسەر زەوی بەبێ خواردن و خواردنەوە و جگەرە کێشان کەوتبووم، نۆ رۆژم بەو جۆرە بردە سەر.

لە رۆژی دەیەمدا، بەرێوبەری زیندان هاتە ژوورەکەم و گوێم لێبوو گوتی خەریکە دەمرێت. تەلەفۆنی کرد بۆ بارەگای بارزانی و پێی راگەیاندن، بارزانیش جەنابی وەزیری داد؛ ساڵح یوسفی راسپارد بۆ ئەوەی دانوستانم لەگەڵدا بکات و واز لە مانگرتن بێنم. لەگەڵ بەرێوبەری زیندان نامەیەکی شەفەوی ناردبوو، من دەست لە مانگرتن هەڵگرم بەرامبەر بەوەی کە ئەو بێت بۆ گفتوگۆ لەگەڵم، بە بەرێوبەری زیندانم گوت ئەو پیاوە خڵەفاوەو درۆ دەکات، گوتی: نا ئەو پیاوە تەمەنی زۆرە و وەزیری دادە لەسەر کوردستانی عێراق دەچێتە ئەقڵەوە درۆ بکات؟ رێک گومانەکەی من لە شوێنی خۆیدا بوو درۆی کرد و نەهات.

لە ناو گیراوەکاندا جەوهەر ئاغای مێرگەسۆری هەبوو، کە برای فاخر مێرگەسۆری بوو. لە ژێر چاودێری توندا بوو. ئەویش لای خۆیەوە بڕیاریدا مانگرتن لە خواردن راگەیەنێت. چەند رۆژێک مانی گرت و دواتر گواستیانەوە بۆ زیندانی رایات و دواتر ئازادیان کرد.

ماوەیەکی زۆری پێنەچوو دوای ئازاد کردنی، دیسانەوە لە بارەگای بارزانیەوە فەرمان درا و دووبارە لەگەڵ باوکیدا محەمەد

ئاغـــای مێرگەســـۆری دەســـتگیر کـــرایەوە و لەگەڵ ئەنـــدامانی خێزانەکەیانـدا خرانە ژێر چاودێری توندەوە، لە کاتێکدا فاخر و براکەی هیچ هەواڵێکیان نەدەزانرا، دواتر زانیمان کە هەموویان لەناو زینـدانی ترسـناکی رایات گولە باران کراون. سالی ١٩٧٤ بـارزانی فەرمانیـدا کە هەمـوو بەنـدییەکانی بەنـدینخانەی خەلان بگوێزنەوە بۆ رایـات و تەنها مـن لەوێ مـامەوە، چونکە ئاشـکرا بـوو، ئەوەی رەوانەی زینـدانی رایـات بکرایە بە مـردوو ئەژمـار دەکرا. هەفتە نەبوو لەو زیندانە دوو یان سێ کەس گولە بـاران نەکرێن. بەهۆی هەندێ لە پاسەوانەکانەوە ناوی ئەوانەم دەزانی کە لەزیندانی رایات دەکوژران، پاسەوانەکان لە رێگای هەندێ لە برادەرەکانی خۆیانەوە لە زیندانی رایات ئاگاداری هەموو شتێک بوون.

هەندێ جار لەناو پێشمەرگەکاندا یاخیبوون سەریهەڵدەدا، لە نێوان خۆیاندا دەبوو بە شەڕیان و تێکپرژانی چەکدارانەیان دەکرد و کوژراو و بریندارى لێدەکەوتەوە، ئەوەی کە بەهێزتر بوو کۆنترۆڵی دۆخەکەی دەکرد و سەدانی لەوان دەستگیر دەکرد و لە زیندانی خەلان توندیان دەکردن و دوای ماوەیەکی دیاری نەکراو ئینجا ئازادیان دەکردن و رەوانەی بەرەکانی شەڕیان دەکردنەوە.

پێش ئەوەی عەزیز عەقراوی رابکات[٣٠]، بەڕێوبەری زیندان خۆی پێیگوتم: عەزیز عەقراوی دەستگیر دەکرێت و بە

---

[٣٠] هۆکاری راکردنی عەزیز عەقراوی و هەموو ئەوانی تریش، ملهوڕی مەلا مستەفا و کوڕەکانی بوون، کە لە ناو بازنەیەکی داخراوی موخابەراتی ئیقلیمی کاریان دەکرد و هەموو کەسێکیان بە رێگرو خائن و دوژمن دەزانی، لەوانەش عوبیدولای کوڕی خۆیی و سابیر و لوقمان و هاشم عەقراوی و جەلال تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد و عەلی عەسکەری و دەیان کەسایەتی تر. لێرەدا بە کورتی رووداوی جیابوونەوەی عەزیز عەقراوی باس دەکەین: عەزیز عەقراوی ساڵی ١٩٢٤ لە ئاکرێ لە دایک بووە. کۆلێژی سەربازی و کۆلێژی روکنی تەواوکردووەو لە خولی راهێنانی سەربازی لە بەریتانیا و یەکێتی سۆڤیەت بەشدار بووە. ساڵی ١٩٦٢ ریزەکانی سوپای عێراقی بەجێهێشت و پەیوەندی کرد بە جوڵانەوەی ئەیلولەوە. ساڵی ١٩٦٤ هەتا کاتی هەڵهاتنی لە ١٩٧٣ وەک لێرەدا جەمیل مەحۆ باسی دەکات، ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بووە. وەک زۆربەی سەرکردەکانی پارتی چۆتە ئیسرائیل و چەندین جار بەشداری خولەکانی مۆسادی کردووەو بۆتە یەکێک لە ئەفسەرە پایەدارەکانی دەزگای پاراستن. عەزیز عەقراوی لەبەر ئەوەی کەسێکی زمانزان و رۆشنبیرێکی سیاسی و سەربازی و ستراتیژی هەبووە، هەر زوو زانیویەتی کە مەلا مستەفا خۆی کردووە بە کارتی دەستی ئێران و تورکیا و ئیسرائیل و لە قۆناغێکدا ئەو کارتە دەسوتێت، بۆیە لەدوای ساردبوونەوەی ریکەوتنانەی ١١ی ئازار، بە هاوبەشی لەگەڵ هاشم عەقراوی و عوبێدولای کوڕی بارزانی و عەبدول ستار تاهیر شەریف و چەندانی تر بە هاوبەشی لە گەڵ حکومەتی عێراق، پارتی دیموکراتی کوردستان دروست دەکەنەوە. دوای راکردنی لە چنگی بارزانی لە ناو حکومەتی عێراقدا بوو بە وەزیری دەوڵەت و هەتا ساڵی ١٩٧٧ لەو پۆستەدا مایەوە. لەدوای دەسەڵات بەدەستەوە گرتنی سەدام حسێن و کوژرانی هەریەکە لە عوبێدولا و لوقمان و سابیر و شێخ عوسمان و کوڕەکانی ( کوژرانی هەموو ئەمانە بە نەخشەی حەمایلی دایکی مەسعود بووە، لە رێگای ناردنی نامەی دروستکراو بۆ ناو حکومەتی عێراق گوایا ئەمانە لە ژێرەوە کار بۆ بارزانی دەکەن) ئیتر عەزیز عەقراوی بەنهێنی رایکرد بۆ سوریا و لە دوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ گەڕایەوە بۆ کوردستان. عەزیز عەقراوی لە لایەن جەلال تالەبانی بە کەسێکی بودەڵەو ترسنۆک ناوی براو و هیچ کات لە هیچ شەڕێکدا نەیتوانیوە وەکو پێویست سەرکردایەتی هێزەکانی خۆی بکات و لەهەموو شەڕەکاندا بەبێ تەقە ناوچەکانی بەدەستەوە داوە. ئەوەی جێگای پرسیارو گومانە

کەلەپچەکراوی دەیهێنن بۆ ئێرە، پێمگوت ئەو چەقەڵە بۆچی رایکرد؟ گوتی: لە لایەن بارزانییەوە یاداشتێکی دەستبەسەرکردنی دەرچووە و بۆی نییە بڕواتە ناوچەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی شۆڕش، بەڵام سەربارێ ئەو یاداشتە بە شارەزووی خۆی بەناو گەلاڵە و ناوپردان و قەسرێ و حاجی ئۆمەران پیاسەی دەکرد، بەبێ ئەوەی کەسێک رێگای لێبگرێت. رۆژێکیان زانیمان کە دیار نەماوە و کەس نازانێ چۆن، دەزگای هەواڵگریی شۆڕش هەوڵیدا دەستگیری بکات لە هەر شوێنێک بێت، بەڵام بێ سود بوو.

دوای ئەو گفتوگۆیە نامەیەکم بەدەستی سەرۆکی زیندان نارد بۆ فرانسوا هەریری بۆم نوسیبوو: رات چییە لەسەر خیانەتی عەقراوی؟ ئەو یەکەم کەسی خائن نییە بە گەلی کورد، بەڵکو نمونەی زۆرە کە هەتا ئەم ساتە لە ریزەکانی سەرکردایەتی شۆڕشدان. بەڕێوبەری زیندان بە تورەییەوە وەڵامی دامەوە: تۆ کێیت تا بتوانیت هێرش بکەیتە سەر سەرکردایەتی شۆڕش و مەکتەبی سیاسی؟ پێمگوت: لە حەبیب محەمەد کەریم بپرسە ئەو پێتان دەڵێت من کێم. سەرۆکی زیندان رێنمایی زۆر توندی لە بارەگای بارزانییەوە بۆ دەهات، منیش پێمدەگوت کاک خالید، تۆ

---

ئەوەیە کە ئەم کەسە رەنگە لەبنەڕەتا پێشتر پەیوەندی بە حکومەتی عێراقەوە هەبوویێت و لەسەر داوای ئەوان شەڕی نەکردبێت، هەروەها رەنگە لەسەر داوای مۆسادیش گەڕابێتەوە بۆ ناو دامودەزگاکانی حکومەتی عێراق. بە کورتی و بە کوردی وەک جەمیل مەحۆباسی دەکات، بارزانی و هەموو دارودەستەکەی جاسوس و سیخوڕی وڵاتان بوون و هەرگیز بۆ بەرژەوەندی گەلی کورد کاریان نەکردووە. ساڵی ١٩٩٨ کۆچی دوایی کردووە.

بەو ڕێکارە توندانەی بەرامبەر بە من دەینوێنیت من دەکوژێت، ئایا هیچ ڕەحم و بەزەییەک لە دڵتا نیە؟ وەڵامی دەدامەوە و دەیگوت ئەوە فەرمانی سەرەوەیە ناتوانم خۆمی لێلادەم.

لە کاتی بەندیمدا، کەسێکی بەندکراوی ترم ناسی ناوی مەلا یەحیا بوو، دەیگوت بەرپرسی ڕێکخراوی کاژیک بووە. سێ ساڵ بوو لە لایەن ئیدریسەوە دەستگیر کرابوو، بۆیان دەرکەوتبوو کە چەند جارێک ئیمزای ئیدریسی ساختە کردووە. دواتر لە زیندان دەریانکرد. بەهۆی میانگیری کەسێک لای بارەگای بارزانی، کردیان بە یاریدەدەری بەڕێوبەری زیندان. مەلا یەحیا بوو بە فەرمانبەر بە پلەی نوسەر لە زیندانی خەلان. هەندێ جار باسی حەبیب محەمەد کەریمی بۆ دەکردم و دەیگوت ئەو کاتێک لە بەغدا دەیخوێند، ناوبانگی ڕەوشتی لە نێو قوتابییەکاندا زۆر خراپ بووە، منیش زۆر بە ئاگاییەوە گوێم بۆ دەگرت و هیچ کۆمێنتم بۆ قسەکانی نەدەبوو بۆ ئەوەی قسەکانی نەبڕم و بەردەوام بە وردی باسی بکات. لە ناخی خۆمدا لەم کەسە دەترسام و زۆر بە حەزەر بووم لەم و لە کەسێکی تر بەناوی محەمەد ئەمین، چونکە ئەمەیان بۆ زیندانە سیاسییەکانی تێدەچاند تاوەکو ئەشکەنجە بدرێن و خۆشی وا دەردەخست کە ئاگای لێنییە.

لە سەروبەندی یەکێک لە شەڕەکانی نێوان شۆڕشی کورد و حکومەتی عێراقیدا، چوار سەربازی مەغاویر (هێرشبەر-

وەرگێڕی کوردی) لە سوپای عێراق بە دیل گیرابوون و هێنایانن بۆ زیندانی خەلان. تەمەنیان لە نێوان ١٨-٢٠ ساڵاندا بوو. دوو کەسیان بارودۆخیان زۆر شپرزە بوو، لە جیاتی ئەوەی بە گوێرەی نەریتە پەیڕەو کراوەکان چارەسەریان بکەن، لەگەڵ تۆمەتبارەکاندا دایان نابوون. ئەو سەربازە دیلانە چەندین جۆری سوکایەتی و ئەشکەنجە و ئازاریان چەشت، بەدارو بە قۆناغی تفەنگ لێیان دەدان. کاتێک ئەو کردەوە وەحشیانەیەم دەبینی دڵم دەسوتا و وەختەبوو بتەقێت، چونکە ئەوانە سەرباز بوون و فەرمان لە فەرماندەکانیان وەردەگرن، لە دڵی خۆمدا دەمگوت گوناهیان چییە تا بەو جۆرە وەحشیانەو نامرۆڤانە لێدان بخۆن. هەموو ئەمانەم بە چاوی خۆم دەدی لە زیندانی خەلان.

رۆژێکیان داوای دیتنی بەرپرسی پاسەوانەکانم کرد بەناوی محەمەد ئەمین و ئەم قسانەم لەگەڵدا کرد. پێمگوت: کاک محەمەد تۆ چویتەتە قوتابخانە؟ گوتی نەخێر، هەرگیز دەستگیر کراویت؟ گوتی نەخێر، هیچ بیروباوەڕێکت هەیە کە ئیمانت پێ بێت؟ گوتی سەرەتا شوێعی بووم، دوای ئەوە پەیوەندیم کرد بە شۆڕشەوە و ئێستا ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستانم. گوتم: کەواتە نیوەی یەکەمت شوێعییەو نیوەی دووەمت دیموکراتی وا نییە؟ ئەی کەواتە بۆچی پابەندی ئەو بیروباوەڕە نابیت کە ئیمانت پێیەتی؟ لە وەلامدا گوتی نازانم مەبەستت چییە؟ گوتم: ئەوەی ئێوە بەرامبەر بە دیلەکان ئەنجامی دەدەن لەناو زیندان لە

ئەشکەنجەدان و سوکایەتیکردن لە دەرەوەی هەموو بیروباوەڕەکانە، دژبەرە لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ. لە دنیادا هیچ شەرع و یاسایەک نییە ڕێگا بدات بە خراپی لەگەڵ دیلەکاندا مامەڵە بکەن، ناترسیت ڕۆژێک بێت و ئەو بەندکراوانەی ئێرە ئازاد بکرێن؟ ئایا ئەمانە دواتر چی دەڵێن جگە لەوەی کە ئەو کارە بەربەرییانەی ئێوە شەرمەزارو ڕسوا بکەن؟ گوتی: ئەگەر وا نەکەم ئەوە تۆمەتبارم دەکەن بەوەی کە شوێعی و کەمتەرخەمم، بە تایبەت کە ژمارییەکی زۆر لە پاسەوانەکان منیان خۆش ناوێت، هەروەها بەڕێوبەری زیندانیش چارەمی ناوێت و بوختان و درۆم بۆ هەڵدەبەستێت بۆ ئەوەی لە کارەکەم دوور بخرێمەوەو خزمێکی خۆی بخاتە شوێنم، لەبەر ئەوەی بەڕێوبەری زیندان کەسێکی گەندەڵ و دزە و حەز ناکات خەڵکانی وەکو من لێرە بن بۆ ئەوەی دەستەکەی ئاشکرا نەبێت.

هەرواش بوو، محەمەد ئەمین لە کارەکەی دەرکرا و دوای ماوەیەکی کەم یەکێک لە ئەندامانی خێزانی بەڕێوبەر شوێنی گرتەوە. ئەم فەرمانبەرە تازەیە تاوانبارێکی ڕاستەقینە و پرۆفیشنال بوو، مانگای مردارەوەبووی سەردەبڕی و زیندانییەکانی ناچار دەکرد کە گۆشتەکەی بکڕن، هەر زیندانییەکیش گۆشتەکەی نەکڕیایە ئەوە تێرو پڕ سوکایەتی پێدەکرا. من خۆم هەرگیز ئەو گۆشتەم نەدەکڕی ئەگەر بەهۆی یەکێک لە پاسەوانەکانەوە بمزانییا خراپە. لەگەڵ پاسەوانەکاندا

پەرلەیەکم دانابوو، ئەگەر بە دەنگی بەرز بیگوتبا کە گۆشتی ئەمڕۆ زۆر خۆش و جوانە، ئەوە واتای ئەوە بوو کە گۆشتەکە خراپە. وێڕای ئەوانەی کە بۆتان دەگێڕمەوە، رادیۆی دەنگی کوردستان لەژێر هەڕەشەو فشاردا تۆماری دەنگیی وەردەگرت گوایە بەندکراوەکان باشترین مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت و باشترین جۆری خواردنیان پێدەدرێت. کاتێک گوێبیستی ئەو شتانە دەبووم لە رادیۆ دەنگی کوردستان، لەبەرخۆمەوە پێکەنینم دەهات!

لە کاتی بۆردومانکردنی هەندێ ناوچەی کوردستان لەلایەن فڕۆکە عێراقییەکانەوە، هەندێ فڕۆکە خرانە خوارەوە و چەند فڕۆکەوانێک بەدیل گیران و لە ژێر ئەشکەنجەدا کوژران. کاتێک بارزانی لەوە ئاگادار کرایەوە فەرمانی کرد کە هیچ کەس فڕۆکەوان نەکوژێت و بە زیندوویی بیانهێڵنەوە بۆ پروپاگەندە. یەکێک لەو فڕۆکەوانانەی کە بە دیل گیرابوو ناوی شەلال بوو، فڕۆکەکەی بە رۆکێتی ئەمەریکی (هۆک) خرابووە خوارەوەو ئەویش ناچار بە پەڕەشوت خۆی فڕێدابووە خوارێ و لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی شۆڕش دەستگیر کرابوو، ئەو نەکوژرا وەکو هاوڕێیەکی پێش خۆی کە کوشتیان و لە ناوپردان ناشتیان دوایی گوتیان لەناو فڕۆکەکەیدا سوتاوە. کاتێ شەلال دەستگیر کرا، هەر لەگەڵ گەیشتنی بە زیندانی خەلان، کۆمەڵێک پەیامنێری بێگانە چاوەڕێیان دەکرد، کە سەر بە ئاژانسەکانی ئەڵمانیای

خۆرئـاواو فەرەنسـا و ئێـران بـوون. چەند وێنەیەکیـان گـرت و خستیانە ناو ژوورێکی تاکە کەسی و دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا، ئیتر لە ژێر ئەشکەنجەو ئازارو هەڕەشەکردنی بە گولە باران کـردن، چەنـدین زانیـاری مەترسـیداری درکانـد. دوای ئەو هەموو مامەڵە خراپە لە گەڵیدا ناچاریانکرد لە تۆمارێکی دەنگیدا بڵێـت کە ئەو زۆر باشـەو زۆر ئاسـودەیە لە زینـدان و باشـترین مـامەڵەی لەگەڵـدا دەکرێـت، بەڵام لە راسـتیدا ئەمە هەمـووی بە پێچەوانەوە بوو.

زۆرێـک لە بەنـدییەکان لەسـەر ئـالودەبوون بە خـواردنەوەی مەی لەسەر شەقامەکان دەستگیرکرابوون. خواردنەوەی مەی لە تـــوێژە هەژارەکـــان قەدەغە کرابـــوو، لە کاتێکـــدا کە مـــاڵی سەرکردەکان پڕبوو لە باشترین جۆری خواردنەوەی ئەلکهولی. هەنـدێ لە دەستوپەیوەندەکانی ئیـدریس و مەسـعودم دەبینـی بە ئاشکرا و لەبەرچاوی خەڵکەوە و لە سـەر شـەقامە گشتییەکان لە قەسرێ و حاجی ئۆمەران دەیانخواردەوە. پاسـەوانەکانی ئیدریس بە شـــەو دەیـانخواردەوە و دواتـر دەبـوو بە شـــەڕیان، هەنـدێ جـاریش لە گونـدەکانی دەوروبەر بەدوای ژنـانەوە بـوون هەتـا بەیانی.

کـردەوەی بەدڕەوشـتی زۆریـان ئەنجـام دەدا. بەچـاوی خـۆم دەمبینـی لە بارەگـای بـارزانی ئەلکهولیـان دەخـواردەوە، چەنـدین جـار داوایـان لە مـن دەکـرد لە گەڵیانـدا بخـۆمەوە، بەڵام داوای

لیبوردنم دەکرد و دەمگوت من هەرگیز ئەلکهول ناخۆمەوە. مادام باسی خواردنەوەی ئەلکهول دەکەین، دەکرێت بارزانی و ئیدریسی کوڕی پرسیار لە بەڕێوبەری زیندانەکە بکەن کە داخۆ خواردنەوەی ئەلکهول بڵاو بوو یان نا؟ ئەمە جگە لەوەی کە چەندین کاری تری بێڕەوشتانەیان دەکرد لە کاتی ئێشککرتندا.

ڕۆژێک لە ڕۆژان، یەکێک لە پاسەوانەکانی زیندان بەناوی صباح، خۆی بۆی گێڕامەوە کە ئەو دەستدرێژی سێکسی کردۆتە سەر یەکێک لە هاوپیشەکانی خۆی لە پاسەوانەکان، لە ناو نوسینگەی بەڕێوبەری زیندان. من لەبەردەم خودا و مێژوو شایەتی دەدەم، کە دەسەڵاتی باڵای ناوچەکە تەنها کۆمەڵێک چەتەو تاوانبارو لادەری ئەخلاقی بوون. پاسەوانەکان دەچوون بۆ شوێنکەوتنی کچان و ژنان، ئەوانەی کە مێردەکانیان لە بەرەکانی شەڕ بوون بۆ بەرگریکردن لە شۆڕش و شەرەفی کوردستان، کەچی لەملاوە شەرەفی ئەو پێشمەرگە جوامێرە لە ژێر ڕەحمەتی هەواڵگری و پاسەوانەکانی هەندێ لە بەرپرسە گەورەکاندا بوو. ئەگەر کچێک یاخود ژنێک قایل نەبوایە لەگەڵ ئەو تاوانبارانەدا بوایە، ئەوە کۆمەڵێک ڕاپۆرتی درۆیان لەسەر بەرز دەکرایەوە و تۆمەتباریان دەکرد بەوەی کە جاسوس و بەکرێگیراوی حکومەتی عێراقە و دواتریش مێردەکەی یاخود برا داماوەکەی بە بەعسی بوون یاخود شوێعی بوون تۆمەتبار دەکرا، لە کاتێکدا ئەو بە گیانی خۆی بەرگری لە خاکی کوردستان و

شەرەفی دەکرد. ئەمانە ئەو شێوازە تیرۆرستییانە بوون کە لە ناو ئەوەی پێیان دەگوت شۆڕش پەیڕەویان دەکرد. پڕوپوچیی هەندێ لەو خەڵکانە گەیشتبووە ئاستێک کە لە هیچ نەریتێکی ئەخلاقیدا پەسەند نەبوو، بۆ نمونە ئەنجامدانی کردەوەی بێڕەوشتی لەگەڵ مانگادا، کاتێک بەمەیان زانی مەسەلەکەیان پەردەپۆش کرد و فەرمانیاندا بە سەربڕینی مانگاکەو فرۆشتنی گۆشتەکەی بە زیندانییەکان بە فەرمانی بەڕێوبەری زیندان. بابەتەکەیان بە جۆرێک داپۆشی وەک ئەوەی هیچ شتێک نەبووبێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی کەسەکە سەربەخۆیان بوو سزادان نەیدەگرتەوە.

ڕۆژێک لە دەمەو بەیاندا دوای ئەوەی دەموچاوم شوشت، دەگەڕامەوە بۆ ژوورەکەم. یەکێک لە پاسەوانەکان بەجۆرێک پاڵی پێوە نام کە هیچ چاوەڕێم نەدەکرد. پێمگوت تۆ شەرم لەو کارەت ناکەیت؟ کەمێک ئەدەبت هەبێ. ئیتر ئەویش دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی کێشا بە دەموچاومدا کە زۆر بە ئازار بوو. شێت و دەهری بووم، خوێن گرتمی و گوتم مرۆڤ تەنها یەک جار دەمرێت، پەلامارمدا بۆ ئەوەی تۆڵەی لێبکەمەوە، جلو بەرگیم دامالی و خستمە سەر زەوی و لێمدا، لە ناو ئازار دەستی بە هاوارکرد و پاسەوانەکان کۆبوونەوە بۆ هاوکاریکردنی هاوڕێکەیان. ئیتر بەهەموویانەوە تێمبەربوون و کەوتنە لێدانم. دەیانکێشا بە سەر و پشت و قاچ و هەموو ئازای گیانم، بە قۆناغە تفەنگ زۆر بە توندی لێیاندەدام. ئەوەندەیان لێدام ئیتر توانای

هەستانم نەما. قاچی راستم زۆر ئازاری هەبوو، شکاندبوویان. سەرۆکی پاسەوانەکان هات و داوای لە هەندێ لەو زیندانیانە کرد کە لە نانەواخانەکە کاریان دەکرد بێن بە لامەوە. یارمەتییاندام و هەڵیانگرتم و بردیانمە ناو جێگاکەم. لە ئازاردا دەمناڵاند ئەوەندەیان لێدابووم. دوای ئەوە بەڕێوبەری زیندانەکە هات و بەبێ لێپێچینەوە و پرسیارکردنی ئەوەی کە چی بووە، دەرگای ژوورەکەی لەدوای خۆیەوە داخست و دەیگوت: کوڕی قەحپە تۆ خۆت بەچی ئەزانی پەلاماری پاسەوان دەدەیت و جنێو بە سەرکردایەتی شۆرش دەدەیت. دەرگاکەی بە توندی داخست و بەتەنها بەجێی هێشتم دوای ئەوەی هەرچی جنێوی ساردوسوک هەیە لە مندا بەتاڵی کردووە، بەبێ ئەوەی کەسێک رەوانە بکات بۆ چارەسەرکردنم. ئاوم گەرم دەکرد و قاچم دەخستە ناوی و ئەمشێلا. بیست و پێنج رۆژ بەو جۆرە لەناو جێگادا مامەوە، ئیتر بە هەوڵێکی زۆر دەمتوانی کەمێک هەستم و بە پێوە بوەستم. هەوڵمدا بە گۆچان کەمە کەمە بڕۆم بە ڕێگادا، بەڵام هەستم بە ئازارێکی توند دەکرد. سێ مانگی رەبەق توانای رۆشتنم نەبوو، نەمدەتوانی تەوالێت و حەمام بکەم، پارەم دەدا بە یەکێک لە کارگوزارەکانی زیندان بۆ ئەوەی خۆڵم بۆ فڕێبدات، بە شەلە شەل دەمتوانی بڕۆم بە ڕێگادا.

چارەسەری پزیشکیم وەرنەگرت هەتا لە زیندان دەرچووم و گەڕامەوە بۆ لوبنان. لەوێ چووم بۆ لای دکتۆرێک، بە تیشک

وێنەی قاچی گرتم، دەرکەوت کە شکاوە، لە ئاکامی ئەو لێدانەی کە لە زیندان دووچارم بوو، خوێن لە نێو دەمارەکاندا وشک ببوو، لە ژێر ئەژنۆم ئاو کۆببۆوە، دوای ئەوەی هەندێ چارەسەرم وەرگرت تاڕادەیک باش بووم.

بە درێژایی ماوەی زیندان ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆرم نۆشی. هەمیشە بە بەڕێوبەری زیندانەکە و هەموو بەرپرسانی دەسەلاتداری حزبەکەم دەگوت: ئەگەر لە چارەنوسمدا مابێت بە زیندوویی بمێنمەوە و بە سەلامەتی بگەمەوە لوبنان، ئەوا لەبەردەم رایگشتی رسواتان دەکەم و کردەوە بەربەرییەکانتان لەبەرامبەر ئازادیخوازان و هەژاران و خەباتگێڕانی شەرەفمەند ئاشکرا دەکەم، هەمیشە وەڵامیان دەدامەوە و دەیانگوت: پێتوایە دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ لوبنان و بە ئارەزووی خۆت لەسەرمان بنوسیت؟ ئەوە جگە لە وەهم و خەیاڵ هیچی تر نیە.

هەندێ لە بەرپرسان، بە تایبەت ئەوانەی کە پەیوەندی برایانە و دۆستانەم لەگەڵیاندا هەبوو، دەهاتن بۆ زیندان، بەبێ ئەوەی کەسیان بوێریی ئەوەی هەبێت هەواڵی من بپرسێت، لەوانەش عەلی شەنگالی و شەمسەدین موفتی و فارس باوەو چەندانی تر.

### بەدەستهێنانەوەی ئازادی

لە ئازاری ١٩٧٥ دا، شەڕ لە نێوان شۆڕشگێڕانی کورد و سوپای عێراق، لەو پەڕی سەختیدا بوو، فڕۆکە عێراقییەکان بێ

بەزەییانە بۆمبی ناپاڵمیان بەکاردەهێنا، تەڕو وشکی پێکەوە دەسوتاند. بەهۆی خەستی بۆمبارانەوە دەیان کەس دەکوژران. جگە لەو بریندارانەی کە لە گەلاڵە و چۆمانەوە دەگوێزرانەوە و دەبرانە نەخۆشخانەکانی ئێران، دوای ئەوەی نەخۆشخانەکانی شۆڕش پڕببون لە بریندارو پەککەوتە.

هەندێجار دادوەرەکانی لێکۆڵینەوە و سەرۆکی دادگان دەهاتن بۆ سەردانی زیندانەکان. هەر یەکە لەوانە کۆمەڵێک پاسەوانی تایبەت بە خۆی لەگەڵدا بوو، تەماشایان دەکرد، وەک ئەوەی لە باخچەی ئاژەلاندا بن. خۆم شایەتحاڵی ئەوە بووم کە ژوورەکان سیخناخ کرابوون و دەیان زیندانی لەسەر یەک دەخەوتن. کاتێک دەرگاکانیان دەکردەوە بۆ گەنێکی زۆر ناخۆش وەک بۆنی شتی گەنیو دەهاتە دەرەوە. حاکمەکان بە دەستیان لوتی خۆیان دەگرت و دەگەڕانەوە بۆ دوواوە. گوێم لە هاواری زیندانییەکان دەبوو، دەقروسکانەوەو دەیانگوت: لە خوا بترسن، رزگارمانکەن لەم حاڵە. حاکمەکان پێدەکەنین وەک پێکەنینی تاوانبارانی جەنگ. کە دەگەیشتنە ژووری زیندانیی من، یەکێکیان هاواری دەکرد: کێ لەم ژوورەیە؟ بەڕێوبەری زیندان وەلامی دەدایەوە: کەسێکە بەناوی جەمیل مەحو. لەو دیو دەرگاکەوە گوێم لێیان دەبوو چییان دەگوت. دادوەر پرسیاری لە بەڕێوبەری زیندان دەکرد: بۆچی کاک جەمیل لێرە گیراوە؟ بەچی تۆمەتێک دەستگیر کراوە؟ بەڕێوبەری زیندانەکە دەیگوت: هیچ کەس نازانێت لەسەر چی

گیراوە. تەنها شتێک کە دەیزانین ئەوەیە، کە ئەو لێرە بە فەرمانی مەلا مستەفا دەستگیر کراوە. هیچ کەسێک لە ترسانا نەیدەوێرا سڵاویشم لێبکات.

تاکە کەسێک لە زیندانەکەدا سڵاوی لێدەکردم لێکۆڵیارێک بوو بەناوی فاروق، پێشتریش یەکترمان نەناسی بوو، ئەو تاکە کەس بوو کە مرۆڤایەتی و بەزەیی هەبوو. بە ڕێگای تایبەتی خۆم و بەهۆی ئەو کەسانەی کە ماوەی زیندانیکردنیان تەواو دەبوو، یاخود لە ڕێگای ئەو پاسەوانانەی زیندان کە متمانەم پێیان بوو، بە نهێنی ٩٦ نامەم نارد بۆ لوبنان. زۆر جاریش ئەو زیندانییانەی کە ماوەی زیندانییان تەواو دەکرد و ئازاد دەکران زۆر بە وردی دەپشکنران.

جارێکیان نامەیەکی منیان بە یەکێک لەو زیندانییانە گرت، کە بۆ بەیروتم ناردبوو، لەو کاتە بەدواوە چاودێری لەسەرم توند کرایەوە، بۆ ئەوەی بە بەڵگەی تاوانەوە بمگرن، بۆیە هەتا دوو مانگ خرامە ژێر چاودێری وردەوە و سەرەنجام نەیانتوانی بگەنە هیچ دەرەنجامێک کە بیسەلمێنێت من پەیوەندیم بە کەسێکی دەرەوەی زیندان هەبێت. دواجار پەنام برد بۆ فێڵێک، ئەویش ئەوە بوو کە هەر پاسەوانێکم بە تەنها دەبینی لە گەڵیدا ڕێکدەکەوتم کە لە ڕێگای ئێرانەوە نامەکانم بۆ پۆست بکات.

چەند نامەیەکیشم بۆ مەلا مستەفا و ئیدریس ناردبوو، دیدو بۆچوونی خۆمم سەبارەت بە بارودۆخی کوردستان و

مەترسیبوونی دەستوەردانیان لە کاروباری خەڵکانی تر لە دەرەوەی عێراق و لێکەوتە خراپەکانیانم بۆ باس دەکردن، هەروەها پێمدەگوتن کە مانەوەی من بەو جۆرە لە بەرژەوەندی شۆڕش و مەسەلەی کورددا نییە.

بەر لە ڕێککەوتنی جەزائیر لە ٦ی ئازاری ١٩٧٥ لە نێوان حکومەتی عێراق و حکومەتی ئێران مۆربکرێت، بەڕێوبەری زیندان هات بۆ لام و بەوپەڕی ڕێز و بە دەنگێکی نزم و لەسەرخۆ قسەی لەگەڵدا دەکردم، کە ئەمەش پێشتر وا نەبوو، پێیگوتم: کاک جەمیل شۆڕش کۆتایی هاتووە و پێشمەرگە بەجاریێ رووخاوە، جا نازانم تۆ بیرمەندیت یان چیت کە نامەت بۆ بارزانی دەنارد و بەوپەڕی بوێری و راستگۆیی پێتدەگوت کە سیاسەتەکانتان هەڵەیە، ئێستا دەزانم تۆ کەسێکی زیرەکیت و پسپۆڕیت لە سیاسەتی نێودەوڵەتی.

کاتێک ڕێککەوتن لە نێوان سەدام حسێن و شای ئێران لە جەزائر مۆرکرا، بە بەڕێوبەری زیندانەکەم گوت، شۆڕش کۆتایی هات و سەرکردەکانیش یان خۆیان رادەستی عێراق دەکەن، یاخود هەڵدێن بۆ ئێران، پێی گوتم ئەوە هەڵەیە و راست نییە، ئەگەر ئێران هاوکارییەکانی خۆی رابگرێت ئەوە چین یارمەتیمان دەدات.

رۆژی ١٥ی ئازار زیاتر لە سەد کەس ئازاد کران، کە حوکمی ئیعدامیان لەسەر بوو. لە رۆژی ٢٠ی ئازارهیچ پاسەوانێک

لەبەردەم ژوورەکەمدا نەمابوو، وەکو پیشەی هەموو جارێک بانگی کارگوزاری ناو زیندانەکەم کرد بۆ ئەوەی تێمگەیەنێت چی بووە، چەند جارێک هاوارم کرد، تا سەرەنجام یەکێک لە پاسەوانەکان هات. پێمگوت دەنگوباس چییە؟ گوتی لە زیندانەکە تەنها دوو پاسەوان ماون ئەوانی تر هەموویان لەگەڵ خێزانەکانیاندا بەرەو ئێران هەڵهاتوون، دوای ئەوەی کە شۆڕش هەرەسی هێناوە. لە ٢١ی ئازار بۆ هەمیشە دەرگای زیندانەکەم کرایەوە و ئازادیم بەدەست هێنایەوە. لەبەردەم دەرگاکەدا دانیشتبووم بە چاوەکانی خۆم دەمبینی کە چۆن بەندکراوان لە ژووری زیندانەکانەوە دەهاتنە دەرەوە و نیشانەکانی کامەرانی و خۆشحاڵی لە سیمایاندا دەبینرا. کلاشنکۆف و دەمانچەی مارتینام دەبینی کە فڕە درابوونە سەر زەوی و هیچ نرخێکیان نەبوو. کاتێ هەموو زیندانەکان چوونە دەرەوە، خۆم و پاسەوانێک بە تەنها ماینەوە کە خزمی بەڕێوبەری زیندانەکە بوو. پێمگوت بۆچی تەلەفۆن ناکەیت بۆ بارەگای بارزانی و بزانیت چارەنوسم چییە؟ گوتی راست دەکەیت. تەلەفۆنی کرد و گوتیان کاتژمێر چوار وەڵامتان دەدەینەوە.

کە بوو بە کاتژمێر چوار، بەڕێوبەری زیندان هات بۆ لام و گوتی هەستە، پێمگوت بۆ کوێ؟ گوتی ئۆتۆمبیلێکیان ناردووە بۆت. کەلوپەلەکانی خۆم کۆکردەوە و لە زیندانی خەلان لە دەرگا گەورەکەیەوە هاتمە دەرەوەو سواری ئۆتۆمبیلەکە بووم.

سوپاس بۆ خوا کە رزگارم بوو، بە ئۆتۆمبیلەکە لەگەڵ بەڕێوبەری زیندان ریگایەکمان گرتە بەر بەرەو گوندی زینۆ. لەوێ فرانسوا هەریری سەرۆکی دەزگای هەواڵگری شۆڕش لەسەر رێگا گشتییەکە چاوەڕێم بوو. لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزیم و بەرەو فرانسوا هەریری رۆیشتم. تەوقەم لەگەڵدا کرد و دەستی خستە سەر شانم و گوتی: کاک جەمیل مەلا مستەفا بارزانی سڵاوی هەیە بۆت و پێت دەڵێت شۆڕش تەواو بوو، چۆن ئەتەوێت و بە کوێدا دەتەوێت بڕۆیتەوە بۆ بەیروت ئێمە هاوکاریت دەکەین.

لێرەدا دەمویست شتێک بڵێم کە زۆر مەترسیدارە. کەمێک بەر لەوەی زیندانەکە جێبهێڵم، بیستم ژمارەیەکی زۆر لە تێکۆشەرانی کورد لە ناو زیندانی رایات گوڵە باران کراون، بەر لەوەی بیانکوژن پێیان گوتوون؛ دەتانەوێت بۆ کوێ بڕۆن؟ بۆ عێراق یان بۆ ئێران؟ ئەوەی گوتبووی بۆ عێراق، چارەنوسی چەند گولەیەکی کلاشنکۆف بووە، کە هەر لەوێدا کۆتاییان بە ژیانیان هێناوە.

کاتێ فرانسوا هەریری پێی گوتم بۆ کوێ دەتەوێت بڕۆیت، پێمگوت بۆ ئەو شوێنە دەچم کە مەلا مستەفا بۆی دەچێت. لەو کاتەدا فرانسوا لە شوێنی خۆیدا کەمێک وشک بوو، بیری دەکردەوە ئینجا بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی: تەنانەت ئەگەر بتەوێت لە رێگای عێراقەوە بڕۆیتەوە بۆ لوبنان ئێمە هاوکاریت دەکەین و دەتنێرین بۆ ئەوێ. پێمگوت: کاک فرانسوا

نامەویت بچم بۆ هیچ لایەک تەنها ئەو شوێنە نەبێت کە بارزانی خۆی بۆم دەستنیشان دەکات. لەو کاتەدا داوای لە شۆفێرەکە کرد بمبات بۆ حاجی ئۆمەران. بەڵام فرانسوا ڕێگایەکی تری گرتە بەر.

بۆ یەکەمجار لە پاش چوارساڵ شاخەکانی کوردستانم بینی، ئاوەدانی، سروشتی جوان، ڕێگای ناو شاخەکان. لە ناو ئۆتۆمبیلەکەدا تەماشای ئەوانەم دەکرد و قافڵەی پێشمەرگەکانم دەبینی لەگەڵ خێزانەکانیاندا، بەپێ بەرەو حاجی ئۆمەران و لە وێشەوە بەرەو ئێران دەڕۆیشتن. دەیان ژنی کوردم دەبینی منداڵەکانیان خستبووە سەر شانیان، بە دەست ئاماژەیان بۆ ئۆتۆمبیل دەکرد بۆ ئەوەی سواریان بکات، بەڵام بێهودە بوو. ئەمانە نموونەی کارەساتەکانی شۆڕشی کورد بوون.

گەیشتینە حاجی ئۆمەران، لە نزیک بنکەیەکی تەلەفۆن وەستاین بۆ ئەوەی شۆفێرەکە بە تەلەفۆن بە مەسعود بڵێت کە جەمیل مەحۆی لەگەڵدایە، لەوێوە ڕێگاکەمان بەرەو ناوەندی هەواڵگری گرتە بەر. عەبدول موهەیمەن بارزانیم بینی، کەسێکی تری لەگەڵدا بوو بەناوی فاروق، وەکو دواتر زانیم بەرپرسی گواستنەوەی پێشمەرگە بوو بۆ ئێران.

پێنج ڕۆژ لە حاجی ئۆمەران مامەوە، لەبەر دەرگایەکدا لەسەرجادەکە دەخەوتم، چونکە لەناو ژوورەکاندا هیچ جێگە نەبوو. لە دەرەوە لەسەر جادەکە کەسێک لەگەڵمدا دەخەوت نازناوی مارشاڵ بوو، پیاوێکی شیرین بوو کردەوەی نامۆ، شێت

یاخود نیوە شێت بوو. لایتێکی لاکێشەیی بەدەستەوە بوو، دەیخستە سەر گوێچکەی و بە هێزو توانای خۆی هاواری دەکرد: ئەلۆ تاران من مارشاڵی ئاسمانیم، ئێستا لە حاجی ئۆمەرانم، هەر ئێستا فڕۆکەیەکی تایبەت رەوانە بکەن. پێشمەرگەیەک بە دزییەوە، بۆ ئەوەی مارشاڵ هەستی پێنەکات وەڵامی دەدایەوە. ئیتر هەموان بەم دیمەنە خۆش و گاڵتانە پێدەکەنین.

بە رۆژا لەسەر شەقامەکان دەگەڕام، سەدان پێشمەرگەم دەبینی لەناو لۆری ئێراندا بوون، لە حاجی ئۆمەرانەوە دەگوازرانەوە بۆ دیوی ئێران، لەوێشەوە چەکەکانیان رادەستی ئەفسەرە ئێرانییەکان دەکرد. دەیان دانە لۆری نۆرەیان گرتبوو بۆ ئەوەی ئاودیوی سنوربن و پێشمەرگە و تفەنگەکانیان بگوێزنەوە، یان ماڵی ئەو کەسانە بار بکەن کە دەیانویست بەرەو ئێران کۆچ بکەن. هەندێکی تریش لە لۆرییەکان چەکە قورسەکانی وەک تۆپی دوور هاوێژ و گولە پرژێنی هەڵگرتبوو کە ئێران دابوونی بە شۆڕشگێڕە کوردەکان بۆ ئەوەی بەرامبەر بە سوپای عێراق بەکاری بێنن. بە چاوی خۆم دەمبینی کە تفەنگ فڕێدرابووە سەر زەوی و هەندێ لە فرۆشیاران هاواریان دەکرد: دەمانچەی چواردەخۆر بە دوو دینار، کلاشنکۆف بە دوو دینارو نیو. هیچ کەس بایەخی بۆ هیچ شتێک نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت بەر لە کۆتایی هاتنی وادەی پێدراو کە هەتا کۆتایی مانگی ئازار بوو،

رابکات بۆ ئێران و خۆی دەرباز بکات. کامیرایەکم پێ نەبوو هەندێ وێنەی ئەو دیمەنە دڵ تەزێنانە بگرم.

لە ٢٤ی ئازار بۆ یەکەمجار لەدوای زیندانیکردنمەوە مەسعود بارزانیم لە بارەگای خۆی، بە تەنها و لە نانەدینەکەدا لە حاجی ئۆمەران بۆ ماوەی چارەکێک بینی. پێیگوتم تۆ برامانیت هەر شتێکمان لێداوا بکەیت بۆتی جێبەجێ دەکەین. سەربارى ئەوەی زۆر بە نەرمونیانی و جوانی قسەی لەگەڵدا کردم، بەڵام من هیچ ئاسودە نەبووم بە قسەکانی و باوەڕم پێنەدەکرد، چونکە زۆرم لەو جۆرە قسە شیرینانە لێبیستبوو.

کە گەڕامەوە بۆ ژوورەوە پرسیاریان لێدەکردم کە مەسعود باسی چی لەگەڵدا کردوم، منیش لەوەڵامدا دەمگوت کە وتویەتی بەمزوانە ئازادت دەکەین، ئەوانیش بە منیان دەگوت سەرکەوتوو بیت، چونکە متمانەیان بەوە نەبوو کە پێی گوتبووم، سووربوون لەسەر کوشتنم ئەوەم لە خۆیانەوە زانی. لە رۆژی ٢٦ی ئازار تەنها خۆم لە حاجی ئۆمەران مابوومەوە و هەموو پێشمەرگەو پاسەوانەکان رۆیشتبوون، هەموویان رایانکردبوو بۆ ئێران. ئەو ژوورەی کە تیایدا دەنوستم بە کلیل دایانخستبوو، خۆم و کەلوپەلەکانم لەسەر زەوی بووین. هەموو گوندی حاجی ئۆمەران سێ چەکداری تیا مابوو. چووم بۆ لایان و لەگەڵیاندا وەستام. پیرەژنێک کە ژنێکی تری بە منداڵێکی بچوکەوە لەگەڵدا بوو هاتن. کەسێکی خزمی خۆیان لەگەڵدا بوو کە لەگەڵ خۆمدا لە زیندانی

خەلان بوو ناوی سەعید بوو، لە لایەنگرانی فاخر بوو، ئەو دەگریا و ژنەکانیش قژی خۆیان دەرنی. لە پاسەوانەکانم پرسی ئەو ژنانە کێن بۆچی بەو جۆرە دەگرین؟ یەکێکیان وەڵامی دامەوەو گوتی: کاک جەمیل پرسیاری هیچ شتێک مەکە با جارێکی تریش نەکەویتەوە ناو تەڵە، باشتر وایە بێدەنگ بیت و هیچ قسە نەکەیت، ئەوە بۆ خۆت باشترە، ئینجا هەر خۆی پێی گوتم: ئەو پیرەژنە دایکی فاخر مێرگەسۆرییە، ئەو ژنەشی کە لەگەڵیدایە هاوژینی جەوهەر ئاغای برای فاخرە. دوو رۆژە فاخر و جەوهەر دیار نەماون و هیچ کەس نازانێت چییان بەسەردا هاتووە. کە گوێم لەو قسانە بوو زۆر غەمبار بووم بۆ ئەو دیمەنانە، دڵم لە خەفەتا هەڵدەقرچا بۆ جەوهەرو فاخر، چونکە دڵسۆزترین هاوڕێ بوون لەناو هەموو ئەوانەی کە لە ژیانمدا ناسیبوومن.

ئەو رێگایەم گرتە بەر کە بەرەو سنوری ئێران دەڕۆیشت، لە دڵی خۆمدا دەمگوت خۆزگە کەسێکم لە بارزانییەکان دەبینی بۆ ئەوەی لەسەر چارەنوسی من قسەیەک لە گەڵ مەسعود بارزانی بکات. کەلوپەلەکانم لەو ناوە بەجێهێشت و چەند کیلۆمەترێک رۆیشتم، ئۆتۆمبیلێکی ئێرانیم بینی لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی ئێرانی کە عەبدول موهەیمەنیان لەگەڵدا بوو، دەهاتن بۆ حاجی ئۆمەران. کە منی بینی گوتی: چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟ پێمگوت هیچ کەسێکی لێنەماوە تەنها من نەبێت. داوای لێکردم سەرکەوم لەگەڵیاندا، گەڕاینەوە بۆ حاجی ئۆمەران، کەلوپەلەکانم لە شوێنی

خۆیاندا مابوون و ژنەکانیش لەبەردەم بارەگای حاجی ئۆمەران دەگریان. عەبدول موهەیمەن چوو بۆلای ژنەکان بزانێت بۆچی دەگرین، ئەوانیش تکایان لێکرد دەنگیان بگەیەنێت بە بارزانی و فەرمان بکات کوڕو مێردەکەیان فاخرو جەوهەر و ئەوانیتر ئازاد بکەن. من هەر لە دوورەوە وەستام بۆ ئەوەی عەبدول موهەیمەن نەزانێت کە پێشتر من ئەوانم ناسیوە. کەلوپەلەکانی خۆم هەڵگرت و خستمە ناو ئۆتۆمبیلەکەی عەبدول موهەیمەن بارزانی لەگەڵیدا ڕۆشتم بەرەو ئێران. ڕێگایەکمان بەرەو لوتکەی یەکێک لە شاخەکان گرتەبەر کە هاوسنوری ئێران بوو. گەیشتینە ئەوێ تەماشام کرد سەرانی شۆڕش و هەموو بەرپرسەکانی دەزگای هەواڵگری لەوێ دەبینم، کە تیپێک لە ئەفسەرانی سوپای ئێرانیان لە گەڵدا بوو. ئەمە ئەو خاڵە بوو لەناو خاکی کوردستان کە بۆیان هەبوو تیایدا کۆببنەوە. لەوێ دەیان ئۆتۆمبیلی سەربازی چاوەڕێی دەکردن.

دابەزیم و چوومە ژوورەوە، مەسعود بارزانی و دکتۆر مەحمود عوسمان و سامی عەبدول رەحمان لەسەرکردەکانی مەکتەبی سیاسی پارتی لەوێ بوون، لەگەڵ پتر لە پەنجا کەسی ترلە یاریدەدەرو پیاوانی دەزگای هەواڵگریی شۆڕش، خۆیان ئامادە دەکرد بۆ پەڕینەوە بۆ ناو سنوری ئێران. گوێم لێیان بوو گفتو گۆیان لەسەر هەندێ شتی پڕوپوچ دەکرد. شێخ حسێنیان لەگەڵدا بوو، ئامرهێزی پێشمەرگە بوو، پێیگوتن: برادەران ئێمە

ئێستا دەچین بۆ ئێران، هەموو شتێک تەواو بووە، ئەگەر کەسێکی پیاوانی هەواڵگری ئێران هات و پرسیاری لێکردن چی وەڵام دەدەنەوە؟ هەمووتان دەبێت بڵێن ئێمە پێشمەرگەی بارزانین و بارزانیش پێشمەرگەی شاهنشای باوکمانە.

لە ٢٦ی ئازاری ١٩٧٥ بینیم کە چۆن سەرانی شۆڕش هەریەکەیان چەکەکەی خۆی رادەستی ئەفسەرە ئێرانییەکان دەکرد و وەکو دیل سواری ئۆتۆمبیلەکانیان دەبوون. هەموویان ریز بە ریز چوونە دەرەوە. هەموومان پێکەوە بووین و پێکەوە دەرچووین. خاکی کوردستانی عێراقمان بەجێهێشت و روومان کردە ئێران. هەموویان وەکو منداڵ دەگریان و هاواریان دەکرد، لەبەر ئەوەی گوایە بەنرخترین و گران بەهاترین شتی ژیانی خۆیان لەدەستداوە، کە ئەویش خاکی کوردستان بوو، بەجێیانهێشت بۆ خەڵکی تر بەهۆی هەرەسی ئەو شۆڕشەی کە تاقمێک خائن و بەکرێگیراو بەڕێیانەوە دەبرد.

بە درێژایی رێگاکە سوپای ئێران و ئەفسەرە ئێرانییەکان لە هەردوو لای شەقامەکە وەستابوون، بە دەستیان ئاماژەی بەخێرهاتنیان بۆ سەرکردایەتی خائنی کورد دەکرد. بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا دەچمە ناو خاکی ئێرانەوە بەبێ پشکنین، بە تایبەت لە نێوان حاجی ئۆمەران و خانە بەهۆی قەرەباڵەغی و زۆری قافڵەی ئۆتۆمبیلەکان کە بەدوای یەکەوە بوون. منیش لەگەڵیاندا دەگریام، بۆ هەرەسی ئەو سەرکردایەتییە گەندەڵە نا، بەڵکو لە داخ و

ئازاری خوێنی هەزاران شەهیدی بێتاوان، کە خوێنیان بە فیڕۆ چوو، بوونە قوربانی پیلانی بەکرێگیراوان و خائینان، بەهۆی هەڵەی تاقمێک لە بەکرێگیراو کە دەسەڵاتی خۆیان بەسەر گەردنی گەلی کوردمانەوە سەپاندبوو.

کە گەیشتینە ناو ئێران تەماشای ئەو شاخە بەرزانەو کێلگەی سەوزو پان و بەرین، پێدەشت و گوندی جوان، چاوەکانم پڕ فرمێسک دەبوون، وەک ژیلەمۆ گەرم دەبوون، دەستم بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە نزام دەکرد: خوایەگیان ئەو خاکە پیرۆزەی کوردان بگەڕێنەرەوە بۆ خاوەنەکانیان کە بەخوێنی خۆیان بەپیت و بەرەکەتیان کردووە، گەلی کوردمان لە ئێران لەژێر دەسەڵاتی ئەم زاڵمە کۆنەپەرستانە رزگار بکە و هەرچوار پارچەی کوردستان یەکبگرنەوەو ئاڵاکەمان بە رەنگە جوانەکانی سەوز و سوورو زەرد و سپی لەسەر لوتکەی ئەو شاخە سەربڵندانە بشەکێتەوەو ئاواتەکانمان لە ئازادی بۆ گەلی کوردمان بەدی بێنیت. ئەمە ئەو نزایانەم بوو لەو ساتەی کە پێم لەسەر خاکی کوردستانی ئێران دانا. کە گەیشتینە شارۆچکەی خانە، پێنج خولەک وەستاین، گوێمان لە هاوارو دەنگە دەنگ بوو. لە ئۆتۆمبیلەکان هاتینە خوارەوە، زۆر سەرمان سوڕما کاتێک بینیمان دەیان پێشمەرگە بەیەکەوە کۆبوونەتەوەو بە لێدان و جنێودان بەر بوونەتە گیانی عەلی عەبدوڵای ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و پێی دەڵێن: ماڵتان وێران

کردین، بەربەدەرتان کردین. ئەویش دەیگوت من چی بکەم گوناهی من نەبوو. دوواجار بە هەوڵێکی زۆر توانرا ئەو داماوە نەفرەتییە لە ژێر دەستی ئەواندا دەرباز بکرێت، ئەویش لە دەستیان هەڵهات و سەری خۆی هەڵگرت.

کە لە شارۆچکەی خانە کەوتینەڕێ بەرەو نەغەدە، دەیان ئۆتۆمبیل بە درێژایی ڕێگاکە بەدوای یەکەوە بوون. ئۆتۆمبیلەکەی مەسعود لە ڕێگا وەستا و بانگی عەبدول موهەیمەن بارزانی کرد و پێی گوت: جەمیل مەحو لەگەڵ خۆتا بەرە بۆ یەکێک لە هۆتێلەکان، ئەویش لە یەکێک لە هۆتێلەکان دایانام و خۆی ڕۆیشت، بەڵام هەستم بەوە کرد کە هێشتا ئازاد نیم و دەستبەسەرم لەو هۆتێلەدا، یەکێک لە پاسەوانەکانی بارزانییان لە هەمان ژوور لەگەڵدا دانابووم. کە لەوە دڵنیا بووم و ڕاستییەکەم بۆ دەرکەوت، لەگەڵ ئەو پاسەوانەدا کەوتمە قسەو پێمگوت: بۆچی تۆ لەگەڵ من لەم ژوورەدایت؟ وەڵامی دایەو گوتی: لە ڕاستیدا کاک جەمیل من ماڵم لە نەغەدەیە، ژن و منداڵەکەم پێش من کەوتوون و ئەوان لێرەن چاوەڕێم دەکەن، بەڵام فەرمانیان بە من کرد کە دەبێت لێرە بم و لەگەڵ تۆدا بم، هۆکارەکەشی نازانم. پێمگوت: من هۆکارەکەی دەزانم.

ئەو کەسە لە هۆتێلەکەدا چەند ڕۆژێک لە گەڵ مندا مایەوە، دوای ئەوە کەسێکی تریان دانا بۆ چاودێریم، هەموو بەیانییەک بە دوامەوە بوو، لە هەرکوێ بوومایەو لە هەر کوێ دانیشتمایە هەر

به دوامەوە بوو، تەنانەت لەسەر مێزەکەی منیش نانی دەخوارد، ئیتر بە تەواوی بێزار بووم لە دەستی. رۆژێکیان لێمپرسی لەناو شۆڕش کارت چی بوو؟ زۆر بە سادەیی پێیگوتم کە سیخوڕی مەسعود بارزانی بووە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و گواستنەوەی بەریند لەناو شارەکانی عێراق و چەند جارێک لە لایەن دەسەڵاتدارانی عێراقەوە دەستگیر کراوە، بەڵام هەموو جارێک ئازاد کراوە.

لەناو هۆتێلەکەدا ماوەیەکی کورتم بەسەر نەبرد بەو جۆرەی کە باسم کرد لە ژێرمانەوەی زۆرەملێ و چاودێری کردنی هەموو جوڵەکانم. بە درێژایی ماوەی مانەوەم لەو هۆتێلەدا هیچ کەسێکم نەدی لەوانەی کە دەمناسین قسەیان لەگەڵدا بکەم، وەکو هەستم دەکرد هەموویان دەترسان قسەم لەگەڵدا بکەن، جگە لەوەش هیچ کەس لە لایەن بارزانییەوە نەهات بۆ هەواڵ پرسینم، ئیتر بڕیارمدا من خۆم بچم بۆ بارەگای بارزانی و لەسەر چارەنوسی خۆم قسەی لەگەڵدا بکەم. کاتێ گەیشتمە بارەگا، تەماشام کرد هەزاران هاوڵاتی و پێشمەرگە لە گۆڕەپانێکی گەورەدا لە ژێر قرچەی هەتاودا راوەستاون و چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی ئیدریس یان مەسعود دەکەن، بۆ ئەوەی ناسۆرییەکانی خۆیانیان پێبگەیەنن، هەروەها سەرنجمدا کە چەند سەربازێکی سوپای ئێران بەچەکەوە پاسەوانی ئەو شوێنانە بوون و دەهاتن و دەچوون و چاودێری جوولەی خەڵکیان دەکرد.

لە پڕێکدا مەسعود سەری لە بارەگاکەوە دەرهێنا، سلاوم لێکرد، وەلامی دامەوە وەک ئەوەی ئەو مەسعودەی جاران نەبێت کە دەمناسی بکوژو ببڕ هەر خۆی بوو لە ناو شۆڕشدا، ببوو بە مرۆڤێکی زۆر نەرم و نیان و چاک، بە تایبەت کە لەگەل خەلکدا بە نەرم و نیانی و ڕێزەوە قسەی دەکرد، بەلێنم پێدا بەو نزیکانە سەردانی بکەم، هەرواشم کرد، سەردانم کرد لە بارەگا وەک ئەوەی بەلێنم پێدابوو. کە گەیشتمە ئەوێ ئۆتۆمبیلێکم بینی کە حسین حاجۆ و شەفیق جومعەی تێدابوو. بەبەر دەممدا تێپەڕین بەبێ ئەوەی سلاو بکەن، لە دلی خۆمدا گوتم لەوانەیە بترسن بۆیە قسەم لەگەلدا ناکەن، کەچی پاش ساتێک بینیم ئۆتۆمبیلەکە دەگەڕێتەوە بۆ دواوە بەرەو لای من، سەیرم پێهات کە گەڕانەوە، نزیک بوونەوە لێم و هەردووکیان پێکەوە گوتیان تۆ کاک جەمیل مەحو نیت؟ گوتم بەلێ من ئەوم، دەستمان بە قسە کرد، ئیتر هەردووکیان کەوتنە پاساو هێنانەوە و خۆ دزینەوە لە بەرپرسیاریەتی ئەوەی کە لە کاتی بەندیمدا هیچ دەستی یارمەتییان بۆ درێژ نەکردم، بە پاساوی ئەوەی کە لەو مستەفا بەگە ترساون، ژیانی هەموانی وێران کرد و تەنها جاسوسێک نەبێت بەسەرمانەوە هیچی تر نەبوو.

حسێن حاجۆ گوتی: ئەگەر ئاشبەتال نەبوایە چارەنوسی من هەمان چارەنوسی تۆ دەبوو لە زیندانی خەلان، بە درێژی باسی نەکرد بۆ، تەنها وەک ئەوەی بیەوێت بلێ کە مستەفا بەگ

خراپەکاری لەگەڵ هەموو کوردەکانی سوریا و لوبنان کردووە و پیلانی لە هەموویان گێڕاوە.

پێمڕاگەیاند کە من مرۆڤێکم لە ژێر چاودێریدام، موچە لە ماڵی بارزانی وەردەگرم و پەیوەندیم بە هیچ کەسێکەوە نیە. درۆم لەگەڵ کرد و پێمگوت ماڵم لە مەهابادە. ئینجا بەڵێنیدا لە هۆتێلەکە سەردانم بکات بەر لەوەی ئێران بەجێبهێڵێت. ئەوانم بەجێهێشت و کەوتمەڕێ بۆ بارەگای بارزانی. گەیشتمە ئەوێ بینیم کە ئیدریس لە نوسینگەی خۆی دێتە دەرەوە. بۆ یەکەمجار لەو کاتەوەی کە خرامە بەندیخانەوە لە ٢٧-٧-١٩٧٣ ئەوە یەکەم جار بوو بینیم. کە منی بینی وەستاوم هات بۆ لام و گوتی: کاک جەمیل مەسعودمان راسپاردووە کار ئاسانی بۆ تۆ بکات. لەو کاتەدا مەسعود لە بارەگا هاتە دەرەوە، هەر کە چاوی بە من کەوت یەکسەر وتی چەندە خەرجیت پێویستە؟ ئینجا گوتی: پارەت چەندە پێویست بێت بۆت دابین دەکەم بۆ ئەوەی بگەڕێیتەوە بۆ بەیروت. ئینجا رۆشت بۆ بارەگای مەلا مستەفا و پێی راگەیاندبوو کە جەمیل ئەیەوێت چاوی پێکەوێت. شێخ بابۆ لەگەڵ هەندی لە میوانەکان دانیشتبوو لەبەردەم خێوەتێکدا، منیش چووم بۆ لای.

لەو کاتەدا مەسعود لەگەڵ مەلا مستەفا هاتنە دەرەوە، مەسعود پێی وت جەمیل چاوەڕوانتە و هاتووە بۆ ئێرە لەگەڵ شێخ بابۆدایە. ویستم کورسییەکی بۆ بێنم لەسەری دانیشێت،

بەلام خۆی پێشمکەوت و کورسییەکی راکێشا و لە نزیکمەوە دانیشت. ئەوە یەکەم جار بوو لە دوای چوار ساڵەوە پێکەوە دانیشین. مەلا مستەفا مێشکی ئاڵۆز بوو، یاری بەو پایپە دەکرد کە بە دەستیەوە بوو، هەندێ لە سەردان کەران دەهاتن و داواکارییان لێدەکرد.

شێخ بابۆ بە یەکێک لەوانەی کە دانیشتبوو ناوی رەشید سندی بوو گوت: جەمیل چوار ساڵ زیندان بوو، ئەزانی؟ گوتی بەڵێ گەورەم. دوای چارەکە سەعاتێک هەرچی لەوێ بوو رۆشتن بەتەنها من و مەلامستەفا و شێخ بابۆی برای ماینەوە. پاسەوانەکان و سەدەها پێشمەرگە لە دووری بیست مەترەوە سەیریان دەکردین، منیان بۆ یەکەمجار دەبینی لەگەڵ مەلا مستەفا لە دوای چوار ساڵ زیندانی. هەموویان بە یەکتریان دەگوت: ئەوەتا ئەوەیە جەمیل مەحۆ. بە مەلام گوت: خۆزگە چوار ساڵی تریش لە زیندانی خەلان بوومایە و گەلی کوردم بەو حاڵە نەبینیایە. مەلا مستەفا گوتی وەرە جەمیل با کەمێک پیاسە بکەین.

ئیتر پێکەوە بە تەنها دەستمان بە گەڕان کرد و باسی چەندەها شتمان کرد، پێمگوت: گەورەم دەمەوێ رزگارم کەیت لەم حاڵە و بگەڕێمەوە بۆ لای کەس و کارو نیشتمانی خۆم، بەر لەوەی دەزگای هەواڵگری ئێران پێمبزانن و دەستگیرم کەن. گوتی: فەرمانم بە مەسعود کردووە، پێمواییێت ئیتر تۆ کارت تەواو بووە. پێمگوت: گەورەم دەزانی بە ناهەق و بەبێ هۆ چوار ساڵ

زینـدان کـرام؟ ئینجـا بـۆم روون کـردەوە کە مسـتەفا بەگ، ئەو سەگە هۆکاری ویران کردنی ژیانی دەیان کوردی بێتاوان بوو، تەنهـا بـۆ ئەوەی وا خـۆی دەرخـات دڵسـۆزی تـۆیە لە کاتێکـدا گەورەتـرین خـائن و نـامەرد بـوو. گـوتی ئێسـتا واز لەوانە بێـنە، تەنهـا یەک شـتم لەتـۆ دەوێـت جەمیـل، بەرامـبەر بەوەش چەنـدە پـارەت دەوێـت پێتـی دەدەم. پێمگـوت: ئەو شـتە چییە گەورەم کە دەتەوێت بۆت بکەم؟ مەلا مستەفا سەری زۆر جەنجاڵ بوو، دوای ساتێک لە بێدەنگی پێی وتـم: ئەگەر بتوانیت عوبێدوڵای کوڕم بـۆ بکوژیـت ئامـادەم چەنـدە پـارەت بوویـت بتـدەمێ. کـاتێ ئەوەم لێبیسـت، موچوڕکە بە هەمـوو گیانمـدا هـات، هـیچ پێشـبینی ئەوەم نەدەکـرد شـتێکی ئـاوا بەرگـوێم کەوێـت. خـودا بـۆ خـۆی شـایەتە لەسـەر ئەوەی کە مـن دەیڵـێم. بەبـێ دەنگـی مـامەوە، هێـزم نەبـوو قسە بکەم هیچ وەڵامێکم نەدایەوە.

دوای ئەوە حەزمکرد بەر لەوەی خاکی ئێران بەجێبهێڵم تەوقە لەگەڵ مەلا مستەفا بکەم و بەوپەڕی بوێرییەوە رای خۆمی پێبڵێم. پێمگـوت: گەورەم تـۆ خەباتـت کـرد و بە درێژایـی تەمەنـت لە پێناوی گەلی کوردا قوربانیتدا بۆ ئەوەی رزگاری بکەیت، کەچی ئەوە سـەرەنجامەکەی بـوو. گەورەم دێـتەوە بیـرت چەنـد جـار پێمدەگوتیت ئەو سەرکردایەتییەی تۆ پشتت پێبەستووە گەندەڵن و هەر خەریکـی پیلانگێـڕانن؟ بەڵام بەداخەوە لە جیـاتی ئەوەی لە خەڵکی گەندەڵ پاکی بکەیتەوە، کەچی دڵسۆزترین کەسی خۆتـت دەستگیرکرد، کەرامەتیان شکاند. ئەگەر پشتت بە دڵسۆزنی خۆت

ببەستایە نەدەگەیشتینە ئەو حاڵە. گوتی: هەڵەکانمان گەورەو زۆرن ناتوانین بە خێرایی چارەسەری بکەین. پتر لە نیو سەعات لە ژێر تیشکی خۆردا قسەمان کرد و سەدان پێشمەرگە سەیریان دەکردین. دواجار ماڵئاوایی لە مەلا مستەفا کرد، ئیتر ئەوە دووا جار بوو مەلا مستەفا ببینم.

زۆر بە جدی بیرم دەکردەوە، بەو پەڕی وردی و ئاگایی، کە چۆن سەفەر بکەم و لە دەستی ئەم پیاوکوژانە خۆم دەرباز بکەم. سەرباری ئەوەی زۆر دڵخۆش و کامەران بووم بەوەی کە ئازاد کرابووم، بەڵام هەر دڵنیا نەبووم، ئیتر پشتم بە خودا بەست و ڕۆیشتم بۆ دیداری مەسعود، پێی گوتم سبەی هەموو شتێکت بۆ مەیسەر بەکەم، بەڵام هیچ سوکنام بەم قسە کورتە نەدەهات. ئەوەش دووا دیدارم بوو لەگەڵ مەسعود. دەربارەی ئێستا و رابووردوو قسەمان کرد، پێمگوت: ئەوەی ئێمەی گەیاندە ئەو دەرەنجامە خیانەتی مستەفا بەگی سوری بوو. باسی رابووردووی ئەو و ڕۆڵە خراپەکانیم کرد، مەسعود وەڵامی دامەوە و گوتی: زۆر سوپاس کاک جەمیل نەماندەزانی کەسێکی وایە ئەو زانیارییانەمان نەبوو لەسەری.

لێرەدا مەسعود چووە ژێر باری ئەوەی کە بەرامبەر بە من هەڵەیەکی زۆر گەورەیان کرد و گوتی: هەڵەی زۆر گەورەمان کردووە، بۆیە گەیشتین بەو دەرەنجامە ناخۆشە. ئینجا پێی گوتم پارەت چەند دەوێت بۆ ئەوەی بگەیتەوە بەیروت؟ ئیتر حسابی

کۆی ڕێگا و مەسرەفمان کرد و لەسەر بڕێک پارە ڕێککەوتین و پێیدام. سوپاسم کرد و گوتی: حەز ئەکەم خزمەتێکم بکەیت زۆر سوپاست دەکەم، پێمگوت فەرموو چیت دەوێت؟ گوتی: کە گەڕایتەوە بەیروت بەیانێکی زۆر توند لە دژی حزبی بەعس دەربکە. نەمزانی هۆکاری ئەو بابەتە چییە، هیچ وەڵامم نەدایەوە، نە بە بەڵێ نە بە نەخێر، ئینجا گوتی: ئەگەر ئەو کارەم بۆ بکەیت تۆ بە گەورەترین دۆستی خۆمان دەزانین.

داوای پاسپۆرت و ناسنامەکەم لێکردەوە، کە چوار ساڵ بوو دەستیان بەسەردا گرتبوو، پێی گوتم: هەرگیز ئاگام لەوە نیە و نازانم، ئینجا گوتی لێرەوە مەچۆ بۆ تاران نەوەکو هەواڵگریی ئێران دەستگیرت بکەن، هەندێ لە پیاوەکانی خۆمت لەگەڵدا دەنێرم بڕۆ بۆ ڕەزائیە –ئورمێ– لەوێ بە فڕۆکە بڕۆ بۆ تاران. ئینجا زۆری لێکردم و گوتی: ئەگەر هەواڵگری ئێران تۆیان دەستگیر کرد نەکەیت و نەخەڵەتابیت بڵێیت من بەندکراو بووم لە زیندانی شۆڕش، بەڵکو پێیان بڵێ من لوبنانیم و پاسپۆرتەکەم ون کردووە لە ئێران. بەو جۆرە ڕێککەوتین و خوا حافیزیم لێکرد و لە چادرەکە چوومە دەرەوە دوای ئەوەی نزیکەی سەعات و چارەکێک قسەمان کرد.

دوای ئەوە هەر لەوێ چاوم بە فرانسوا هەریری و دەیان کەس لە سەرکردەکانی شۆڕش کەوت لە گۆڕەپانەکەدا. مزگێنیم بە هەموویاندا کە ئیتر کێشەکەم تەواو بووە ئەمڕۆ دەچم بۆ

تاران. دەیان پێشمەرگە و هاورێ لێمکۆبوونەوە کە هەموویان سۆزیان بۆم هەبوو، خۆشیان دەویستم، لە سیمایاندا خۆشحاڵی و کامەرانییان پێوە دەبینرا بۆ ئەو هەواڵە خۆشە، لەبەر ئەوەی کەسێک نەبوو باوەڕی بەوە هەبێت کە جەمیل مەحۆ بتوانێت لە چنگی ئەو تاقمە تاوانبارە رزگاری بێت.

لەو کاتەدا چاوم کەوت بە هەندێ لە سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەوانەش دارا تۆفیق عەتار و حەبیب محەمەد کەریم و سامی عەبدول رەحمان و دکتۆر مەحمود عوسمان و عەبدول وەهاب ئەتروشی و فارس باوە و چەندانی تر. هەروەها چاوم کەوت بە بەڕێوبەری زیندان خالد ئەشکە، بە ئامادەبوونی عەبدول وەهاب ئەتروشی، کە پێی گوتم: کاک جەمیل خالد لە زیندان چۆن بوو لەگەڵتا؟ وەڵامم دایەوە: دەبوو کاک خالید بەڕێوبەری ئاژەڵ بێت لە زیندان نەک بەڕێوبەری مرۆڤ لە زیندان.

لەو کاتەدا فرانسوا هەریری بانگی دوو کەسی کرد؛ سەلیم شنگالی و کەسێکی تر بەناوی حەمید، داوای لێکردن لە گەڵما بێن بۆ شاری رەزائیە و لە وێوە تکتی فڕۆکەم بۆ ببڕن بۆ تاران. سەلیم شەنگالی گوتی: خاڵە جەمیل بڕۆ بۆ هۆتێلەکەو کەلوپەلەکانت کۆکەرەوە، منیش هەندێ کارم هەیە تەواویان دەکەم و دێم بۆلات بۆ هۆتێلەکە. رۆیشتمەوە و هەق و حسابی خۆم و ئەو کەسەشم دا کە لە گەڵمدا چاودێر بوو بە سەرمەوە.

دوای سەعاتێک ئۆتۆمبیلێکیان هێناو دوو کەسی سەر بە دەزگای هەواڵگری بارەگای بارزانییان لە گەڵدا بوو. لە گەڵیاندا چووم بۆ رەزائیە، بەپێی ئەو نەخشەیەی کە مەسعود بۆی داڕشتبووم. گەیشتینە رەزائیە و ئۆتۆمبیلەکە لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا وەستا. کەلوپەلەکانیان داگرتم و یەکێک لەوانەی یاوەرم بوو، چوو بۆ نوسینگەیەکی گەشتیاری فڕۆکە بۆ ئەوەی تکتی فڕۆکەم بۆ ببڕێت و گەشتی تاران بکەم. کاتێ داوای تکتمان کرد، فەرمانبەرەکە گوتی کوانێ پاسپۆرتەکەت؟ گوتم لە ماڵەوە بەجێماوە، گوتی بڕۆ بیهێنە، بەڵام لە راستیدا نە پاسپۆرتم هەبوو نە کارتی ناسنامەم پێبوو، مەسعودیش ئەو کارتەی بۆ رێگەپێدانی دەستوپەیوەندەکانی خۆیان دەیانکرد، بۆ منی نەکردبوو، نەمتوانی بە فڕۆکە گەشت بکەم بۆیە کەلوپەلەکانم برد بۆ هۆتێلێک کە تەرخان کرابوو بۆ پێشمەرگە، هەر ئەوەندەی خۆت پیشانی خاوەن هۆتێلەکە بدایە و بتگوتبا کوردی عێراقم، ئەوە بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی دەکردیت، تەنانەت ئەگەر هیچ پاسپۆرت و ناسنامەیەکیشت نەبوایە.

رۆیشتم بۆ هۆتێلەکە و پێمگوتن من کوردی عێراقم و دەمەوێت ئەمشەو لێرە بم، پێشوازییان لێکردم و ژوورێکیان دامێ. راستەخۆ دوای ئەوەی کەلوپەلەکانم دانا لە ژوورەکە، راستەوخۆ رۆیشتم بۆ گۆڕەپانەکە و پرسیاری ئۆتۆمبیلی کرێم کرد بۆ تاران. ئەو دوو کەسەی کە لەگەڵمدا هاتن بۆ رەزائیە، بە

تەنها بەجێیانهێشتم و گوتیان: ئەرکی ئێمە لێرەدا تەواو بوو، خۆت کاری خۆت مەیسەر بکە، ئەگەر دەتەوێت لەگەڵماندا بگەڕێیتەوە بۆ بارەگای بارزانی ئەوە دەتبەینەوە. پێمگوتن: سوپاس ناگەڕێمەوە لەگەڵتاندا ئەگەر دەستگیریش بکرێم لە لایەن دەزگای هەواڵگری ئێرانەوە. خۆم بەشوێن چارەسەرێکدا دەگەڕێم بۆ سەفەری تاران. دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن، کەمێک نیگەران بووم و ئەگەرەکانم لە دڵی خۆمدا لێکدەدایەوە. بە نێو شەقامەکاندا بێئاگا دەڕۆیشتم و لەناو گێژاوی بیرکردنەوەدا بووم. لوقمان بارزانی و هەندێ کەسم بینی یاوەری بوون. کە ئەوم بینی تەنها شتێکی پێگوتم: ڕاکە ڕاکە لێرە مەوەستە، خوا حافیز. ئەمە دووا چاوپێکەوتنم بوو لەگەڵ شێخ لوقمان لە ڕەزائیە.

کە ئەوەم بیست ترس و شڵەژانم زیادی کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم؛ ئەوە پیلانە لە دژم داڕێژراوە بۆ ئەوەی بمکوژن و لە کۆڵ خۆیانم بکەنەوە. بە ناچاری خۆم دایە دەستی خودا و گوتم (لا حول ولا قوة الا بالله) و هانام بۆ ڕەحمی فراوانی خودا دەبرد و ئیتر گوتم چی دەبێت با ببێت. پشتیوان بە خودا ڕۆیشتم و پرسیاری ئۆتۆمبیلی کرێم دەکرد بۆ تاران. بە ڕێکەوت کەسێکی ئێرانیم بینی و پرسیاری نوسینگەی گەشتی تارانم لێکرد، ڕێگای پیشاندام و ئادرەسەکەم وەرگرت و یەکسەر ڕۆیشتم، سەیرمکرد کەسێکی کوردی ئێرانی لەوێ فەرمانبەرە. خۆم وەکو کوردی

عێراقی پێناساند و پێمگوت کە دەمەوێت سەفەری تاران بکەم. پێیگوتم منیش کوردی ئێرانم، کاتژمێر شەشی ئێوارە پاسەکە دەردەچێت، سبەی بەیانی زووش پاسێکی تر هەیە. پێمگوت دەمەوێت ئێستا بڕۆم چونکە پەلەمە. ئیتر تکتی گەشتەکەم بڕی و گەڕامەوە بۆ هۆتێل بۆ کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانم. لە پڕێکا ئەو دوو کەسەم بینی کە لەگەڵمدا هاتبوون، لەناو هۆڵی هۆتێلەکە دانیشتبوون، هیچ خۆیان لەمن نەگەیاند و هاوکارییان نەکردم لە هەڵگرتنی کەلوپەلەکانم، وەک ئەوەی هەر نەمناسن، بەڵام لە کاتە هەستیارەکاندا هەمیشە خەڵکانی مەرد پەیدا دەبن. یەکێک لەو پێشمەرگانەی کە زۆر باش منی دەناسی، لەبەر دەم ئاوێنەکەدا ڕاوەستابوو ریشی دەتاشی، کە منی بینی یەکسەر بەپرتاو بەرەو پیرم هات و پەلاماری کەلوپەلەکانی دام و هەتا دەرگای هۆتێلەکە بۆی هێنام. لەبەردەم دەرگای هۆتێلەکە کارگوزارێکی لێبوو کەلوپەلەکانی بردم بۆ کۆمپانیای گەشتەکە. بە گەیشتنی من پاسەکە کەوتە ڕێ. لەو ساتەدا جۆرجیس فەتحولڵام بینی، بەبەر دەممدا تێدەپەڕی، کەسێکی تریشی لەگەڵدا بوو، ئاوڕی بۆ دامەوەو گوتی: کاک جەمیل بۆ کوێ دەچیت؟ پێمگوت بۆ بەیروت. گوتی پاسپۆرتەکەیان دایتەوە؟ گوتم نەخێر، هیچم پێنیە تەنها پشتیوانی خودام هەیە. پێیگوتم مەترسە بڕۆ پشتیوان بەخودا. ئینجا بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد؛ ئۆتۆمبیلێکم لە بەیروت هەیە، پێمگوت تکایە واز بێنە من چی لە ئۆتۆمبیلی تۆ

بکەم لە بەیروت کە من لێرەم. ئیتر بە خێرایی ڕۆیشت و پاسەکەش لەو کاتەدا کەوتە جوڵە.

سەرکەوتم، کورسییەکەم لە ریزی دواوە بوو، دانیشتم. کەسێکم لەبەر دەمدا بوو خۆم پێناساند، کوردی ئێران بوو. کەسێکی بە خزمەت و ڕێکوپێک دیار بوو، هاوکاری کردم لە کڕینی هەندێ کەلوپەل، فارسی زۆر باش دەزانی. کاتێک کە دەگەیشتینە هەر بنکە و خاڵێکی پشکنین، شۆفێری پاسەکە ناوی گەشتیارەکانی دەبردە بەردەم پیاوانی پۆلیس، ئەوانیش مۆریان دەکرد. لەو کاتەدا دڵم زۆر بە خێرایی لێیدەدا، خورپە بە دڵمدا دەهات و دەمگوت خوایە!

بە زیاتر لە یەک خاڵی پشکنیندا تێپەڕیین، بۆ یەک جاریش هیچ کارمەندێکی پۆلیس و ئاسایش نەهاتنە سەرەوە بۆ ناو پاسەکە، یان هەوڵ بدات لە ناسنامەی گەشتیارەکان دڵنیا بێتەوە، تا گەیشتینە تارانی پایتەختی ئێران.

کاتژمێر دەو نیوی بەیانی بوو، کەلوپەلەکانم لەناو پاسەکە داگرت، ئۆتۆمبیلێکی تاکسیم بانگ کرد بۆ ئەوەی بمبات بۆ باڵیۆزخانەی لوبنان لە تاران. بە شوفێرەکەم گوت: دەزانی باڵیۆزخانەی لوبنان لە کوێیە؟ گوتی بەڵێ. شەقام بە شەقام دەڕۆیشت، بەڵام بێهودە، یەک سەعات بەناو شەقامەکاندا سوڕایەوەو پرسیاری دەکرد، بەڵام سودی نەبوو. لەبەردەم کۆمپانیایەکی گەشتوگوزاردا وەستاین. کەسێکی لوبنانیم بینی

بەرەچەڵەک ئەرمەنی بوو، ناوی جانۆ بوو. گەنجێکی بەڕەوشت بوو، هەستم بە دڵسۆزیی دەکرد، چیرۆکی خۆمم بۆ باس کرد، پێمگوت من غەریبم، ئیتر بارودۆخم تێگەیشت، زانی کە منِ چوار ساڵ زیندان بووم لە گرتووخانەکانی بارزانی. هەستم بە سۆزی مرۆیانە و ئارەزووی راستگۆیانەی کرد بۆ هاوکاری کردنم. پێی گوتم بە گوێی من بکەو برۆ بۆ ماڵی باڵیۆز خۆی و چیرۆکەکەتی بۆ باس بکە، بێگومان هاوکاریت دەکات. پێمگوت نازانم ماڵی باڵیۆز لە کوێیە، گوتی من دەیزانم، ئینجا شۆفێرەکەی ئاشناکرد بە رێگاکەو ئادرەسەکەی پێدا.

دوای نیو سەعات لەبەردەم دەرگای ماڵی باڵیۆزدا بووم، لە دەرگامدا، خزمەتکارێک یەرگای کردەوە و پرسیاری باڵیۆزم لێکرد، گوتی ئەو ئێستا لە ماڵەوە نییە و لە لوبنانە، مۆڵەتی رەسمیی وەرگرتووە. رێنمایی کردم کە بچم بۆ باڵیۆز خانە بۆ شەقامی بوخارست. رۆیشتین بۆ باڵیۆزخانە، بەلام سەیرمان کرد داخراوە. بە پاسەوانەکەم گوت کەی باڵیۆزخانەکە دەکرێتەوە؟ گوتی ئەمرۆ هەینییە لە هەموو ئێران پشووی رەسمییە. بە شۆفێرەکەم گوت بمبەرەوە بۆ نوسینگەی گەشتوگوزارەکە بۆ لای جانۆ. چیرۆکەکەم بۆ گێرایەوە لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی، پێمگوت پاسپۆرتم نییە و ناتوانم لە هۆتێل بمێنمەوە، گوتی دووبارە برۆ بەڵکو رێگات بدەن بۆ شەوێکیش بووە بمێنیتەوە.

دەستم بە گەڕان کرد، یەک هۆتێل نەما نەڕۆم و لە دەرگای نەدەم، هەموو هۆتێلەکان دەیانگوت پێش هەموو شتێک پاسپۆرت، گەڕامەوە بۆ لای گەنجە فەرمانبەرەکە، جانۆ، داوام لێکرد بەناوی کۆمپانیاکەوە تەلەفۆن بکات رەنگە ئەو سەرکەوتوو بێت. دەستی بە تەلەفۆن کرد، هۆتێل لە دوای هۆتێل، بەبێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکی دەست کەوێت. ئیتر دواجار پێمگوت: مزگەوت هەیە لەم نزیکانەوە بۆ نوێژکردن؟ گوتی بەڵی هەیە نزیکە لێرەوە، کارگوزارێکی نوسینگەکەشت لەگەڵدا دەنێرم بۆ ئەوەی پیشانت بدات، بەڵکو مجێوری مزگەوتەکە قایل بکات ئەمشەو لەوێ بمێنیتەوە. کارگوزارەکە لەگەڵمدا هات و بە فارسی قسەی لەگەڵدا کرد و دۆخی منی تێگەیاند، مجێورەکە گوتی قەدەغەیە هیچ کەسێک لە مزگەوت بخەوێت. ئیتر دنیا لەبەر چاوم رەش دەبوو، کەسم لە تاران نەدەناسی، داوام لە خاوەن دوکانەکە کرد بەڵکو رێگام بدات کەلوپەلەکانم لەوێ دابنێم هەتا سبەی، دوای ئەوەی دۆخی خۆمم تێگەیاند سوپاسم کرد کە قایل بوو بە داواکەم و ئیتر رۆیشتم.

سەری خۆم هەڵگرت و سەرگەردان بەناو شەقامەکانی تاراندا دەسوڕامەوە، هۆڵێکی سینەما هاتە بەرچاوم، چوومە ژوورەوە بۆ ئەوەی بە سەیرکردنی فلیمێکەوە کەمێک کات بکوژم. کاتژمێر دوازدە فلمەکە تەواو بوو، واتە لە نیوە شەودا، ئیتر بەناو شەقامەکاندا هەر دەسوڕامەوە. دوکانەکان دادەخران، خەڵک بە

شەقامەکانەوە نەدەمان، شەوەزەنگ باڵی کێشا، دڵم کەوتە خورپە و لێدان، لەوە دەترسام پاسەوانێک یاخود پیاوێکی دەزگای هەواڵگری رامبگرێت و بپرسێت تۆ کێیت و بەم شەوە چی ئەکەیت لەسەر جادە؟ کات زۆر بە هێواشی دەڕۆیشت و شەویش زیاتر ئەنگوستەچاو دەبوو. شەیتان کەوتبووە کەڵکەڵەم و لە بارودۆخێکی دەرونیی شڵەژاودا بووم و دنیا زۆر سارد بوو. بەشوێن جێگایەکی چۆڵدا دەگەڕام خۆمی تێدا حەشار بدەم، بینایەک، گەوەڕێک، نەمدۆزییەوە. کاتژمێر یەک و نیو بوو سەرما بڕستی لەبەر بڕیبووم، کەسیرە ببووم، چوارپەلم بەستبووی هەستم پێیان نەدەکرد. دوواجار گەراجێکم بینی، لەبەردەم دەرگای پشتەوەیدا ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگری گەورە وەستابوو. چوومە ناو ئۆتۆمبیلەکە کەسی تێدا نەبوو، سەرکەوتمە ناو بۆدی لۆریەکە و خۆم تێدا حەشاردا. هەوڵمدا بخەوم، بەڵام لەبەر سەرماو سۆڵە بە درێژایی شەو نەمتوانی چاوەکانم لێکبنێم. کات زۆر خاو و خلیچک تێدەپەڕی، هەتا کاتژمێر چواری بەیانی بەو جۆرە مامەوە.

لەناو بۆدی لۆریەکە هاتمە دەرەوە، بەبێ ئەوەی کەس هەستم پێبکات دابەزیمە خوارەوە بۆ سەر جادەکە. لە یەکێک لە شەقامە درێژەکانی تاران دەستم بە گەڕان کرد تا کازیوەی بەیان دەرکەوت، ژیان گەڕایەوە بۆ ناو شەقامەکان، دوکانەکان دەکرانەوە. لە نزیک چای فرۆشێکی گەڕۆک جێگایەکم دۆزیەوە،

دەستم بە هەڵقوڕاندنی چای کرد، کەمێک ئارام بوومەوە و گەرما گەڕایەوە بۆ جەستە و چوارپەلم. هەر ئەوەندەی کاتژمێر بوو بە حەوتی بەیانی تەکسیم گرت و رومکردە باڵیۆزخانەی لوبنان.

کاتێ پێیەکانم خستە ناو باڵیۆزخانەی لوبنان هەستم بە ئارامی و دڵنیایی کرد، سوپاسی خودام کرد. چووم بۆ لای یەکێک لە فەرمانبەرەکان و دوای ئەوەی خۆم ناساند داوای دیداری باڵیۆزم کرد. فەرمانبەرەکە گوتی: باڵیۆز لە لوبنانە ئەگەر پێویستیت بە هەر خزمەتگوزارییەک هەیە سەردانی کونسڵ بکە، ئەو لە شوێنی باڵیۆزە و کارەکانی بەڕێزیان دەکات. سوپاسمکرد و گوتم: دەکرێت دیداری ئەو بکەم؟ گوتی بە دڵنیاییەوە. تەلەفۆنی هەڵگرت و پەیوەندی بە کونسڵەوە کرد، دوای کەمێک فەرمانبەرەکە لەگەڵمدا هات و بردمی بۆلای کونسڵ و منی پێناساند. کونسڵ بەوپەڕی ڕێزو حورمەتەوە پێشوازی لێکردم، تەماشام کرد گەنجێکی بەڕەوشت و سەنگینە و بەخزمەتە بۆ هاولاتیانی گەلەکەیی و جیاوازی لە نێوان تایفەیەک و ئەوی تردا ناکات، بەهەموو ڕێز و حورمەتێکەوە، خزمەتی هەموو لوبنانییەک دەکات. دوای ئەوەی خۆم پێناساند، بەخێرهاتنی کردم و بەڵگەنامەی ڕەسمیی بۆ کردم، داوای لە یەکێک لە فەرمانبەرەکان کرد کە لەسەر بەرپرسیاریەتی باڵیۆزخانەی لوبنان بمبات بۆ یەکێک لە هۆتێلەکان. سوپاسی خاوەن پایە جەنابی کونسڵم کرد بۆ ئەو کارە جوانەی کە بیرم ناچێت و بەرز دەینرخێنم. ڕۆژانە

دەچووم بۆ باڵیۆزخانە بۆ پرسیارکردن لەبارەی فیزای چوونە دەرەوە. دەسەڵاتدارانی ئێران پێدانی فیزاکەمیان دوادەخست، دەیانویست لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکەن بۆ ئەوەی بزانن چۆن هاتوومەتە ناو خاکی ئێران و هۆکاری هاتنم بۆ ئێران چییە.

رۆیشتم بۆلای دەسەڵاتدارانی ئێرانی و بەبێ پێچ و پەنا پێمگوتن لە رێگای تورکیاوە لە ناوچەی بازرگانەوە هاتووم و باڵیۆزخانەی لوبنان داوایەکی رەسمیی پێشکەش بە وەزارەتی دەرەوەی ئێران کردووە و ڤیزایان پێداوم، بەڵام بەشی پاسپۆرت رەتی دەکاتەوە و دەیەوێت راستیی سەرچاوەی هاتنە ژوورەوەم بۆ ئێران بزانێت.

ماوەی بیست رۆژ لەم کەین و بەینەدا مامەوە. پارەی مانەوەم لە هۆتێل زۆر کەوتە سەر، کە حسابم نەکردبوو. پارەکەم هەمووی سەرف کرد و تەنگەتاو بووم، نەمدەزانی چی بکەم. بە رێکەوت لە هۆڵی ئەو هۆتێلەی تێیدا دابەزیبووم شەفیق ئاغام بینی کە هاورێیەکی کۆنم بوو. سڵاوی لێکردم، دەستمان بە قسان کرد. بە هەلێکی گونجاوم زانی کە باسی خۆمی بۆ بکەم و تێمگەیاند کە هێشتا کارەکانم تەواو نەبووە و پارەم بەدەستەوە نەماوە. ئەو پارەیەی کە مەسعود پێیدام هەمووی تەواو بوو، چونکە بیست رۆژە لە هۆتێلدام و رۆژانە خەرجیم زیاد دەکات. داوای راوێژ و تەگبیری ئەوم کرد. پێی گوتم: دەبێت بچیت بۆ بارەگای پارتی لە تاران، نەمهێشت قسەکەی تەواو بکات گوتم:

من دڵنیام ڕۆژانە دەیان قوتابی کوردی بێ پارە دەڕۆن بۆ ئەوێ و بەدەستی خاڵی دەگەڕێنەوە. ئینجا گوتی: تۆ دەزانیت ئێستا مەلا مستەفا لە ئێرانە؟ گوتم نەخێر، گوتی دەتەوێت من ئەو تێکەیەنم لە سەر تۆ؟ گوتم بۆ نا سوپاست دەکەم کاک شەفیق. نامەیەکم بە دەستیدا بۆ مەلا مستەفا نوسی و باسی دۆخی خۆمم بۆ کرد. ڕۆژی دواتر کاک شەفیق هات بۆ لام زەرفێکی لە مەلا مستەفاوە بۆ هێنابووم کە بڕێک پارەی تێدابوو، دوای پێنج ڕۆژ کارەکەم تەواو بوو، حکومەتی ئێران ڕەزامەندی دەربڕیبوو بە پێدانی ڤیزای دەرچوون.

ڕۆژی ٢٣ی نیسان تکتی فڕۆکەم بڕی بۆ بەیروت. لە خۆشبەختی خۆمدا پایەدار قونسلی لوبنان لە هەمان فڕۆکەدا لەگەڵما سەفەری دەکرد. بەو ڕێزو حورمەتەی کە لە منی گرت شەرمەندی کردم، تەنانەت فەرمانی بە شۆفێرەکەی خۆی کرد، بڕوات بۆ هۆتێل و کەلوپەلەکانم بۆ بێنێت بۆ فڕۆکەخانەی تاران. لەو گەشتەدا یاوەری پایەدار جەنابی قونسڵ بووم..

لە کاتژمێر دەو چارەک فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی بەیروتی نێودەوڵەتی نیشتەوە، کاتێک لە پلیکانەی فڕۆکەکە هاتمە خوارێ دنیا لە چاوەکانمدا زۆر مەزن و گەورە دیاربوو. تێر بۆنی لوبنانم هەڵمژی، یەکەم شت کە بێ ئاگا کردم ئەوە بوو کەوتمە سەر ئەژنۆ و خاکی نیشتمانی خۆم لوبنانم ماچ کرد.



د. کامەران بەدرخان لە بارەگای حزب لە بەیروت یادداشتی خۆی تۆمار دەکا



د. کامەران بەدرخان پەیرەوی ناوخۆی حزبی بەدەستەوەیە و ستایشی جەمیل مەحۆ دەکات

كلاله – في ٩ – ٧ – ١٩٧٠

فخامة الأخ شارل حلو رئيس الجمهورية اللبنانية

باسمي وباسم الشعب الكردي اقدم تحيات التقدير والوفاء لشخصكم الكريم وللبنان العزيز، لبنان الانسانية المترفعة عن الروح العنصرية الضيقة، والمتفهمة للمظلومين من ابناء شعبنا والتي ايدت قضية شعبنا الكردي العادلة.

انني اقدم لفخامتكم الكريم الكردي اللبناني [عبد الرحمن سلام] أملي من فخامتكم ان تشملوه بعطفكم الابوي حسبما يسمح به الدستور والقوانين اللبنانية العادلة.

وتفضلوا بقبول شكري واحترامي ودمتم رمزاً للانسانية المؤمنة بالسلام، ودامت لبنان بوحدتها الوطنية وديمقراطيتها العريقة.

اخوكم

الملا مصطفى البارزاني

مصطفى

نامەی مەلا مستەفا کە بەدەستی جەمیل مەحۆ بۆ شارل حلو، سەرۆکی لوبنان رەوانە کراوە.



جەمیل مەحۆ دوای گەیشتنەوەی بۆ لوبنان، خاکی لوبنان ماچ دەکات



پێشوازی لە جەمیل مەحۆ لە فڕۆکەخانەی بەیروت

AMBASSADE DE LA REPUBLIQUE IRAKIENNE

BEYROUTH



سفارة الجمهورية العراقية

بيروت

No. ________

Date ________

الرقم: ________

التاريخ ٢١/٣/١٩٧٠

الى من يهمه الامـــر

دخول لبناني الى العراق

يرجى السماح للسيد جميل علي درويش محو حامل جواز السفر اللبناني المرقم ١١٨١٠ الصادر في بيروت بتاريخ ٢/٧/١٩٦٥ بدخول العراق لقضاء بعض الاشغال الخاصة .



القنصـــل

عـــوني لخضـــري

ڤیزای باڵیۆزخانەی عیراق لە لوبنان بۆ جەمیل مەحو



پێشوازیکردنی کوردانی لوبنان لە جەمیل مەحۆ



شادبونەوە بە دیداری دایکی دوای چوار ساڵ



جەمیل مەحۆ لەگەڵ د. براهیم عەبدی لە نوسینگەی خۆی لە بەیروت بەرلەوەی بڕوات بۆ ناوپردان



جەمیل مەحۆ وانەی کوردی بە ئەندامانی پارتەکەی دەداتەوە



کۆبوونەوەی جەمیل مەحۆ لەگەڵ ئەندامانی حزبەکەی بەرلەوەی سەفەر بکات بۆ کوردستانی عیراق



جەمیل مەحۆ لە ناوپردان لەبەردەم کۆشکی ئاشتی



یەکەم چاوپێکەوتن لەنێوان مەلا مستەفا و جەمیل مەحۆ لە بارەگای
بارزانی لەناوپردان (بارەگای زستانە)



جەمیل مەحۆ لەکاتی دەستبەسەربوونیدا لە بارەگای ئیدریس بارزانی
خەریکی دروستکردنی دارسەبیلە



ئیدریس و مەسعود بارزانی باشترین خواردنیان دەخوارد لەسەر شانی
خەلکی هەژاری کورد

Parti A Dêmoqrat
A Kurdî ê Lûbnan

٨٢
رقم ......



## طلب انتساب

بعد مطالعتي على دستور الحزب الديمقراطي الكردي في لبنان

«البارتي»

انني اطلب انتسابي الى الحزب المذكور اعلاه

الاسم والشهرة: مصطفى جميل

اسم الاب: جميل

اسم الام: [illegible]

تاريخ الولادة: ١٩٤٦

العنوان: [illegible]

المنطقة: [illegible]

الجنسية: سوريا

رقم السجل: ٤٦

[illegible]



توقيع المنتسب

[illegible]

وێنەی ئەو فۆرمەی مستەفا جەمیل بەگ پڕیکردۆتەوە بۆ بەئەندامبوون لە پارتی دیموکراتی کورد لە لوبنان



مەلا مستەفاو جەمیل مەحۆ



جەمیل مەحۆ لەگەڵ یاسر عەرەفات

# پێڕستی بابەتەکان

سێ مانگی ڕەبەقم بە ڕۆژ و شەوەکانییەوە بەسەربرد، هەردوو قاچم بە زنجیری ئاسن بەسترابوونەوە. لەسەر زەوی دەخەوتم بەبێ بەتانی و پێخەف، کە خەوم پێدا دەکەوت لە ناکاو وەکو شێت ڕائەچڵەکیم مشک و قالونچە لەناو جلەکانمەوە دەردەپەڕین، خوێن لە قاچ و دەموچاوم و پەنجەکانی دەستم دەچۆڕان..

لە ٢٦ی ئازاری ١٩٧٥ بینیم کە جۆن سەرانی شۆڕش هەریەکەیان چەکەکەی خۆی رادەستی ئەفسەرە ئێرانییەکان دەکرد و وەکو دیل سواری ئۆتۆمبیلەکانیان دەبوون.

مەلا مستەفا لە نەغەدە بوو، سەری زۆر جەنجاڵ بوو، پێمگوت گەورەم دەمەوێت رزگارم کەیت لەم حاڵە بگەڕێمەوە ناو کەس و کارو نیشتیمانی خۆم. مەلا مستەفا دوای ساتێک لە بێدەنگی پێی گوتم: ئەگەر بتوانیت عوبێدوڵای کوڕم بۆ بکوژیت ئامادەم چەند پارەت بوێت بتدەمێ.کاتێ ئەوەم لێبیست موچوڕکە بە هەموو گیانمدا هات، هیچ پێشبینم نەدەکرد شتێکی ئاوا بەر گوێم کەوێت.. خوا بۆ خۆی شایەتە لەسەر ئەوانەی کە من دەیڵێم.